# تیۆری دەوڵەت و سیستەمە ڕامیارییەکان

نووسینی
یاساناس: بەهادین ئەحمەد محەممەد

سلێمانی / ٢٠٠٢

ناوی کتێب: تیۆری دەوڵەت و سیستەمە ڕامیارییەکان

ناوی نووسەر: بەهادین ئەحمەد محەمەد

بابەت: لێکۆڵینەوە

هەڵەچنی چاپ: خودی نووسەر

مۆنتاژ: سەیران عەبدولڕەحمان

تیراژ: ٥٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ٢٦١ ی ٢٠٠٢

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (١٧٧)

www.sardam.org

ئەم کتێبە پێشکەشە بە :-

ـ هەموو دیموکراسیخواز و مرۆڤ دۆستێك.

ـ هەموو ئەو گەلانەی کە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان نین وبواری ئـەوەیان پـێ نـادرێ بڕیـاری مافی چارەی خۆنووسین بدەن.

## پێشەکی:

ماوەیـەکی زۆر بـوو بـیرم لـە دانـانی کتێبێـك دەکـردەوە دەربـارەی دەوڵـەت و سیستەمە ڕامیارییەکان، بەڵام وەکو خەیاڵێك هەر لە مێشکمـدا دەخولایـەوە، کتێبێکی وا بـەزمانیکوردی دەگمەنـە و ئەگـەر بڵێـم لەوەیـە سـەرچاوەیەکی لـەم جـۆرە لـە کتێبخانـەی کوردیـدا هـەر نـەبێ، کە هەمـە لایەنـە بێت و باسی دەوڵەت و سیستەمە ڕامیارییەکان بکات بە شێوەیەکی ئاسان و زانیارییانەلەکاتێکدا بابەتەکە پەیوەندی بە ژیانی هەموو مرۆڤێکەوە هەیـەو مافی خۆیـەتی بزانـێ دەوڵـەت چیـەو چۆن دەوڵەت هاتووەتـە کایـەوەو ئـەو بیرو بۆچوون و توێرانـە چین کە دەربـارەی هاتنـە کایـەوەی دەوڵەت وتراوون ؟

بۆ نووسینی بابەتەکە سوودم لە سـەرچاوەی جۆراو جۆر وەرگرتـووە، کە باسـی لایەنـە جیاجیاکـانی دەوڵـەت دەکات،لـە هـەندێ لـەو بابەتانـەدا ڕای تایبـەتی خۆمـم دەربڕیوە، ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە، لەو هەوڵەدا هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکم بە دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە کردبێت.

پێویسـتە ئامـاژە بـەوە بکـەم کـە دەوڵـەت کـۆکەرەوەی هـەموو لایەنـەکانی ژیـانی مرۆڤـە، مێـژوو، ئێسـتا، ڕەوشـیئابووری، ڕەوشـیڕامیاری، ڕەوشـیکۆمەڵایەتی، ڕادەی هۆشـیاری ڕامیـاری هاووڵاتیـان، هـەمووی لـە چوارچێـوەی دەوڵـەتدا یـەك دەگرنـەوە.هـەروەها پـەیوەندی سیسـتەمە ڕامیارییـەکان بـەژیانی کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتییـەوە پەیوەندییـەکی زۆر پتـەو و تونـدو تۆڵـە، هەرچـەندە سیسـتەمی ڕامیـاری لـە هـەر کۆمەڵگەیـەکدا هـەڵقوڵاوی ڕەوشی ڕامیـاری وئـابووری وکۆمەڵایـەتی ومێـژووی ئـەو کۆمەڵگەیـەو ڕەنگدانـەوەی دیفـاکتۆی ڕەوشی ئـەو کۆمەڵگەیـە، لە هەمان کاتدا سیستەمی ڕامیاری پەیڕەوکراوو لـە دەوڵەتدا کار دەکاتـە سـەر بـوارە جیاجیاکـانی ژیـانی کۆمەڵگـەو داینـەمۆی ژیـان و ڕەوشـی ئـابووری و ڕامیـاریو کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگەیەیە.

بە هەر حاڵ وەکو دەبینین ئێمە کاتێ باسی دەوڵەت دەکەین زۆر جار تێکەڵ دەبێ لە گەڵ یەکێ لە ڕایەڵەکانی دەوڵەتدا، کە ئەو ڕایەڵەش دەسەڵاتە، جیاکردنەوەی ئەو دوو بابەتەش لە یەکتر هەروەها کارێکی ئاسان نییە.ئەوەی ڕاستی بێ سەرەڕای گرنگی نووسین و توێژینەوە سەبارەت بە دەوڵەت و سیستەمە ڕامیارییەکان لە گەڵ ئەوەشدا نەك هەر لە زمانی کوردیدا بەڵکو لە زمانیعەرەبیشدا نووسین لە سەر ئەم بابەتە کەمەو بایەخی ئەوتۆی پێ نەدراوە کە شایستەی بابەتەکە بێت.

لە بەر ئەو هۆیانە بڕیارم دا خەونەکەم بکەم بە دیفاکتۆ، هەرچەندە لە سەرەتادا دوو دڵ و ڕاڕا بووم، بەڵام دەستم کرد بە گەڕان بە دووای سەرچاوەکان و خوێندنەوەی هەر بابەتێ پەیوەندیەکی نزیك یان دووری هەبێ بە دەوڵەت و سیستەمە ڕامیارییەکانەوە، تا توانیم ئەو ژمارەیە لە سەرچاوە کۆبکەمەوە کە بە گوێرەی پێویست بێت بۆ نووسینی بابەتەکە .

ئەمەو نووسینی بابەتەکەم کردووە بە دوو بەرگەوە لە بەرگی یەکەمدا باسی تیۆری دەوڵەت دەکەم وە لەبەرگی دووەمدا باسی سیستەمە ڕامیارییەکان دەکەم.

لە کۆتاییشدا هیوادارم بتوانم لە ڕێگای ئەم کتێبەوە خزمەتێك بە خوێنەران و کتێبخانەی کوردی بکەم و زیاتر دەوڵەمەندی بکەم.

کفری

٢٠٠١/٣/١٥

## پێشەکی بەرگی یەکەم:

وەك دەبینین ئەم گۆ زەمینەی کە هەموو میللەتانی جیهان لە سەری نیشتەجێ بوون، لە ڕاستیدا لە ڕووی جیوپۆلیتیکییەوە دابەش بووە بۆ چەند هەرێمێك کە پێیان دەوترێ دەوڵەت.

هەر یەکێ لەو دەوڵەتانە سنووری دیاری کراوی خۆی هەیە ودەسەڵات و دەزگاو دامەزراوی تایبەتی خۆی هەیە.واتا دەوڵەت ئەو یەکەیەیە کەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە ڕووی ڕامیارییەوە لە یەك جیاکردووەتەوەو هەر کۆمەڵگەیەکی کردووەتە خاوەن قەوارەیێکی ڕامیاری جیاواز و سەربەخۆ لە کۆمەڵگەکانی دیکە. بە هەر حاڵ کاتێ باسی دەوڵەت دەکەین،دەبێ ئەوە بزانین کە دیاردەی دەوڵەت لە کوت وپڕێکدا نەهاتووەتە کایەوە،بەڵکو ئەنجامی پێشکەوتنی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە چەند قۆناغێکدا ڕۆیشتووەو لە پێشکەوتنێکی بەردەوامدا بووە، کە ـەخێزان وتیرە وخێڵە سەرەتاییەکانەوە دەست پێ دەکات و تێکەڵ بوون و لە یەك دانی کۆمەڵگە مرۆڤایەتییە سەرەتاییەکان چ لە ژێر کاریگەری ئایین و بیری ئایدیالیزم دا بێت چ بە هۆی جەنگ و توندو تیژی و زەبروو زەنگەوە بێت ، چ بە هۆی ڕەوشی ئابووریو دابین کردنی بژێوییەوە بێت ،ئەمانە هەمووی هەریەکەو کاریگەری خۆیان هەبووەو سەرچاوەی قۆناغەکانی دروست بوونی دەوڵەتن .ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد پەیوەندی بە بنەچەکردنی یان با بڵێین بە بنەوانەکردنی چۆنێتی دروست بوونی دەوڵەتەوە هەبوو.

بەڵام لە هەر کاتێکدا لە بارە دەوڵەتێکی نوێ بێتە کایەوە ،بەپەیدا بوونی ڕایەڵەکانی دەوڵەت، کە لە گەل و هەرێم و دەسەڵات پێك دێن. لێرەدا دەتوانم بڵێم دەوڵەت بە چەند شێوەیەك دێتە کایەوە؛ هاتنەکایەوەی دەوڵەت یەك شێوە لە خۆ ناگرێ .

ئەمەو لە بەر ئەوەی دەوڵەتەکان بارودۆخیان وەکو یەك نییەوجیاوازی لە نێوانیاندا هەیە لە ڕووی ڕووبەری زەمینەی دەوڵەت و لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و جیاوازی پێك هاتەی دانیشتوانی دەوڵەت لە ڕووی ئایینیو نەتەوەیی و کەلتورییەوە ،ئەمانە هەموویان وایان کردووە دەوڵەت یەك شێوە لە خۆ نەگرێ ، بەڵکو چەند شێوەیەك لە دەوڵەت هەن ،دەوڵەتی سادە ، دەوڵەتی فیدراڵی ، دەوڵەتی خاوەن سەروەری تەواو، دەوڵەتی خاوەن نیمچە سەروەری .

هەر وەها کاتێ باسی دەوڵەت دەکەین ، بابەتی پێبەند بوونی دەوڵەت بە یاساوە دێنە کایەوە :

- ئایا دەوڵەت پێبەند دەبێ بە یاساوە؟.

- بۆچی دەوڵەت پێبەند دەبێ بە یاساوەو ئەنجامی ئەو پێبەندییە چییە؟.

بە هەرحاڵ لەم بەرگەدا باسی تیۆری دەوڵەت دەکەم و بە باشم زانیوە ئەم بەرگە بکەم بە سێ بەشەوە: ـ

لە بەشی یەکەمدا باسی کورتەیەکی مێژوویی دەربارەی دەوڵەت ،پێناسەکردنی دەوڵەت ، دیاری کردنی ڕایەڵەکانی دەوڵەت ، شێوەکانی هاتنە کایەوەی دەوڵەت و شی کردنەوەی بنەوانە، بنەچەکردنی بناغەی دروست بوونی دەوڵەت دەکەم.

لە بەشی دووەمدا باسی جۆرەکانی دەوڵەت دەکەم.

لە بەشی سێیەمدا باسی پێبەندی دەوڵەت بە یاساوە دەکەم.

# بەشی یەکەم

باسی یەکەم: کورتەیەکی مێژوویی دەربارەی دەوڵەت.
باسی دووەم: پێناسەکردنی دەوڵەت و ڕایەڵەکانی.
باسی سێیەم: شێوەکانی هاتنە کایەوەی دەوڵەت.
باسی چوارەم: بنوانە( بنەچە ) کردنی دروست بوونی دەوڵەت و دەسەڵاتی ڕامیاری.

## باسی یەکەم:
## کورتەیەکی مێژوویی دەربارەی دەوڵەت:

مرۆڤ بە سروشت ناتوانێ بە تەنها بژێ ، ناتوانێ بە تەنها کار بکات ، بژێوی خۆی دابین بکات ، زیاد بکات و بەرانگیری ئەو مەترسییانە ببێتەوە کە ڕووی تێ دەکەن ، چ سەرچاوەکانی ئەو مەترسییانە لە سروشتەوە هەڵقوڵابن ، یان لە هاوڕەگەزی خودی مرۆڤ خۆیەوە. بۆیە پێویست دەکات مرۆڤ تێکەڵ بێت و لە ناو گرووپ و کۆمەڵدا جێگای خۆی بگرێت ، بۆ ئەوەی لە گەڵ تاکەکانی دیکەی کۆمەڵدا شان بەشانی یەکتر هەر یەکەو ئەرکێ بخاتە ئەستۆی خۆی یان ئەرکێ بخرێتە ئەستۆی بۆ خزمەت کردنی بەرژەوەندییە گشتییەکانی گرووپ لە هەمان کاتدا هەر تاکێك مافی خۆی هەیە بەرامبەر گرووپەکەی ، لە سەر ئەم بناغەیە گرووپ و کۆمەڵگە سەرەتاییەکان دروست بوون و دامەزراوون ، ئەو کۆمەڵگە سەرەتاییانە زۆر جار لە سەر بناغەی خوێن دادەمەزران ( واتا هەموویان خزمی دوور و نزیکی یەك بوون).گەلێ لە لێکۆڵەرەوەکان وای دەبینن کە کۆمەڵگە مرۆڤایەتیە سەرەتاییەکان کۆمەڵی ڕامیاری تەواو بوون لە ڕیشاڵ و ڕایەڵەکاندا (العناصر والارکان) و دەسەڵات لەو کۆمەڵگەیانە لە سەر بناغەی خوێن دامەزرابوو ، دەسەڵات بەسەرەکان ملکەچی دەسەڵاتداران دەبوون وئەمەیان بە جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا دەزانی ، ئەم کۆمەڵگە ڕامیارییانە بە پێی داب و نەریت بە ڕێوە دەچوون. ئەمەو بیرو بۆچوونی جیاواز هەیە لە سەر کۆمەڵگەمرۆڤایەتییە سەرەتاییەکان وەکو (خێزان، خێڵ، هۆز ) سەبارەت بە ئەوەی:

- ئایا ئەو کۆمەڵگەیانە دەوڵەت بوون یان نا؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە هەندێ بۆچوون هەیە دەیانخەینەڕوو لەوانە:

- ئەو کۆمەڵگە مرۆڤایەتییانە کە کۆچەر بوون ، یان لە چوارچێوەی سیستەمی خێزانی یان خێڵەکیدا بە ڕێوە دەچوون ناتوانرێ ناوی دەوڵەتیان لێ

بنرێ. لە بەر ئەوەی پەیوەندی نێوانیان پەیوەندییەکی بایۆلۆجی بووە زیاتر لەوەی پەیوەندیەك بێت لە سەر بناغەی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان دامەزرابێت.

ـ دەوڵەت کاتێ هاتە کایەوە کە دەسەڵات خاوەنێکی دەست کردی بۆ پەیدا بوو کە خودی دەوڵەتە ، لە جیاتی ئەو دەسەڵاتدارانەی کە دەسەڵات باخوەبەرییەك (امتیاز ) بوو لە باخوەبەرییەکانیان و مان و نەمانی دەسەڵات بەو دەسەڵاتدارانەوە بەند بوو.بە پێی ئەم بۆچوونانە کۆمەڵگە مرۆڤایەتییە سەرەتاییەکان دەوڵەت نەبوون ، لە بەر ئەوەی دەسەڵات لەو کۆمەڵگایانەدا باخوەبەرییەك بوو لە باخوەبەرییەکانی کەسی دەسەڵاتدار و لە گەڵ ڕۆژدا و بە پێشکەوتنێکی درێژخایەن خاوەنێکی تازەی دەسەڵات هاتە کایەوە، خاوەنێکی بەردەوام و هەمیشەیی کە ئەویش بریتییە لە قەوارەیەکی دەستکرد (معنوي) کە پێی دەڵێن (دەوڵەت).

ـ دەوڵەت نزیك بوونەوەیەکی دەستکردە ، نەك نزیك بوونەوە و تێکەڵبوون لە سەر بناغەی خوێن ، تێکەڵ بوونی ئامانجی کۆمەڵایەتییە و درێژ بووەنەوەی ئەو ئامانجانە بۆ نەوەکانی ئێستا و ئەوسا و داهاتوو ، هەست کردنە بەرانبەر چەمکی بەرژەوەندییە گشتییەکان.

پاش باسکردنی چەند خاڵێکی سەرەکی دەربارەی ئەوەی ئایا ئەو کۆمەڵگە سەرەتاییانەی کە لەخێزان و هۆزو خێڵ پێك هاتبوون دەوڵەت بوون یان نە؟

لێرەدا بۆچوونی هەندێ فەیلەسوفەکان و یاسازانەکان دەخەینە ڕوو دەربارەی ئەو بابەتە.(۱)

ـ ئەرستۆ جیاوازی کردووە لە نێوان دەوڵەت لە شارە ڕامیارییەکان و کۆمەڵگە بایۆلۆجییەکان ( خێزان ، هۆز ، خێڵ) لە بەر ئەوەی شارە ڕامیارییەکان هەرچەندە جۆرێك بوون لە کۆمەڵگە ڕامیارییە سروشتییەکان، بەڵام لەهەمان کاتدا جیاوازییان هەبوو لەگەڵ خێزان و خێڵ و هۆزدا.

---

(۱) بڕوانە :د. طعیمة الجرف ـ نظریة الدولة والاسس العامة للتنظیم السیاسي.

یەکەم: شارەڕامیارییەکان تەنها دروست نەبوون بۆ مانەوەی جۆر(حفظ النوع).بەڵکو بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی کۆمەڵایەتی کە زامن کردنی هەبوونێکی باشترە بۆ تاکەکان.

دووەم: شاری ڕامیاری بە پێچەوانەی خێزان ، هۆز ، خێڵ ، دەتوانێ خۆی ئیکتفای خۆی بکات.

- دیگیلە فەرەنسا تێکەڵی دەکات لەنێوان دەوڵەت و هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی کە حوکم دەکرێ لە لایەن دەسەلاتێکی ڕامیارییەوە.

دەوڵەت لای دیگی جیاوازی ڕامیارییە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ،کە بەشێکیان ڕاڤەی دەسەلاتی ڕامیاری دەکەن و بەشەکەی تریان دەسەلات بە سەرن و دەبێ ملکەچی ئەو دەسەلاتە بن کە حوکمیان دەکات. ئیتر بە چاو پۆشین لەو ئامرازانەی کە دەسەلات دەیانگرێتە بەر بۆ بەڕێوەبردنی دەسەلاتەکەی،چ بەکار هێنانی هێز بێت چ بەقەناعەت بێت ، هەروەها بە چاو پۆشین لەوەی کە ئایا ئەو کۆمەلگە مرۆڤایەتییانە لە سەر بناغەی سیستەمی بایۆلۆجی کۆ ببێتنەوە یان ئامانجێکی کۆمەڵایەتی هاوبەشیان هەبێ؟. هەروەها ئەگەر ئەو کۆمەلگە سەقامگیر بووبێت لە سەر هەرێمێکی دیاری کراو و یان نا.

بەو شێوەیە دیگی ، خێزان و هۆز و خێڵەکان بە دەوڵەت دەزانێ ، تەنانەت ئەو خێڵانەی کە کۆچەرین و سەقامگیر نیین لە سەر هەرێمێکی دیاری کراوو.

- جان ڕیسۆ:

هەروەها بۆچوونی جان ڕیسۆ لە بۆچوونی دیگیەوە نزیکەو دەڵێ:دەوڵەت دیاردەیەکی سروشتی کۆمەڵایەتی نییە. دەوڵەت لە کۆمەلگە سەرەتاییەکانەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ لە سەر بناغەی جیاوازی ڕامیاری دامەزراوە لە نێوان دەسەلات بەدەسەکان و دەسەلات بە سەرەدا.

- هۆریۆ (Haurio)

هۆریۆ کۆمەلگە مرۆڤایەتییە سەرەتاییەکان وەکو خێزان و خێڵ و هۆز بە دەوڵەت نازانێ ، هەروەها ئەو خێڵانەی کە لە سەر هەرێمێکی دیاری کراوو

سەقامگرتوو نیین ، هەروەها دەڵێ ، ناتوانین باسی دەوڵەت بکەین تەنها لە قۆناغێکی پێشکەوتوودا نەبێت لەقۆناغەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی.

دەوڵەت، هەر کۆمەڵگەیەکی ڕامیاری نییە کە لە سەر دەسەڵاتدارێتی بنیاد نرابێ. هەروەها دەوڵەت کاتێ دێتە کایەوە کە مرۆڤ لە ژیانی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان دەرباز بووبێت ، پەیوەندییەکانی لە سەر بنەمای نزیک بوونەوەی دەستکرد (معنوی ) بێت لە یەکتری و ئامانج و بەرژەوەندییە هاوبەشەکان کۆیان بکاتەوە و هەموو نەوەکانی ئێستاو ئەوسا و داهاتوو پێکەوە گرێبدا و بیبەستێ بە یەکەوە ، ئەو کاتە هەستی کۆمەڵگە بەرانبەر بەرژەوەندی دەستکرد (معنوی ) جێگای پەیوەندی لە سەر بناغەی خوێن لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا دەگرێتەوە ، مرۆڤ لە قۆناغی داب و نەریتەوە دەگاتە قۆناغی یاسای نووسراو ، ئەو کاتە دەوڵت دێتە کایەوە وهەموو بەرژەوەندییە گشتییەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە و دەبێتە پردێك لەنێوان هەموو نەوەکانی ئێستاو ئەوساو داهاتوودا ، دەبێتە بناغەی دەسەڵاتی ڕامیاری ویاسایی و خاڵی وەرچەرخان بەرەو ڕزگارکردنی مرۆڤ لە مرۆڤ کە یەکێ لە دیاردەکانی دەسەڵاتدارێتی سەرەتاییە.

- بیردۆ -

بیردۆ دەڵێ : دەوڵەت ، کۆمەڵگەی ڕامیاری نییەبەڵکو قۆناغێکی نوێ یە لە قۆناغەکانی پێشکەوتنی دەسەڵاتی ڕامیاری و کۆمەڵگەی ڕامیاری .

دەسەڵاتی ڕامیاری لە گۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا مافێك بوو لە مافەکانی دەسەڵات بە دەست یان باخوەبەرییەك بوو لە باخوەبەرییەکانی (امتیاز) ،دەسەڵاتی ڕامیاری پەیوەست بوو بەکەسی دەسەڵاتدارەوە، بە مانەوەی ئەماو بە نەمانی نەدەما .

دەسەڵاتی ڕامیاری هەردەم بابەتی ململانێی نێوان هێزەکان بووە، ئەو هێزەی لە هەمووی بە هێزترو بە تواناتر بووایەو لە شەڕدا سەرکەوتبایە ، ئەوە خاوەن دەسەڵات و کۆمەڵگەی ڕامیاری دەبوو. هیچ بەربەستێکیش نەبوو جەورو ئەستەمی سەرکردەی سەرکەوتوو ڕابگرێ .

بەڵام کـاتێ ئاسـتی هۆشـیاری مـرۆڤ پێشـکەوت ، لـە توانـای ئـەو دەسـەڵاتە ڕامیارییانەدا نەما بەردەوام بن .مرۆڤ دەستی کرد بە گەڕان بـە دوای شـێوەیەکی تـازە لە ڕێکخستنی ڕامیـاری، کەدەسـەڵات بـەردەوام بێـت هەرچـەندە دەسـەڵاتداران بگۆڕێـن، بۆئـەوەی بـەڕێوەبردنی بەرژەوەندییـە هاوبەشـەکان بـەردەوام بێـت و لـە دەسـتێکەوە بگوێزرێتـەوە بۆ دەستێکی تـر بـە ڕێگایـەکی هێمنانـە و لـە سـەرخۆ بـە جۆرێـك بڕیارەکـانی دەسـەڵات گونجـاوبن لـە گـەڵ پێویسـتییەکانی دەسـەڵات بـە سـەرەکان و ئامانجەکانیان.

ئەم پێشکەوتنانەش جیاکاری دروست دەکـات لـە نێـوان دەسـەڵاتی ڕامیـاری وکەسـی دەسـەڵاتدار ، بـە شـێوەیەك کـە دەسـەڵاتی ڕامیـاری مـافێك نـەبێ لـە مافـەکانیان ، یـان باخوەبەرییـەك نـەبێ لـە باخوەبەرییـەکانیان. ئەمـەش وای کـرد خـاوەنێکی تـازەی هەمیشەیی و بەردەوامی دەسەڵات بێتە کایەوە ، ئەو خاوەنەش قەوارەیەکی دەستکردی کۆمەڵگەیە کە لە ڕووی یاساییەوە پێی دەڵێن دەوڵەت.

بیردۆ دەڵێ : ئەم پێشکەوتنە نە لە کوت وپڕێکدا و نە لە مێژوویەکی دیاری کراودا ڕووی داوە ، هـەروەها لـە دایك بـووی ئـارەزوی مـرۆڤ نییـە ، بـەڵکو بـە هـۆی هـەندێ کارتێکـەری مێـژووی و کۆمەڵایـەتی جۆراوجـۆرەوە هاتوومەتـە کایـەوە. دەوڵـەت تەنـها لەڕایەڵەکانی( هـەرێم ، گـەل ،دەسـەڵات ). پێـك نایـەت، بـەڵکو بـۆ هـەبوونی دەوڵـەت ، جگە لەو ڕایەڵانەش پێویست دەکات ڕێکخستنی

ڕامیـاری بـە جۆرێـك بێـت جیـاوازی بکـات لـە نێـوان دیـاردەی دەسـەڵات و دەسـەڵاتدارەکان بـە شـێوەیەك دەسـەڵاتدارەکان بابـەت و بناغـەی دەسـەڵات نـەبن و لـە جێگای ئەوە بابەت و بناغەی دەسـەڵات ، دەبـێ قەوارەیـەکی دەسـتکردی تـازە بێـت کـە جیـا بێـت لـە هـەردوو دەسـەڵاتدارەکان و دەسەڵاتبەسـەرەکان ، ئـەو قـەوارە دەستکردەش دەوڵەتە.

ئەمەو بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو بۆچوونانە دەڵێم:-

ئێمە لە گەڵ بۆچوونەکانی دیگیدا نیین ، لە بەر ئـەوەی نـاتوانرێ خـێزان وهـۆز و خێـڵ بـە دەوڵـەت دابـنرێ ، جیـاوازی نێـوان کۆمەڵگـەو دابەشـبوونیان بـۆ دەسـەڵات

بەسەران و دەسەڵات بەدەستان ، نابێتە پێوەرێك بۆ هەبوونی دەوڵەت ، ئەو شتانەی سەرەوە بە شێوەیەکی خورسکیٚ هاتوونەتە کایەوە. وەکو هەر دیاردەیەکی سرووشتی دیکە. ئەوەی دیگی باسی لێوە دەکات بەتایبەت دابەشبوونی کۆمەڵگە بۆ دەسەڵات بە دەستان و دەسەڵات بە سەران ، ئەو دیاردەیە نەك لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەڵکو تەنات لە نێو کۆمەڵ و پۆلەکانی تردا هەیە جگە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی .

بەڵام بۆچوونەکانی هۆریۆ زۆربەی بە بۆچوونی ئێمە لە ڕاستییەوە نزیکن ،بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نیین کەدەڵێ ،دەوڵەت کاتیٚ دێتە کایەوە لە قۆناغی پەیرەوکردنی داب و نەریتەوە بگوێزێتەوە بۆ قۆناغی پەیرەوکردنی یاسای نووسراو،بەپێی ئەو بۆچوونە بیٚ، دەبیٚ بەریتاتیا بە دەوڵەت نەژمێردریٚ لەبەر ئەوەی ئەو وولاتە پشت بەپێشینە دادومرییەکان (السوابق القضائیة) دەبەستیٚ و یاسای نوسراوی نییە .

هەروەها لەگەڵ ئەو بۆچوونەشدا نیین کەدەڵێ،دەبیٚ دەسەڵات لەدەستێکەوە بگۆێزرێتەوە بۆ دەستێکی تر بە شێوەی ئاشتەوای ولە سەرخۆ،لەوەیە هەندیٚ جار لە دەوڵەتدا دەسەڵات لە دەستێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ دەستێکی تر بە کودەتا،یان بە بەکارهێنانی توندوتیژی. ئەوەش ئەوە ناگەیەنیٚ کە دەوڵەت لەو حاڵەتانەدا نەبیٚ.

بەڵام لەمەڕ بۆچوونەکانی بیردۆوە دەڵێین:— ئەگەر جیاکردنەوەیدەسەڵاتی ڕامیاری و کەسی دەسەڵاتدار مەرج بێت بۆهەبوونی دەوڵەت ،ئەوە لە ڕاستیدا وەهەر وەکو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا وەکو دیفاکتۆ وایە ، دەوڵەتی ئەمڕۆ جیاکاری کردووە لە نێوان دەسەڵاتی ڕامیاری و کەسی دەسەڵاتداردا، هەبوونی دەوڵەت پەیوەندی بە گۆڕانی دەسەڵاتدارانەوە نییە. بەڵام دەوڵەتە سەرەتاییەکان تا چەند قۆناغێکیش جیاوازییان نەدەزانی لە نێوان دەسەڵاتی ڕامیاری وکەسی دەسەڵاتدار،زۆر جار بە نەمانی کەسی دەسەڵاتدار دەوڵەت لە ناو دەچوو لە هەمان کاتدا ئەو قەوارە ڕامیارییانە دەوڵەت وهەموو ڕایەڵەکانی دەوڵەتیان تێدابوو .

ئەمەو لە مێـژەوە مـروڤ سـیتەمی دەوڵـەتی[1] ناسـیوە لـە چوارچێـوەی شـارە ڕامیارییەکاندا (المدن السیاسیة) .

بۆنموونـە(سۆمەر) زەوییـەکی تـازەبوو لـەو لم و لیتـاوە پێـك هـاتبوو کـە هـەردوو ڕووباری دجلەو فورات لە گەڵ خۆیاندا بۆ باشوور هێنابوویان، زەوییەکە تا ئەو ڕادەیـە بە پیت بوو هەندێ سەرچاوەی مێژوویی دەڵـێن. بـەروبوومی دانەوێڵـە بەتایبـەت جـۆ گەیشتووەتە یـەك بـە هەشـتا و شـەش، بۆیـە بـەپیتی ئـەو زەوییـە وای لـە سـۆمەریە ئارییـەکان کـرد کـە خـەڵکی شاخ و داخ بوونـە لـەوێ نیشـتەجێ بـن و چـەند شـارێك دروسـت بکـەن. هـەر شـارێ لـەو شـارانە دەوری بـە دیـوار (سـور) گـیرابوو ، پاشـایەکی هەبوو(ملك) کە لە هەمان کاتدا کاروباری ئایینی بە دەستەوە بوو ، هەر خۆی نێوانکـار (وسیط)بوو لە نێوان خوداوەندی شارەکەو خەلکەکەی ، لەڕاستیدا هەریەك لەم شارانە یەکەیەکی ڕامیاری تەواوبوو ،سیستەم ودەسەڵاتی تێدا بوو ، بۆیە پێی دەڵێـن دەوڵـەتی شـارە ڕامیارییـەکان (دولـة المـدن السیاسیة). دەوڵـەتی شـارە ڕامیارییـەکان لـە کـاتی ئیمپراتۆرییەتەکانی کلدانی و بابلی و کاشی و میدیەکان نەما، هەروەها ڕۆماو ئسپرتەو شارەکانی دڵتای میسریو شارەکانیهیند و چینـی کـۆن، دیـاردەی شـارە ڕامیارییـەکانیان بە خۆیانەوە بینیوە .

ئەمەو لە قۆناغێکی پاشتر داو لەکۆتایی سەدەی پێنجـەم، ساڵی(٤٧٦ )ی زایینـی[2] لـە ژێـر هـێرش و گوشـاری مەغۆلیـەکان ، ئیمپراتۆریـەتیڕۆمانی ڕووخـا،بـەڵام لـە سـەدەی هەشـتەم، سـاڵی (٨٠٠ )ی زایینـی ، شـارڵمان سـەرلە نـوێ دروسـتی کـردەوە بـە نـاوی ئیمپراتۆریەتی پیرۆزەوە ، بەڵام دیسانەوە ڕووخـا ،لەسـەرەتاکانی سـەدەی دەیـەم سـاڵی ( ٩١١)ی زایینی، سیستـەمی دەرەبەگایـەتی دیسان گەڕایـەوە، هـەروەك و لەچەرخـەکانی کۆندا هەبوو. دیسانەوە دەسەڵات لەگەڵ کەسی حوکومڕاندا تێکـەڵ بـووەوە ، دەرەبـەگ

---

[1] بڕوانە: د. طلعت الشیباني ـ دساتیر الحكم في العراق القدیم ـ مجلة القضـاء ــ العدد (١) السنة الخامسة عشر ـ شباط(١٩٥٧) ص٢١

(٢) بڕوانە: د. طعیمة الجرف ـ النظریات و النظم السیاسیة و سیادة القانون الدستوري ص٤٢-٤٣.

خاوەن دەسەڵاتی ڕامیاری بوو،لە بەر ئەوەی‌خۆی خاوەن زەوی و زار بوو ،خۆی خاوەن هەرێمێکی دیاری کراو بوو لە چوارچێوەی هەرێمەکەی خۆیدا دەسەڵاتی ڕامیاری هەبوو، پاڵپشتی لە تاکەکان دەکرد بەرانبەر ئەوەش دەبووایە تاکەکان ملکەچی بوونایە و سەرنەوایان بۆ بکردبایە. مرۆڤایەتی بۆ خۆ ڕزگار کردن لە نایەتیەکانی سیستەمی فیودالی ـ دەرەبەگایەتی و بۆ پاراستنی ئاسایشی مرۆڤ و ڕزگارکردنی لە پاشکۆیەتی بۆ زەوی و ملکەچی بۆ مرۆڤ، هەڵسا بە کۆکردنەوەی هەرێمە فیودالەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتدا ، تا بتوانێ ئەو ئامانجانەی سەرەوە بە دی بێنێت بەوەش چەرخی ژیانەوە(عصر النهضة) هاتە کایەوە و دەوڵەتی نوێ پەیدا بوو. بە هەر حاڵ لە کۆتاییدا دەڵێین: جیاوازی نێوان دەوڵەتی ئێستا ودەوڵەتی جاران ئەوەیە، کە دەوڵەتی جاران لە سەر کەسی دەسەڵاتدار وەستا بوو، دەسەڵات بەشێ بوو لە ماف و باخوەبەرییەکانی(امتیازات) ئەو. بەلام دەوڵەتی ئێستا ڕێکخراوێکی یاساییە (منظمة قانونیة).

## باسی دووەم :

## پێناسە کردنی دەوڵەت و ڕایەڵەکانی :

ئەم باسەمان دەکەین بە دوو بەستەوە ، لە بەستی یەکەمدا باسی پیناسە کردنی دەوڵەت دەکەین و لە بەستی دووەمدا باسی ڕایەڵەکانی دەوڵەت دەکەین .

## بەستی یەکەم

## ـ پێناسە کردنی دەوڵەت ـ

دەربارەی دەوڵەت و پێناسە کردنی چەند بیر و بۆچوونێکی جیاواز هەن لەوانە[1] :ـ

یاسازانە فەرەنسایی‌یەکان پێناسەی دەوڵەتیان کردووە لەوانە :ـ

ـ یاسازان ئاسمان(Esmein) پێناسەی دەوڵەت دەکات و دەڵێ : (( دیاری کردنی یاسایی‌یە بۆ نەتەوەیەك لە نەتەوەکان )).

ـ مالبێرج (Malberg) :پێناسەی دەوڵەت دەکات و دەڵێ : (( کۆمەڵێ لە تاکە سەقامگرتووەکانی سەر هەرێمێکی دیاری کراو ، خاوەن ڕێکخستنێکی وان ، کە کۆمەڵ بەرانبەر تاکەکان خاوەن دەسەڵاتێکی نەفساوەو ئەمر پێ کەر بێ)).

ـ یاسازانی فەرەنسایی بۆنارد (Bonnard) دەڵێ: (( دەوڵەت یەکەیەکی یاسایی هەمیشەیی‌یە ، دەزگایەکی کۆمەلایەتی خاوەن دەسەلاتە لە بەرانبەر نەتەوەیەکی سەقامگرتوو لە سەر هەرێمێك، ئەو دەزگایەش دەسەلات بەڕێوە دەبا بە ئەو ئامرازانەی کە لە سەر ئارەزووی خۆی وەستاون و لە ڕیگای ئەو هێزە ماددەیەوە کە خۆی مۆنۆپۆلی کردووە.))

---

(١) بڕوانە : د. سعد عصفور ـ القانون الدستوري ـ الطبعة الاولى (١٩٥٤) ص٢٢٢-٢٢٥.

- دیگی (Duguit) دەڵێ: (( دەوڵەت جیاکاریەیە لەنیوان دەسەڵاتداران و دەسەڵات بەسەران ، ئیتر ئەو جیاکاریە لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا بێت ، یان لە قۆناغە ئاڵۆز و پێشکەوتووەکاندا بێت)).

- بۆردۆ(Burdeau) پێناسەی دەوڵەت دەکات و دەڵێ: ((دەوڵەت شێوەیەکە لە شێوەکانی دەسەڵاتی ڕامیاری)).

هەروەها هەندێ لە یاسازانەکانی ئەڵمان دەربارەی پێناسە کردنی دەوڵەت بیروبۆچوونی خۆیان خستووەتە ڕوو لەوانە :-

- بلنتشی(Bluntschli) دەڵێ:(( دەوڵەت دیاری کردنی نەتەوەیی و ڕامیاریی و باری ڕێکخستنی کۆمەڵگەیەکی دیاری کراوە)).

- جیلینك(Jellinek) دەڵێ: ((دەوڵەت کۆمەڵێکی خاوەن ئیرادەیە، کە پێبەند نابێ تەنها بە خودی خۆیەوە نەبێ ، خاوەن سیستەمێکی تایبەتە بەخۆیەوە، کە زەمینەی بۆ خۆش دەکات ژیانێکی کامڵ و سەر بەخۆ بژێ)).

- لاباند (Laband)دەڵێ: (( دەوڵەت کۆمەڵێکە دەتوانێ ڕاڤەی مافی سەروەری بکات بەرانبەر تاکەکان، کە ئەندامن تێیدا)).

هەروەها یاسازانە ئەنگلۆسەکسۆنییەکان دەوڵەتیان پێناسە کردووە لەوانە:

- سالمۆند(Salmond) دەڵێ: (( کۆمەڵێ لەتاکەکان سەقامگرتوون لەسەر هەرێمێکی دیاری کراوو بۆ دابین کردنی ئاشتی و ڕاستیخوازی لە ڕێگای هێزەوە)).

- هۆلاند (Holland) دەڵێ: (( کۆمەڵێ لە تاکەکان دانیشتووی هەرێمێکی دیاریکراوون ، ملکەچی دەسەڵاتی زۆرینە یان تیوژێك لە خۆیان دەبن)).

- (Willoughby) دەڵێ: (( دەوڵەت لە کاتێکدا دەبێ ، دەسەڵاتێك هەبێ حوکمی نەریتی کۆمەڵایەتی تاکەکان و دەزگاکان بکات لە ناو کۆمەڵێ خەڵکدا ، لە کاتێکدا ئەو دەسەڵاتە ملکەچی ڕێکخستنێکی هاوشێوەی خۆی نەبێ)).

- ولسۆن (Woordo Wilson) دەڵێ: (( دەوڵەت ، گەلێکە ملکەچی یاسا دەبێ لە سەر هەرێمێکی دیاری کراوو)).

بە هەر حاڵ بۆ پێناسەکردنی دەوڵەت ، دەبێ زەوییەك هەبێ کە پێی دەڵێن هەرێم بۆ ئەوەی کۆمەڵە مرۆڤێك لە سەری نیشتەجێ بن بە شێوەیەکی هەمیشەیی و سەقامگرتوو ، ئەو کۆمەڵە مرۆڤەش پێویستییان بە دەسەڵاتێك وسیستەمێك هەیە بۆ ئەوەی کار و بارەکانیان بەڕێوە بەرێ و ڕێکیان بخات. بە یەك گرتنی ئەم سێ شتە قەوارەیەك دروست دەبێ ، پێی دەڵێن دەوڵەت. بەو پێیە دەتوانین دەوڵەت پێناسە بکەین و بڵێین: کۆمەڵێ لە تاکەکان نیشتەجێی هەرێمێکی دیاری کراوو دەبن بە شێوەیەکی هەمیشەیی و کۆنترۆڵ دەکرێن لە لایەن دەزگایەکی حوکمڕانی خاوەن سەروەریەوە. یان دەتوانین دەوڵەت پێناسە بکەین بە هەمان واتا و بڵێین: کۆمەڵێ مرۆڤ لە سەر هەرێمێکی دیاری کراوو دەژێن لەسایەی دەسەڵاتێکی ڕامیاری‌حوکمڕاندا.

## بەستی دووەم:

## ڕایەڵەکانی دەوڵەت:

بەشی کردنەوەی پێناسەی دەوڵەت بۆمان دەردەکەوێ کە دەوڵەت لە سێ ڕایەڵی سەرەکی پێك دێت:{ گەل ، هەرێم ، دەسەڵات}، هەندێ لە یاسا زانەکان دانپێدانانیش بە ڕایەڵی چوارەم دادەنێن ، بۆیە ئێمە باسی هەموو ڕایەڵەکان دەکەین بە دانپێدانانیشەوە و ئەو بیرو بۆچوونە جیاوازانەش کە هەن دەربارەی دانپێدانان دەیانخەینە ڕوو:

### یەکەم:ــ

**گەل** : گەل لە کۆمەڵێك تاك پێك دێ ، ئەو کۆمەڵە، هەموو توێژەکان لە خۆ دەگرێ ، کوڕ، کچ ، ژن ، پیاو، منداڵ ، گەورە، نێرینە، مێینە. لێرەدا ژمارەیەکی دیاری کراو نییە دانرابێت وەکو کەمترین ڕێژە بۆ ئەوەی کۆمەڵێ لە تاکەکان بتوانن دەوڵەتێ پێك بێنن ، هەندێ دەوڵەت هەیە وەکو چین و هند ژمارەی دانیشتوانی ملیارێك دەبێ و بگرە تۆزێ زیاتریش ، زۆر دەوڵەتیش هەیە ژمارەی دانیشتوانی لە نێو ملیۆن

کەمترە.ئەو کۆمەڵەی کە گەل پێك دێنێ پێی دەوترێ ( گەلی دەوڵەت) ، ئەو تاکانەی کە کۆمەڵیان لێ پێك دێ پێیان دەوترێ ڕەعیەی دەوڵەت ، پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و دەوڵەت لەوەدایە ، دەبێ تاکەکانی کۆمەڵ لایەنگرییان(ولاء) بۆ دەوڵەت هەبێ ، ملکەچی یاساکانی دەوڵەت بن بەرانبەر دابین کردنی ئاسایش و تەناهیی بۆ گیان و ماڵیان لە لایەن دەوڵەتەوە، واتا خۆگرتنێکی (التزام) دوو لایەنە هەیە لە لایەن هەردوو لاوە، تاکەکانی کۆمەڵ ودەوڵەت. ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد لە ڕاستیدا بیرۆکەی پێناسە (جنسیە)دەگەیەنێ ، هەروەها پاراستن و دابین کردنی تەناهیی بۆ گیان و ماڵی تاکەکانی کۆمەڵ لە لایەن دەوڵەتەوە.ئەمەو دەربارەی پێناسە هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان دەیبەستنەوە بە شۆڕشی فەرەنسایییەوە ، کاتێ هاتە کایەوە بیرۆکەی دەوڵەت پێگەیشت و سەقامگیر بوو لە ئەم وێنەیەی ئێستادا ، کە پێداویستیەکان وای کرد کە گەل دیاری بکرێ بە پێوەرێکی یاسایی ، ئەو پێوەرە یاساییەش وەکو باسمان کرد پێناسەیە(جنسیە)، کە پەیوەندییەکی یاسایییە لە نێوان تاك و دەوڵەتدا. پێناسە لە سەر یەکێ لەم دوو بناغەیە دەوڵەت دەیبەخشێ بە تاکەکان : خوێن ، هەرێم یان هەردوو پێکەوە (خوێن + هەرێم).

لە بەر تێکەڵ نەبوونی شتەکان بە پێویستی دەزانم هەندێ جیاوازی هەیە لە نێوان گەل و نەتەوەدا بیخەمە ڕوو:

پەیوەندی نێوان دەوڵەت و نەتەوە پەیوەندییەکی توند و تۆڵە بەتایبەت لە ناوڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە، کە زۆربەی دەوڵەتەکان لەسەر بناغەی نەتەوە پێکەوە نراوون ، زانای ئیتاڵی مانشینی (١٨٥١)ز وای بە باش دەزانی کە دەبێ دەوڵەت لەسەر بناغەی نەتەوە پێکەوە بنرێ ، بەڵام هەندێ ڕەخنەیان لەم بۆچوونە گرتووە و دەڵێن: پەیڕەو کردنی بە شێوەیەکی ڕەها دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی گەلێ دەوڵەت ، لەکاتێکدا ئەو دەوڵەتانە لە ئەوپەڕی یەکگرتوویی وئاسایش و ئارامیدا دەژێن ، لەهەمان کاتدا دروست بوونی هەندێ دەوڵەتی زۆر بە هێز کە دەشێ ببنە مەترسی لەسەر ئاشتی وئاسایشی نێودەوڵەتی . ئەمە و لەهەمان کاتدا پەیوەندی نێوان تاکەکانی یەك نەتەوە پەیوەندییەکی سروشتی گیانییە ، کە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێتی ڕگەز ،

ئـايين ، زمـان ، ئامانجـە هاوبەشـە نەتەوەيـەكان. هـەروەها نـەريت ، بـاو، بيروبـاوەڕ. پەيوەندى نێوان يەك نەتەوە پەيوەندييەكى ياسايى نييـە و هيـچ كاردانەوەيـەكى ياسايى لێ نابێتەوە. بەڵام پەيوەندى نێوان تاكەكانى كۆمەڵ كە گەلێك پێك دێنـن پەيوەندييـەكى ياسايىيە و هـەموويان پێناسـەى هـەمان دەوڵەت هـەڵدەگرن و هـەمان ئـەرك و خۆگرتـن دەكەوێتە ئەستۆيان ، كە ياساكانى دەوڵەت دەيسەپێنێت. دەبێ بەرگرى لـە وولات بكەن ، خزمەت لە سوپادا بكەن ، ياساكانى دەوڵەت پەيڕەو بكەن ، ملكەچى ياسا بـن ، لـە هـەمان كاتدا دەوڵەت دەبێ تەناهيى و ئـارامى و ئاسايش بـۆ گيـان و ماڵيـان دابـين بكـات و بۆيـان هەيـە بخزێنـە نـاو ئاسـتە بـەرزەكانى دەوڵەتـەوە و جێگـاى خۆيـان بگـرن لـە دام و دەزگـا بـەرزەكانى دەوڵـەتدا و ببنــە فەرمانبـەرى گشـتى و وەزيـر و پلـەو پايـە وەربگـرن لـە ريزەكانى سوپا و دەزگاكانى بەڕێوەبردن. دەتوانن سوود وەربگرن لە هەموو ئـەو مافانـەى كە ياسا سورشتى و دانراوەكانى دەوڵەت پێيـانى بەخشيوە، ئـەمڕۆ لەوميـە نەتـەوە هـەبێ بەڵام ئەو نەتەوميە دەوڵەت نەبێ ، دەبێ دەوڵەتيش هەبێ لە يەك نەتەوە پێـك نـەهاتبێ وئەو نەتەوانەش بە يەك زمان قسە نەكـەن ، بـۆ نموونـە سويسـرا لـە چـەند نەتەوەيـەك پێـك هاتووەو ئـەم زمانانـەى تێدايـە ، ئـەڵمانى ، فەڕەنسى ، ئيتـالى ، هـەروەها لـە هنـد زمانەكانى ئينگليزى ، هندى و ئەوەردى هەن جگە لە چـەند زمـانێكى تـر ، لـە كەنـەداش دوو زمانى ڕەسمى هەيە ، ئينگليزى و فەڕەنسى .

هەروەها ياساى نێودەوڵەتى لـە تـێڕوانينێكى مرۆڤانـەوە تەماشاى نەتـەوە دەكـات ، بێ ئەوەى كەسايەتييەكى نێو دەوڵەتى بۆ دابنات و مامەڵەى كەسايەتى نێودەوڵەتى لـە گەڵدا بكات.

**دووەم: ـ**

**هـەرێم:** يـەكێ لـە ڕايەڵـە سـەرەكييەكانى دەوڵـەت كـە هـەبوونى پێويسـتە بـۆ هەبوونى دەوڵەت هەرێمە ، هەرێم زەوييەكە دانيشتوانى دەوڵەت لـە سـەرى نيشتەجێ دەبن بە شێوەيەكى هەميشەيى و سوودى لێ وەردەگرن بۆمان و ژيان و بەردەوام بوونـى ژيانيان و پەيداكردنى پێداويستييەكانيان. بۆيـان هەيـە سـوود وەربگـرن لـە چيـا، بـاخ،

دەریا، دەشت، سامان و کانزا سەرزەمین و ژێرزەمینەکان. ئەمەو هەرێمی دەوڵەت لە چوار چێوەی یاسای نێودەوڵەتیدا ئاسمانی هەرێمەکە و زەمینی هەرێمەکە و ئەو ڕوبار و دەریایانەی کە بە هەرێمەکەوە لکاون دەگرێتەوە. ئەمەو نەریتی نێودەوڵەتی لە سەر ئەوە سەقامگیر بووە کە سنووری دەوڵەت تا سێ میل دەریا دەڕوات ، ئەو مەودایەش مەودای گوللە تۆپێك بووە ، کە لەو کاتەدا زیاترین مەودای تۆپ بووە.هەروەها ئەو مەسافەیەیە کە بەچاو دەبینرێ لە کەش و هەوایەکی

ئاساییدا، بەڵام پاش جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم ئەم پێوەرە لەق بوو وهەندێ دەوڵەت وەکو دەوڵەتانی ئەسکەندەناڤی ، پورتگال ، ئیتالیا ، یۆنان، میسر و هەندێ لە وولاتانی ئەمەریکای لاتین ئەو مەودایەیان بە چوار میل تا دوو سەد میل دیاری کردووە. هەرێم مەرج نییە خاکێکی یەك پارچە بێت ، دەبێ هەرێم لە چەند پارچە زەوییەك پێك هاتبێ بێ ئەوەی پێکەوە لکابن ، بۆ نموونە دەوڵەت هەیە لە چەند دوورگەیەك پێك هاتووە*. ئەگەر تەماشای دەوڵەتەکان بکەین دەبینین هەندێکیان لە سەر دەریان و هەندێکی دیکەشیان دابڕاون لە دەریا.هەندێکیان ڕووبەرەکانیان بچووکە بێ ئەوەی ئەوە کار بکاتە سەر کەسایەتی نێودەوڵەتی ئەو دەوڵەتانە. بۆ نموونە فاتیکان ڕووبەری زەوییەکەی (١,٥) کیلۆمەتر کەمترە ، هەندێکی تریان خاوەنی ڕووبەرێکی پان وفراوانن لە زەوی. ئەمەو باشتر وایە هەرێمی دەوڵەت سنوورێکی نێودەوڵەتی دیاری کراوی هەبێ و جێگای ململانێ و کێشە نەبێ ، بەڵام وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا تا ماوەیەك سنووری نێوانیان دیاری نەکرابوو ، ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە ڕایەڵی هەرێم نەبێ بە هۆی دیاری نەبوونی سنوورەوە. لە ڕۆژی ئەمرۆدا هەموو پارچە زەوییەك لە سەر ئەم زەمینە بە هەرێمی یەکێ لەو دەوڵەتانە دادەنرێ کە بوونیان هەیە ، تەنها هەردوو جەمسەری باکور و باشوری تۆپی زەوی نەبێ کە ئەوەش بەکار ژیانێکی بەردەوام نایە و دەوڵەتەکان ڕووی تێ دەکەن بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی بوارە جیاجیاکانی زانست.

---

* دەوڵەتی فیلیپین لە (٧٠٠٠) دوورگە پێك هاتووە.

ـ چۆن هەرێمێك دەچێتە ژێر ڕكێفی دەسەلاٚتی دەوڵەتێكەوە؟

هەندێ لە یاسازانەكان دابەشیان كردووە بۆ هۆیە ساغەكان و هۆیە گوێزەرەوەكان ، هۆیە ساغەكان ئەمانەن:

دەست بە سەرا گرتن (استیلاء)، خستنەسەر(اضافة).

هۆیە گێوزەرەوەكان، وازهێنان (تنازل) ، بەسەرچوون (تقادم).

هەندێكی دیكە لە یاسازانەكان دابەشیان كردووە بۆ هۆیە دیفاكتۆییەكان (الاسباب الواقعية) و هۆیە یاساییەكان (الاسباب القانونية).كاتی خۆی دەست بە سەراگرتن بە هێزترین هۆ بووە لە هۆیەكانی چونە ژێر ڕكێفی هەرێمێك بۆ دەوڵەتێك ، بە هۆی پەرش و بلاٚو بوونەوەی دەوڵەتەكانی ئەوروپا بە جیهاندا لە سەدەی پێنجەیەمینەوە و پاش ئەوەش، لە بەر ئەوەی خستنەسەر ببێتە هۆی بە خۆگرتنی هەرێمێك لە لایەن دەوڵەتێكەوە ، دەبێ ئەو هەرێمە بێ خاوەن بێ و خستنە سەرەكەش كاریگەر بێ ، نەك تەنها دەوڵەتێك بیدۆزێتەوەو سەروەری كاریگەری بە سەرەوەنەبێ.

ـ بۆ ئەم مەبەستەش یاسازانی سویسرایی ـ هۆبز ـ پرەنسیپی كاریگەری كردووەتە پێوەر و حوكمی لە قازانجی هۆڵەندا دەركردوە لە كێشەی دوورگەی پاڵماز (Palmas)، كە كێشەیەك بوو لە نێوان هۆڵەندا و ئەمریكادا ، هەرچەندەئەمریكا دوورگەكەی دۆزیبوەوە ، بەلاٚم هۆڵەندا سەروەری كاریگەری و پراكتیكی خۆی بە سەردا سەپاندبوو (استيلاء بصورة فعالة).

**خستنەسەر:** خستنەسەر بە حوكمی سرووشت بە پاشكۆی هەرێم لە قەڵەم دەدرێ ، بۆ نموونە نزیك كەناراوەكانی دەوڵەتێك بە هۆی دابەزینی ئاستی ئاوەوە دورگەیەك بە دەر دەكەوێ ، یان دەوڵەتێك كەناراوەكانی پڕ دەكاتەوە و دەیكاتە زەوی‌و دەبێتە بەشێك لە هەرێمەكەی وەكو هۆڵەندا (ئەمە دوو هۆی ئەسلی بوون ). بەلاٚم ئەوانەی كە هۆیەكان دابەش دەكەن بۆ هۆیە دیفاكتۆیەكان و هۆیە یاساییەكان ، دەبینن داگیركردن هۆیەكی واقعیە بۆ دەست بە سەردا گرتنی هەرێمێك لە لایەن دەوڵەتێكەوە.داگیركردن لە كاتێكدا دەبێت دەوڵەتێكی بەهێز دەست بە سەر هەرێمی دەوڵەتێكی تردا بگرێ و سەروەری خۆی بە سەر هەرێمی تازەدا بسەپێنێ.

- ڕیفیر - دەڵێ لەم کاتەدا دەبێ دەسەڵاتی گشتی دەوڵەتی شکەست خواردوو لە بان هەرێمەکانی نەمێنێتەوە بە هەڵوەشاندنەوەو تێك چوونی ئەو دەسەڵاتە ، ئەگەر دەوڵەتی سەرکەوتوو نەیەوێ دەسەڵاتی گشتی لە هەرێمی داگیرکراو لە ناو ببات ، ئەو کاتە هەرێمەکانی دەوڵەتی دۆڕاوو نابنە بەشێك لە هەرێمەکانی دەوڵەتی سەرکەوتوو. هەر چەندە ئەم هۆیە لەکاتی خۆیدا کاریگەری خۆی هەبوو بەڵام لەکاتی ئێستادا داگیرکردن نابێتە هۆیەك بۆ سەپاندنی سەروەری لە لایەن دەوڵەتێکەوە بە سەر هەرێمێکدا تەنها لە کاتێکدا نەبێ دەبێ پەنا بردنە بەر هێز ڕەوا بێ. بەڵام هۆیە یاساییەکان پێك هاتوون لە ڕێکەوتنە نێودەوڵەتییەکان و حوکمی دادگا نێودەوڵەتییەکان و بڕیاری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان.

## سێیەم :-

## دەسەڵات ( السلطة )

چەمکی دەسەڵات: دەسەڵات پێداویستییەکە لە پێداویستییەکانی هەر کۆمەڵگەیەك و لە هەمان کاتدا دیاردەیەکی سروشتییە وەکو (هەوا ، ئاو ، باران) بۆ ژیان و بەردەوام بوونی ڕەوتی ژیان.

فرۆید دەڵێ: کاتێ منداڵ دێتە دونیاوە ، لە سەرەتادا سەرفرازی و سەربەستی ڕەهای خۆی وەردەگرێ ، لە بەهەشتێکی بێ وێنەدا دەژێ لە ژێر سەرپەرشتی دایك و باوك دا ، دایك لەم قۆناغەدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ ، پاش ئەم قۆناغە دەسەڵاتی باوك دێتەکایەوە و منداڵ ڕووبەڕووی فەرمان و ئەوە بکە وئەوەمەکەی باوك دەبێتەوە و گوشار دەکەوێتە سەر منداڵ بۆ خۆ لە قاڵب دان و گونجاندنی هەڵس و کەوتی لە گەڵ سیستەمیماڵەوەدا. کاتێ تێکەڵی منداڵانی هاوڕێی دەبێ لە گەڕەك و قوتابخانە ، دەبێ پێبەندی سیستەم و دەسەڵاتی گرووپەکەی ببێ، پێبەندی داب و نەریت و ڕیاساکانی ئەو یاریانە بێ کە لە نێوانیاندا دەکرێ ، دەبێ پێبەندی داب و نەریت و یاساو ڕێساکانی قوتابخانە بێت ، کە مامۆستاکانی نوێنەرایەتی ئەو سیستەمە دەکەن و هەم دەسەڵاتن بە سەر قەتابخانەدا. ئیتر تا منداڵ تەمەنی گەورەتر دەبێ هەست بە

هەبوونی دەسەڵاتێکی زیاتر دەکات ، تا دەگاتە خزمەت کردن لە ڕیزەکانی سوپاو هەڵگرتنی ئەرك و فەرمانی قورس وگەورە.دەسەڵات ڕیشاڵێکە لە ڕیشاڵەکانی دەوڵەت ، سەنتەری کۆنترۆڵ کردنی ئەو کۆمەڵگەیە کە لە سەر هەرێمی دەوڵەت نیشتەجێ بوون. بۆ زیاتر شیکردنەوەی چەمکی دەسەڵات پێویست دەکات لە چەند لایەنێکەوە تاوتوێ بکرێ و لێی بکۆڵدرێتەوە ، هەندێ پرسیار هەیە پێویستی بە وەڵامدانەوە هەیە:

## ١- دەزگای دەسەڵاتدار:

دەزگای دەسەڵاتدار، واتا سەرچاوەی کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵ ، یاسادانەر ، بڕیار بەدەست، چارەنووس دیاری کەر و ڕێکخەری ژیانی تاکەکانی کۆمەڵ و سەرجەم کۆمەڵگە و دیاری کەری هێڵە سەرەکییەکانی ژیانی کۆمەڵگەو بەردەوام بوونی ئەو ژیانە. بەڵام دەزگای دەسەڵاتدار وەکو مێژو بە چەند قۆناغێکدا ڕۆیشتوە ، وەکو ڕەوتی سروشتیی مێژوو ، هەردەم لە پێشکەوتندا بووە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر ، لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا کاتێ مرۆڤ لە ململانێیەکی سەخت دا بوو لە گەڵ ژیاندا ئەو کەسانە دەبونە سەرچاوەی دەسەڵات ، کە بە بازوو توانای بەدەنی و توندو تیژی و توند وتۆڵی خۆیان ، خۆیانیان بە سەر خەڵکی دەوروبەریاندا دەسەپاند ، دەبوونە سەرچاوەی دەسەڵات و ڕابەرایەتی کۆمەڵگەیان دەکرد ، بەڵام لە گۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا هەندێ لەو سەرچاوانەی کە دەسەڵاتیان بەم شێوەیە دەگرتە دەست ، شێوازێکی پیرۆز بەهایان دەدا بە حوکمەکەیان ، بۆ نموونە لە هەندێك لەو قۆناغانەدا دەسەڵات بە دەست ئاوەڵناوی (سیفەتی ) خوداوەندی دەدایە پاڵی خۆی ، واتا دەیگوت (من خودام ) بەم جۆرە هیماو هەیبەت و نموودێکی پیرۆزی بۆ خۆی دروست دەکرد ،تاکەکانی کومەڵگەیش بەوجۆرە تەماشایان دەکرد ، ئەمە دەبووە هۆی بە پیرۆزی تەماشا کردنی دەسەڵات و بە ناڕەوا (کفر) بوونی هەرجۆرە گفتوگۆ و دیالۆکێك لە سەر ڕەوایی ،یان ناڕەوایی دەسەڵاتدار. سەرپێچی کەری ئەو دەسەڵاتە توشی سزای ئەم دونیاو ئەو دونیاش دەبووەوە، خەڵکی ئامادەی هەر فەرمانێك دەبوو جێبەجێی بکردبایە لە بەر ئەوەی ( بە گوێرەی عەقلیەتی ئەو کاتە) لە لای خوداوە دەرچووە، بۆ

نموونە ئەگەر تەماشای هەرەماتەکانی میسر بکەین بۆمان دەردەکەوێ ئەگەر تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لە ژێر دەسەڵاتێکی لەو جۆرە نەبوونایە نەیان دەتوانی لەو سەردەمەدا و بە ئامرازی سەرەتایی و بە توانایەکی تەکنیکی کەمەوە، ئەو کارە مەزنە تەکنیکیە گەورەیە ئەنجام بدەن . بەڵام بە پێشکەوتنی ڕەوتی بیروبۆچوونی مرۆڤ تاکی دەسەڵاتدار نەیتوانی خۆی بە خوداوەند دابنات، لە جێگای ئەوە خۆی بە نێردراوی خودا دادەنا ، واتا سەرچاوەی دەسەڵات خودایەو ، تاکی دەسەڵاتدار ئیرادەی ئەو جێبەجێ دەکات لە سەر کۆمەڵگە ، ئەو قسە لە گەڵ خودا دەکات و فەرمان و ئامۆژگاری لێ وەردەگرێت و دەیگەیەنێتە خەڵکی. لێرەدا دەسەڵاتدار دیارە دەبێ کەسێکی بە توانا بێ، خاوەن بەهرە بێ وهەیبەتی خۆ سەپاندنی هەبێ بە سەر مێشکی خەڵکیدا، ئەمە جگە لە هەبوونی پرۆگرام، هەروەها هەبوونی پشت وەکو عەشیرەت و خزمی زۆرو ناسراوی ڕەگەزی خاوەن دەسەڵات لە لایەن کۆمەڵگەوە . لێرەدا دەسەڵات وەکو ئاماژەمان پێکرد نوێنەری یان نێردراوی خودایە ، بۆیە دیالۆك و گفتوگۆ لە سەر کەسی دەسەڵاتدار و شێوەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتەکەی بە ناڕەوایی (کفر) لە قەڵەم دەدرا ، هەر کەسێ سەرپێچی فەرمان و یاسا و ڕیاساکانی ئەو دەسەڵاتەی بکردبایە ، بێگومان تووشی سزای ئەم دونیا و ئەو دونیا دەبووەوە. نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە کاتێ عیبرانییەکان بە سەرۆکایەتی نێردراوی خودا (موسی) کە کۆمەڵێك کۆیلە بوون هەڵهاتن و دەریای سپی ناوەڕاستیان بڕی بەرەو خاکی کەنعان ، موسی بە قسەکردن لە گەڵ خودادا ، فەرمان و یاساو ڕیاسای لێ وەردەگرت و دەیگەیاندە عیبرانییەکان و دەستوورێکیان پێ گەیشت لە لایەن خوداوە کە لە (١٠) خاڵ پێك هاتووە، پێی دەڵێن دە وەسیەتەکە(لە خوروجەوە ٢٠ــ ٣٢ــ ١٩). بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر نەڵێین هەموو ، ئەوا زۆربەی ئەو دەسەڵاتانە سوودیان لە مینبەرە ئایینییەکان وەردەگرت بۆ مانەوەو بە هێزکردنی دەسەڵاتەکانیان ، عەقڵیەتی خەڵکی ئەو کاتە وا بوو، کە هەر شتێك ڕوویان تێ بکات بە باش یان بە خراپ لە لایەن خوداوەیە و دەبێ قەبوڵی بکەن ، بۆیە زۆر جار دەسەڵات دیالۆکی لە سەر نەدەکرا ، وەکو باسمان کرد سوود وەرگرتنیان لە سەکوە ئایینییەکان ڕەوای بە دەسەڵاتەکەیان دەدا و خەڵك

قەبوڵیانی دەکرد.ئەمەو ئایین هەموو کاتێ لە خزمەتی دەسەڵاتدا نەبووە ، هەموو ئایینێ لە کاتی دروست بوونیدا شۆڕشێك بووە لە سەر دەسەڵاتی سەردەمی خۆی:

ـ ئایینی جوولەکە لە سەرەتادا شۆڕشێك بووە بەرانبەر ئەو زوڵم و زۆرەی ڕووبەڕووی جوولەکەکان دەبووەوە لە لایەن میسرییەکانەوە، جوولەکەکان کۆیلە کرابوون و میسرییەکان کاریان پێیان دەکردوو ڕۆژانە دەیانیان دەچەوساندەوە ، موسی کە خۆی بە منداڵی لە مردن ڕزگاری بوو لە دەستی میسرییەکان ، قەدەر وایکرد لە کۆشکی فیرعەوندا بە خێو بکرێت ، پاشان کە گەورە بوو ڕووبەڕووی ئەو زوڵم و زۆرە بووەوە و لە ئەنجامدا هەموو جوولەکەکانی کۆکردەوەو لە ژێر دەست میسرییەکان هەڵهاتن و ڕوویان کردە دەشتی (سینا) و لەوێوە بەرەو خاکی کەنعان.

ـ بەنسبەت ئایینی زەردەشتییەوە، زەردەشت کەسێك بووە لە پیاوانی ئایینی لە کاتی دەسەڵاتی پارسییەکان ( ١٦٣پێش ز ـ ٢٢٦پاش ز ) داوای لە خەڵکی دەکرد بۆ شۆڕش کردن دژی دەسەڵاتی پارسی و ئرستۆکراتییەکان و کەهەندەکان ( ئاخوندەکان ) کە ئەوانە خاوەن زۆربەی زەوی و زارەکان بوون ، زەردەشت داوای دەکرد ئەو زەوی و زارانە دابەش بکرێن و هاوکاری بکرێ بۆ چاکسازی یەکی ئابووری هەمە لایەنە و بە هاتنی دەسەڵاتی ساسانییەکان (٢٢٦ ـ ٦٣٨ ) پاش زایین، ئایینی زەردەشت بووە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت.

ـ ئایینی مانی بریتی بوو لە شۆڕشی جوتیارەکان بەرانبەر خاوەن زەوییەکان ، کە جوتیارەکانیان دەچەوساندەوە بە ناوی ئایینی زەردەشت و دەزگای کۆیلایەتییەوە. فەرموودەکانی مانی داوای زاڵبوونی شتە ڕووحییەکانی ( گیانییەکانی ) دەکرد و بە خێری لە قەڵەم دەدان ، لە بەرانبەردا ماددەی بە شەڕ لە قەڵەم دەدا ، پەیڕەوکەرانی ئەم ئایینە تێکەڵ بوونی سیکسی و کوشتنیان بە کرداری شەیتان دەزانی و قسەنەکردنو کەم جوڵان و نەبڕین و نەچنینی بەروبوومی کێڵگەکان و باخەکانیان بەباش دەزانی ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پەکخستنی کار و کشتوکاڵ بوو ، بەوەش زیانێکی زۆری بە خاوەن زەوییەکان دەگەیاند ، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا وێرانکردنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری بوو بە شێوەیەکی گشتی.

- ئایینی‌مەزدەکی لەسەدەی پێنجەمی پاش زایین هاتە کایەوە ، ئەم ئایینەش دژی هەبوونی جیاوازی چینایەتی و باخوبەری بوو ، داوایان دەکرد هەر پیاوێك پارچەیەك زەوی بدرێتێ و زەوی بە یەکسانی دابەش بکرێ. بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ بیرو باوەڕی نامۆی تێدا بوو وەکو داواکردنیان بۆ نەمانی دەزگای ژن هێنان و شوکردن ، بێ گومان ئەم بیرو باوەڕانە زیانی هەبوو بۆ خاوەن زەویەکان و خودی دەسەڵاتی ئیمبراتۆری، بۆیە کەوتنە ڕاونانیان و کوشتنیان و بڕینیان و پەرش و بڵاوە پێکردنیان.ئەمەو پێشکەوتنی دەسەڵات و قۆناغە نوێکانی دکتاتۆریەت و هاتنە کایەوەی بیری دیموکراسی و پراکتیزە کردنی ، لێرەدا پێویست ناکات باسیان بکرێ ، لە بەر ئەوەی لە باسەکانی داهاتووماندا بە درێژی دێینە سەر باس کردنیان. بەڵام ئەوەی ماوە بیڵێین وەکو دەیبینین دەسەڵاتی ڕامیاری جاران پەیوەست بوو بە کەسی دەسەڵاتدارەوەو وەکو مافێك و باخوبەرییەکی ئەوان وابوو. بە نەمانی ئەوان دەسەڵاتی ڕامیاری سەرەو ژێر دەبووەوە و هەندێ جاریش قەوارەی دەوڵەت لە ناو دەچوو ، بەڵام دەسەڵاتی ڕامیاری ئێستا پتەوەو سەقامگرتووە ، دەسەڵاتداران نوێنەری دەسەڵاتی ڕامیارین و ڕاڤەی دەسەڵات بە ناوی دەوڵەتەوە دەکەن ، دەسەڵات موڵکی دەوڵەتەو دەسەڵاتداران تەنها ڕاڤەی ئەو دەسەڵاتە دەکەن، بە نەمان و گۆڕانی دەسەڵاتداران ، نە دەسەڵاتی ڕامیاری لەق دەبێ و نەقەوارەی دەوڵەت تێك دەچێ.

## ٢.دەسەڵاتی دەسەڵاتداران ( سلطة الحكام )

لە سەرەتادا باسی دەزگای دەسەڵاتدارمان کرد ، پێویست دەکات باسی دەسڵاتی دەسەڵاتداریش بکەین کە لە چەند بابەتێك پێك هاتووە لەوانە:

ا-دەسەڵات و ناچار کردن (السلطة والارغام ):

ناچارکردن ڕیشاڵێکی سەرەکییە بۆ بە دەسەڵات بوون و بەردەوام بوون و مانەوەی دەسەڵات ، ئەو ناچارکردنەش بەچەند شێوەیەك ڕەنگ دەداتەوە ،لەومیە بەکارهێنانی هێزی سەربازی و تۆپ وتەیارە و زرێپۆش و ئامرازەکانی تری جەنگ بێ بەرانبەر ئەوانەی لە دەسەڵات یاخی دەبن ، ئەمە شێوازێکی زۆر زەقەو پەیڕەو کراوە

لەلایەن سیستەمە دکتاتوریەکانەوە، بەلام لە سیستەمی دیموکراسیدا ئەم شێوازە کەمتر پەیرەو دەکرێ، وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کاتی حوکمرانی فرەنکلیندا (١٨٦٠-١٨٦٥)ز هێزی سەربازی بە کار هێنا دژ جوداخوازەکانی باشوور بۆ پاراستنی دەسەلاتی فیدرالی لەوولاتدا ، ئەمەو شێوەکانی تری ناچارکردن خۆی لە سزا یاساییەکاندا دەبینێتەوە کاتێ دەستوور و یاساکانی دەولەت کار و باری دەسەلات رێك دەخەن ، لە هەر بوارێك و لە هەر چوارچێوەیەکدا و بۆ جێبەجێ کردنی هەر یاسایەك ، یان بۆ رێکخستنی هەر حالەتێك ، سزای دیاری کردووەو سەرپێچیکەرانی ئەو یاسایانە تووشی لە سێدارە دان و بەندکردن دەبنەوە. لە هەندێ یاساکاندا خیانەتی گەورە لە نیشتمان و کوشتنی بە ئەنقەست بە کۆششی پێشو ، (واتا نیەتی کوشتنی کەسێك و پیلان دانان بۆی و پاشان جێبەجێ کردنی) ، سزای لە سێدارە دانە ، واتا ئەوەی ئەو کارانە بکا لە سێدارە دەدرێ ، ئەمەش سزایەکە بۆ ئەوەی خەلکی ناچار بن لەو ئیشانە دوور بکەونەوە. لەو شێوازانەی سەرەوە کە باسمان کرد ، ناچار کردن بە دەردەکەوێ وەکو ئامرازێك بۆ پاراستن و بەردەوام بوونی دەسەلات.
ئەمەو نابێ لە دەولەتدا دوو دەسەلات هەبێ و هەردوکیان خاوەن هێزی ماددی بن لە سەرباز و ئامرازەکانی جەنگ ، ئەگەروا بوو ئەوا شەڕی ناوخۆ دروست دەبێت و ئەو شەڕەیش یان بە نەمانی یەکێکیان تەواو دەبێت، یان ئەو دەولەتە دەبێتە دوو دەولەت و هەر یەکەو دەسەلاتی خۆی و هێزی ماددی خۆی دەبێ. هەروەها دەسەلاتی رامیاری دەبێ خۆی خاوەن هێزی مادی و ناچارکردن بێ و نابێ لە پال دەسەلاتی دەولەتدا هێزی سەربازی و هێزی ماددی دیکە هەبێ و دەبێ دەسەلاتی رامیاری بواری ئەو هێزانە نەدات .

### ب-دەسەلات و یاسا (السلطة والقانون ):

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد دەسەلات پێویستی بە یاسا هەیە بۆ رێکخستنی کۆمەلگە و دیاری کردنی ماف و ئەرکی هەر توێژ و تاکێك لە توێژ و تاکەکانی کۆمەلگە. لە کۆمەلگە سەرەتاییەکاندا ، یاسا دانراوەکان لاواز بوون بۆیە کۆمەلگە لە رووی رێکخستنەوە لاواز بوو و دەسەلات لاواز بوو (لە روانگەی ماف وبەرژەوەندیەکانی

توێژ و تاکەکانی کۆمەڵەوە ) ، بەڵام لە گەڵ گەشەکردن و پەرەپێدانی ڕێکخستنی یاسایی ، سیستەم و دەسەڵات لە کۆمەڵگەدا بەهێز بوون. واتا پەیوەندییەکی نزیك لە نێوان دەسەڵات و یاسادا هەیە ، ئەو دوو شتە هاوتەریبی یەکن ، بەهێز بوونی دەسەڵات ڕێکخستنی یاسایی بەهێز دەبێت ، بەهێز بوونی یاسا دانراوەکان و گەشەکردنیان دەسەڵات بەهێز دەبێت ، لێرەدا دەبێ ئاماژە بە ناچارکردن بکەین لە بەر ئەوەی هەر یاسایەك دەبێ سزایەکی بەدواوە هەبێ بۆ ناچارکردنی تاکەکانی کۆمەڵ بۆ پەیرەو کردن و هەم پەیوەست بوون پێیەوە ، یاسا ئامرازێکی ساکارانەی دەسەڵاتە بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە ، بەڵام یاسایش لە سەر هێزێکی یەدەکی دەوەستێ کە لە کاتی پێویستدا دێتە کایەوە ، ئەو هێزەش ناچار کردنە (سزا) ، کاتێ یاسا پێشێل بکرێ ، سەرپێچی بکرێ. جێبەجێ نەکرێ ، ئەو کاتە سزا دێتە کایەوە و ڕووبەڕووی سەر پێچی کەران دەبێتەوە ، بەهەر حاڵ لە تواناادا نابێ بێ یاسا دەسەڵات دەسەڵاتدارێتی بکات ، ڕاڤەی دەسەڵات بکا و یاسا ڕیشاڵێکی سەرەکییە بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات و بەردەوام بوونی.

ج. دەسەڵات و بیر و باوەڕ :

دەسەڵات حوکمی کۆمەڵگە دەکات لە ڕێگای یاسای دانراوەوە ، بۆ جێبەجێ کردن و پەیرەو کردنی یاسای دانراو، پشت بەو سزایانە دەبەستێت کە لە پاڵ ئەو یاسایانەدا حەشار دراوون ، کاتێ سەرپێچی لە یاسای دانراو کرا ، ئەو کاتە سزا دێتە کایەوە و ڕووبەڕووی سەرپێچی کەران دەبێتەوە، بەڵام هەرچەندە یاسای دانراو و ناچارکردنی کۆمەڵگە بۆ لانەدان لەو یاسایانە بە ڕیشاڵێکی سەرەکی پێکهاتەی دەسەڵات دەژمێردرێن ، بەڵام قەناعەتی خەڵکی دەربارەی دەسەڵات و بیرو باوەڕی کۆمەڵگە دەربارەی ئەو دەسەڵاتەی کە بەڕێوەیان دەبات و تێڕوانینی جەماوەر بۆ چۆنێتی بەڕێوەبردن و گواستنەوەی دەسەڵات لە دەست کەسێك یان چەند کەسانێك بۆ دەست کەسێك یان کەسانێکی دیکە ، ئەمانە هەمووی ئەگەر ڕیشاڵێکیش نەبن لە ڕیشاڵەکانی دەسەڵات ئەوە هۆکارێکن بۆ یاخی بوون ، یان سەرنەوای خەڵکی بۆ ئەو دەسەڵاتەی کە حوکمیان دەکات ، هەر دەسەڵاتێك بیروڕای خەڵکی لە سەربێت و جەماوەر قەناعەتی

پێ هەبێ ، ئەوە ئەو دەسەڵاتە سەقامگیر و بە هێز و بتەو دەبێت ، بەڵام هەر دەسەڵاتێ قەناعەتی خەڵکی لە گەڵدا نەبێت ، ئەوە دەسەڵاتێکی لاواز و شڵەژاوو شێواو دەبێت ، لێرەدا بیری ڕەوای و ناڕەوایی دەسەڵات دێتە کایەوە ، ئایا چ کاتێك دەسەڵات ڕەوایە و چ کاتێك ناڕەوایە ؟

د. بیرۆکەی ڕەوایی :

لە هەر وەخت و کاتێکدا خەڵکی بیر و ڕایەکی تایبەتیان هەیە بەرانبەر دیاردەی دەسەڵات و چۆنێتی دەسەڵات بەدەست گرتن و گواستنەوەو چۆنێتی بەڕێوە بردنی دەسەڵات لە لایەن ئەو کەسانەوە کە دەسەڵات بە دەستن دەگرن ، ئەو بیر و باوەڕانەش لە جێگایەکەوە بۆجێگایەکیتر و لە کاتێکەوە بۆکاتێکیتر دەگۆڕێن، بۆنموونە لەفەرەنسا، فەرەنسایییەکان لە وەختێکدا بڕوایان وابوو کە پاشا، دەسەڵاتدار لە بنەماڵەی بۆربۆن بێ ، تەنانەت هەندێکیان بۆچونیان وابوو ، نەك تەنها لە بنەماڵەی بۆربۆن بێت بەڵکو لە نەوەی کوڕە گەورەکەی بۆربۆن بێت ، بەو شێوەیە و بەپێی ئەم نموونەیە ، وا دیارە ئەو کاتە ئەگەر دەسەڵاتدار کەسێکی تر بووایە و لەو بنەماڵەیە نەبووایە، ئەوە ئەو دەسەڵاتە ناڕەوا دەبوو بە تێڕوانینی خەڵکی ، بە هەر حاڵ دەسەڵاتی ناڕەوا ڕووبەڕووی یاخی بوونی خەڵکی دەبێتەوەو ڕەتدەکرێتەوە لە لایەن جەماوەرەوە ( حوکم کراوەکان ).

## ٣. هۆیەکانی گەیشتن بە دەسەڵات

وەکو دەزانین هەر دەسەڵاتێك لە هەر جێگاو شوێنێك بێت ، لە لایەن کەسێکەوە یان چەند کەسانێکەوە بەڕێوە دەبرێت ، لێرەدا پرسیار ئەوەیە:

ـ ئایا ئەو کەسانە بۆ دەبنە خاوەن دەسەڵات ؟

ـ چی وایان لێ دەکات بتوانن بڕیار و فەرمان دەربکەن و بە سەر خەڵکیدا بیسەپێنن؟.

ئەو هۆیانەی هەندێ کەس یان چەند کەسێك دەگەیەننە دەسەڵات ئەمانەن:-

أ- هێزی بەدەنی:.

هێزی بەدەنی هۆکارێك بوو بۆ گەیشتنی هەندێ کەس بە دەسەڵات لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، کە پێویستی و بڕوای خەڵکی بە سەرکردەیەکی بە هێز و بە توانا و تونـد و تۆڵ، هەل و مەرجی ژیانی ئەو کاتە دەیسەپاند. کۆمەڵگە سەرەتاییەکان پێویستییان بەتوانای بەدەنیو ئازایەتی ونەبەزی هەبوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی سروشت و کۆمەڵ و گرووپەکانی تر کە لە دەور و بەریان دەژیا ، بۆیە خەڵکی سوار چاك وئازا و نەترس، لە بەرچاوی هەمووان بوون، پایە بەرزەکانی ئەو کۆمەڵگەیانەیان دەگرتە دەست ، لەو پایانەش ، پایەی دەسەڵات، بەڵام وەکو باسمان کرد هۆکارێکی سەرەتاییەو لەگەڵ پێشکەوتنی مرۆڤ و پێشکەوتنی ڕەوتی سیستەمی ڕامیاری و دەسەڵات ، بایەخی خۆی لە دەست داوە ، هەندێ پاشماوەی کە مابێتەوە و ئامرازێك بێت بۆ گەیشتن بە دەسەڵات ، هێزی سەربازییە، ئەم ئامرازە هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات ، واتا لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزی سەربازی و سوپا و تۆپ و زرێپۆشەوە هەندێ کەس دەگەن بەدەسەڵات، بەڵام ئەم ڕێگایەش بۆ گەیشتن بە دەسەڵات لە سەردەمی ئەمڕۆدا لە هەر جێگایەك ڕوو بدات بە پاشفەڕۆی و گەڕانەوە بەرەو پاشەوە لە قەڵەم دەدرێ. ئەمەو ئەو کەسانەی بەهێزی بەدەنی یان سەربازی بە دەسەڵات دەگەن ، هەر بەو شێوەیەش دەسەڵات بە ڕەهایی بە ڕێوە نابەن ، پەنا دەبەنە بەر هەندێ پرانسیپ و میتۆد بۆ ڕازی کردنی خەڵکی بە دەسەڵاتەکەیان و هەوڵ دەدەن بۆ ڕاکێشانی سۆزی خەڵکی بۆ ئەوەی قایل بن بەو دەسەڵاتە ، لەو ڕێگایەشەوە ڕەوایی بۆ دەسەڵاتەکەیان دابین دەکەن.

ب. هەیبەت ودەسەڵات :.

دیاردەی هەیبەت دیاردەیەکە کۆمەڵێ سیفات و خەسڵەت لە کەسێکدا کۆ دەبێتەوە ، دەبێتە مایەی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی بۆ ئەو کەسەی کە خۆی دەسەپێنێ لە سەر دەور و بەردا ، یان پەسەند دەکرێت لە لایەن دەوروبەرەکەیەوە ، یان هەم خۆی دەسەپێنێ و هەم پەسەند دەکرێ لەلایەن دەوروبەرەوە، لە ڕاستیدا ئەم دیاردەیە لە

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا هەندێ کەس دەگەیەنێتە دەسەڵات و دەبنە بەڕێوەبەری گشتیو وەزیر و پەرلەمانتار و لە ئاستی نزمتردا ڕۆڵ و پلەو پایەی جیا جیا وەردەگرن. دیاردەی هەیبەت دیاردەیەکە لە هەموو جێگایەك و لە هەموو کاتێکدا هەبووەو بە دی دەکرێ ، بۆ نموونە لە پۆلێکی خوێنددندا، لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە تا دەگاتە خوێندنی باڵا، لە هەموو پۆلێکدا کەسێك یان چەند کەسێك بە دەردەکەون لەوانی تر چالاکتر و زیرەکترن ، یان لە ناو کۆمەڵێك سەربازدا چەند سەربازێك بە دەردەکەون. هۆیەکانی هەیبەت ناگەڕێنەوە بۆ یەك شت، بەڵکو ئەو هۆیانە زۆرن، بۆ نموونە لە ڕیزەکانی سوپادا لە کاتی جەنگدا یان ژیانی گەریلایی زیرەکی و چاونەترسی هەیبەتێك بەخاوەنەکەی دەدات ، لە وەرزشدا بونیەی باش و زیرەکی ڕۆڵی خۆی دەبینێ ، لە نووسیندا فراوانی خەیاڵ و لێکدانەوەو دوور بینی ، لە ناو کۆمەڵی لاودا ( کچ بن یان کوڕ ) جوانی و ڕێك و پێکی دەم و چاو و باڵا و زیرەکی هەیبەتێك دەدات بە خاوەنەکەی. ئەمەو دیاردەی هەیبەت تەنها لە مرۆڤ دا بە دی ناکرێ ، تەنانەت لە جیهانی ئاژەڵ و پەلەوەردا دیاردەی هەیبەت دەبینرێ، بۆ نموونە کاتێ پۆلێ قاز و قولەنگ بە ئاسمانەوە دەفڕن دەبینین یەکێ لەو قاز و قولەنگانە لە پێش هەموویانەوەیەو سەرۆکایەتی و ڕێنماییان دەکات ، یان لە ناو گرووپی شێردا یەکێ سەرۆکایەتییان دەکات کە دەبێ لەوانی تر بە هێزتر و توندو تۆڵتر بێت. ئەمەو ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە باسەکەمان هەبوونی هەیبەتە لە کەسانێکدا کە دەگەنە دەسەڵات ، کە چەند شتێك لەو بوارەدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لەوانە:ـ

ناسراوی بنەماڵەی کەسەکە هەیبەتێکی کەسینە دەداتە کەسەکە و زۆر جار دەیگەیەنێتە دەسەڵات، واتا هەندێ کەس دەگەنە دەسەڵات بە هۆی ناسراوی بنەماڵەی ئەو کەسانەوە لە نێو کۆمەڵگەدا و یان کەسێکیان هەبووە لەو بنەماڵەیەدا ناسراوو بووە و خزمەتێکی بەکۆمەڵگە کردووە. ناسراویی بنەماڵە لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا هەیە، دوا کەوتوو بێت یان پێش کەوتوو ، بۆ نموونە هەڵبژاردنی ئاندێرا لە هند یەکێ لە هۆیەکانی ئەوە بوو کە کچی غاندی بووە ، هەروەها هەڵبژاردنی بێنەزیر لە پاکستان بەشێ زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کچی بۆتۆ بووە ، هەروەها هەڵبژاردنی

کوڕەکەی بۆش لە ئەمریکا، بۆشی باوکی کاریگەری خۆی هەبووەو ناسراوی ئەو لە لایەن ئەمریکییەکانەوە هەزارەها دنگی بۆ دابین کردووە.

- چوخت وچالاکی کەسەکە و بونیەتی بە هێز و جەربەزەیی و ئازایەتی و زیرەکی لە هەموو کاتێکدا هەیبەتێکی کەسینەیە ، کە پێکهاتەی خوودی هەندێ مرۆڤ لێی پێك هاتووە. هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات ، بەڵام ئەم جۆرە هەیبەتە کاتی ئێستا شێوازێکی نوێی گرتوەتە خۆی ئەگەر بەراورد بکرێ لە گەڵ پێشوودا، کاتی خۆی لە قۆناغە سەرەتایییەکانەوە تا چەند قۆناغێکی دواتریش و تەنانەت ئێستاش لە هەندێ کۆمەڵگە دواکەوتوەکاندا بونیەو بەدەنی زل و هێزو توند و تیژی چەند هۆکارێك بوون وچەند هۆکارێکن بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، لە بەر ئەوەی توانای بەدەنی و شەڕە شمشێر و لەو بابەتانە چەند هۆکارێك بوون بۆ زاڵبوونی ئەو کەسانە بە سەر دەور و بەریاندا. بەڵام پێوەرەکانی ئەمڕۆ گۆڕاون ، لەوەیە نەرم و نیانی و توانای دیالۆك وکێشی قەناعەت کردن بە خەڵکی وخزمەت کردنی خەڵکی ، هەندێ جاریش دیمەنی کەسەکە ، هەیبەتێکی کەسینە دروست بکات و ئەو کەسە بگەیەنێتە دەسەڵات.

- ڕەوشی ئابووری هۆیەکی دەستەبەرکراوە (مکتسب) کە نموودێك ، هەیبەتێك دەداتە خاوەنەکەی وخەڵکی لە دەوری کۆدەکاتەوەو دەیانکاتە خاوەن دەسەڵات، ئەمڕۆ نکۆڵی لە ڕۆڵی ڕەوشی ئابووری ناکرێ و هەیبەت دان بەو کەسانەی کە خاوەن پول و سِەرمایەن. هەروەها بە دەست گرتنی هەندی پلەو پایە چ لە دەزگاکانی بەڕێوەبردن بێت چ پایەو پلەی پارتایەتی ، هەیبەتێکی دەستەبەرکراو دەدا بە خاوەنەکەی .

لە خوێندنەوەی بابەتەکەمان بۆمان دەردەکەوێت کە هەیبەتی کەسینە ئەو هەیبەتەیە کە چەسپاوە بە کەسێتی کەسەکەوە، بەڵام هەیبەتی دەستەبەرکراو ئەو هەیبەتەیە کە لە گەڵ ڕۆژدا کەسەکە بۆ خۆی دەستەبەری دەکات. لە ڕاستیدا هەیبەتی کەسینە بناغەی ڕاستەقینەی هەیبەتە وهۆیەکیشە بۆ بەدەست هێنانی هەیبەتی دەستەبەرکراو.

ج ـ هێزی ئابووری:ـ

سەرمایە ، پارەو پول ، هۆکارن لە هۆکارەکانی گەیشتن بە دەسەڵات. لە قۆناغە سەرەتاییەکانی کۆمەڵگە رامیارییەکاندا ، زەوی سەرچاوەی ژیان بوو، بناغەو کۆڵەکەی رەوشی ئابووری بوو. دەسەڵات بە دەست خاوەن زەوییەکانەوە بوو ( چینی ئۆرستۆکراتی ). بەپێشکەوتنی مرۆڤ و هاتنەکایەوەو پەرەسەندن و گەشەکردنی پیشەسازی ، تا وای لێ هات بووە سەرچاوەو کۆڵەکەی رەوشی ئابووری. خاوەن سەرمایەو کارگەکان(چینی بۆرژوا ) بوونە هێزێك بەرانبەر چینی ئوروستۆکراتی ، کە دەسەڵاتی میرنشینی ئەو کاتە رابەرایەتی دەکرد ، بەم جۆرە ململانێیەك لە نێوان ئەو دوو جەمسەرەدا هاتە کایەوە، ململانێی نێوان دیموکراسی و میرنشینی ، رەنگ دانەوەی راستەقینەی ئەو ململانێیە بوو ، کە لە نێوان چینی ئوروستۆکراتی و چینی بۆرژوازیدا بەرپابوو، بۆرژوازییەکان توانیان لە سەدەکانی ناوەراستدا چۆك بە چینی ئۆرستۆکراتی دابدەن و خۆیان ببنە خاوەنی دەسەڵات. ئەمەو لەوەیە لە هەندێ قۆناغدا دوو هێز هەبن و هیچ کام لەو هێزانە نەتوانن ئەوی تریان بە لاوە بدەن ، لەو کاتەدا ململانێ لە نێوان ئەو دوو هێزەدا دروست دەبێت ، لەوەیە دەسەڵات رووکەشی ( ظاهری ) لە سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان پێك هاتبێ ، بەڵام دەسەڵاتی سێبەر (ظل) لە خاوەن کارگەکان و کۆمپانیاکان وخاوەن بانکەکان پێك هاتبێ، کە کارتێکردنێکی دوور لە گومانیان هەیە لە سەردەسەڵات.

ئەمەو زۆر جاریش هەیە،خاوەن کۆمپانیاکان وخاوەن بەرژەوندیە گەورەکان نفوزو جێگەیەکی بەهێز تریان هەیە لەهەندێ نوێنەرو وەزیرو لەو بابەتانە، بەهەر ئامرازو رێگایەك بێ کار لە دەزگاکانی راگەیاندن و هەڵبژاردن دەکەن ، بە شێوەیەکی گشتی سیاسەت دەخنە خزمەت خویانەوە. ئەمەو خەڵکی خاوەن زەوی و سەرمایەو دەوڵەمەند، هەموو کاتێ ئەگەر خاوەن دەسەڵاتیش نەبووبێتن ، ئەوە دەسەڵات لە کارتێکردنیان بە دوور نەبووە. هەردەم نزیکی دەسەڵات بوونە و خستویانەتە خزمەتی خۆیانەوە و لە چوارچێوەی بەرژەوندی ئەواندا کاری کردووە ، ئەگەر بروانینە دەوڵەتە دیموکراسییەکانی جیهان ، دەبینین خاوەن یەکێەتییەکان و خاوەن کارەکان

ڕۆڵێکی بە هێز دەبینن لە ئاراستە کردنی ڕەوشی ڕامیاری دەوڵەت و دەسەڵاتداران ئاراستە دەکەن. ئەمەو دەبێت ئەوە لە بیر نەکەین سەرهەڵدان و گەشەکردنی بەرەی سۆشیالیزم و هەبوونی کەش و هەوای دیموکراسی، زۆر پرانسیپ و چەمکی هێنایە کایەوە کە لە بەرژەوەندی چینە مام ناوەندی و توێژە خوارینەکانی کۆمەڵگەن. دروست بوونی سەندیکا کرێکارییەکان و پارتە کرێکارییەکان و ڕێکخراوە سۆشیالیزمەکانیتر هەموویان هۆن بۆ دروست بوونی هێزێك و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی نوێ لە بەردەم سەرمایەداری کلاسیکیدا. هەندێ لەو دەوڵەتانەی کە زیاتر پێشکەوتنی دیموکراتییان بە خۆیانەوە بینیوە، سیستەمی سۆشیالیزمیان تێدا پەیڕەو دەکرێ و ئەو پارتانەی کە لەو وڵاتانە دەسەڵاتدارن سۆشیال دیموکراتەکانن. بەهەرحاڵ ئەم هۆکارانەی کەباسمان کرد، بەجیاجیا، هەر یەکەو کارتێکردنی لە سەر ئەوی تریان هەیە ، لەوەیە بە هەبوونی هەموو ئەو هۆکارانە ، دەسەڵات بێتە کایەوە و گرووپێك یان کەسێك ببێتە خاوەن دەسەڵات، لەوەیە هێزی بەدەنی و سەربازی سەرچاوەی سەرەکی بن بۆ دەسەڵات بە دەست گرتن. بەڵام کە دەسەڵات گیرا بە دەست ، ئەوە هەیبەتێکی زیاتر بە خاوەنەکەی دەدات و دەبێتە خاوەن پارەو پولیش ، کاتێ باشووری عێراق زەوی و زارێکی بە پیتی هەبوو. سۆمەریەکان کە کۆمەڵێکی ئاری بوون لە ژوورەوە هاتن و دەستیان بە سەریدا گرت ، بوونە خاوەن ئەو زەوی و زارە ، واتا لە سەرتاوە بە هێزی سەرۆکی گرووپەکەو سەرنەوایی گرووپەکە بۆی ، کە ئەوەش لە سەرەتاوە لە هێزی بەدەنی و هەیبەتەوە سەرچاوەی گرتووە ، سۆمەریەکانی کردە خاوەن دەسەڵات بە سەر باشووری عێراقدا. بە پیتیی زەوی ئەو ناوچەیە ، دەوڵەتی دەوڵەمەند کرد و کردیە ئیمبراتۆریەتێکی بە هێز. هەمان شت دەوترێت لە سەر ئەکەدیەکان و ئاشوریەکان و زۆربەی ئیمبراتۆریەتەکانی میژووی کۆن. لە هەمان کاتدا ڕەوشی ئابووری و دەوڵەمەندی زۆر جار هەیبەت و سەنتەری کۆمەڵایەتی دەداتە خاوەنەکەی و دەبێتە کەسێکی ناسراوو دەتوانێ بگاتە دەسەڵات ، بە تایبەت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا. کە ڕەوشی ئابووری کارتێکردنێکی زۆر زەق و ئاشکرای هەیە لە باری ڕامیاری دەوڵەتدا. کەسێك پارەو پولی

هەبیَ دەتوانیَ چەندەها ڕێگا و ئامراز بگرێتە بەر بۆ گەیشتن بە دەسەڵات.یان هەر نەبیَ گەیشتنی ئەو کەسانەی کە بەرژەونیەکانی دەپارێزن ، ئەمەی باسمان کرد ئەوە دەگەێنیَ ، کە هێزی بەدەنی هەیبەت و پول وپارەی لیَ دەبێتەوە ، پول پارەش ،هەیبەت و بەکەسایەتی بوونی مرۆڤی لیَ دەبێتەوە. واتا کاتێکردنێکی هەمەلایەنە هەیە لە نێوان ئەو هۆکارانەی کە ڕێگان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات.

## ٢،دان پێدانان[١]

دان پێدانان بە دەوڵەتێك، واتا قبولکردنی دەوڵەتی تازە لەلایەن ئەو دەوڵەتانەی کە لە ئارادان وەکو ئەندامێك لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا ، بەلاّم ڕاو بۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی دان پێدانان ، ئایا دەوڵەت بە دان پێدانان دەبێتە دەوڵەت ؟ یان هەر قەوارەیەك بە هەبوونی ڕایەڵە سەرەکیەکانی دیکە وەکو گەل و هەرێمو دەسەڵات بە دەوڵەت دەژمێردریَ وپێویست بە دان پێدانان ناکا؟.

- هەندیَ لە بۆچوونەکان دەڵێن دان پێدانان پێویستە و ڕیشاڵێکە لە ڕیشاڵەکانی دەوڵەت و بە نەبوونی دەوڵەت بوونی بۆنیە. بەلاّم زۆربەی بۆچوونەکان دەڵێن: دان پێدانان ڕۆڵێکی پەیداکەری نییە، واتا ڕیشاڵێك نییە لە ڕیشاڵەکانی دەوڵەت، بەڵکو دەوڵەت بە هەبوونی ڕیشاڵەکانی خۆی وەك هەرێم ، گەل ، دەسەڵات خۆی دەسەپێنیَ و دەبێت ، دان پێدانان ئەو بوونەی پیَ نابەخشیَ، واتا دان پێدانان ڕۆڵێکی پەیداکەری نییە. بەڵکو ڕۆڵێکی پیشاندەر( کاشف ) دەبینیَ بۆ هەبوونی دەوڵەت ، بەلاّم دان پێدانان توانا بە دەوڵەت دەدات سوود لەو مافانە وەرگریَ کە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی داویە بە ئەندامەکانی و هەروەها دەبێتە ئەندامێکی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و ڕافەی سەربەخۆیی خوی دەکات لە دەرەوە. ئەمەو دان پێدانان لەوەیە ئاشکرا بێت (صریح) یان ناوەرۆکی بێت ( ضمنی ).

---

(١) بڕوانە : یحیی الجمل ـ الاعتراف في القانون الدولي العام.

دان پێدانانی ئاشکرا، ئەوەیە کە دەوڵەتەکان دان بە دەوڵەتی نوێدا دەنێن بە شێوەیەکی ئاشکرا. ئەوەش یان بە تەنها، واتا هەر دەوڵەتێك لە بەیانێکدا ، یان لە لێدوانێکی بەرپرسێکی گەورەی دەوڵەتدا ، یان هەر ئامرازێکی دیکە ، دان بە دەوڵەتی نوێدا دەنات. یان بەشێوەی کۆمەڵ ، واتا کۆمەڵێ دەوڵەت پێکەوە لە ڕێگای مۆرکردن ودەرکرنی پەیمان نامەیەك یان متمانە نامەیەك یان لە کۆنفرانسێکدا ، دان بە دەوڵەتی نوێدا دەنێن، وەکو دان پێدانان بە بەلجیکا لە کۆنفرانسی لەندەن لە ساڵی(١٨٣١ز)، یۆنان لە کۆنفرانسی کۆستەنتینیە لە ساڵی (١٨٧٨ز). هەروەها دان پێدانان لەوەیە ناوەڕۆکی بێ. هەرچەندە دەوڵەتان لەوەیە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا دان بە دەوڵەتی نوێدا نەنەن ، بەڵام بە پراکتیك و کردار و هەڵس و کەوت ، دەوڵەتی نوێ ڕادەکێشنە ناو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیەوەو توانای ئەوەی پێ دەدەن ڕاڤەی سەروەری خۆی بکات لە نێوان کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا و قبوڵ کردن و دانان و ئاڵوگۆڕکردنی نێردراوە دبلۆماسییەکان (سفارات) لە لایەن دەوڵەتانەوە لە گەڵ دەوڵەتی نوێدا. هەروەها قبولکردنی دەوڵەتی نوێ لە ئەو دامەزراو و ڕێکخراوانەی کە تایبەتن بە دەوڵەتەکانەوەو تەنها دەوڵەتەکان بۆ ئەندامێتی لێی قبوڵ دەکرێن ، ئەمانە هەمووی خۆی لە خۆیدا دان پێدانانە بە دەوڵەتی نوێ. ئەمەو دانپێدانان بە دەوڵەتی نوێ دەگەڕێتەوە بو ئارەزووی ئەو دەوڵەتانەی کە لە ئارادان ، بۆیان هەیە دان بە دەوڵەتی نوێدا بنەن و دەتوانن دانیشی پێدا نەنەن. لە ڕاستیدا دان پێدانان دەگرێتەوە بۆ بارودۆخ و ڕەوشی نێودەوڵەتی و هەرێمایەتی و هەل و مەرج و شێوەو چۆنێتی دروست بوونی دەوڵەتی نوێ وکارتێکردنی دروستبوونی دەوڵەتی نوێ لە بەرژەوەندییە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەکان، ئەگەر دروست بوونی دەوڵەتێکی نوێ مەترسی دروست بکات لە سەر هەرێمەکانی دەورو بەر و کۆمەڵگەینێودەوڵەتیش بەرژەوەندی لە گەڵ ئەو دەوڵەتانەی دەورو بەردا هەبێ ، ئەوە دان پێدانان بە دەوڵەتێکی نوێ شتێکی ئاسان نابێ لە لایەن هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە. بەڵام ئەگەر دروست بوونی دەوڵەتی نوێ ببێتە هۆکارێك بۆ قازانجی ئەو دەوڵەتانەی کە لە ئارادان و خزمەتی بەرژەوەندییەکانیان بکات، مەرج نییە

هەموو دەوڵەتەکان بەرژەوندیان لە دروست بوونی دەوڵەتی نوێدا هەبێ. بەڵام بە گوێرەی هاوکێشی نێودەوڵەتی خزمەتی زۆربەی دەوڵەتەکان بکات ، ئەوە دان پێدانان لە لایەن دەوڵەتەکانەوە ئاسانتر دەبێت و ئەو دەوڵەتانە ڕاڕا نابن لە قبوڵ کردن و دان پێدانان بە دەوڵەتی نوێدا. هەر لەم ڕوانگەیەوە ئنگلتەرا جاڕی جەنگی دا دژ بە فەرەنسا لە بەر ئەوەی فەرەنسا جاڕی دانپێدانانی خۆی بە ئەمریکا ڕاگەیاند ، لە کاتێکدا هێشتا جەنگی نێوان ئنگلتەرا و ئەمریکا یەکلایی نەبووبووەوە. ئەمەو دان بە دەوڵەتدا دەنرێت ، بە چاو پۆشین لە ئەو حکومەتەی کە نوێنەرایەتی دەوڵەت دەکات. بۆ نموونە (چین) کە یەکێکە لە ئەندامە هەمیشەییەکانی ئەنجومەنی ئاسایش ، تا ماوەیەك حکومەتەکەی ( کای شیك ) نوێنەرایەتی چینی دەکرد ، ئەوەش بە پاڵپشتی ویارمەتی دانی وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەرچەندە (کای شیك) لە زۆربەی ناوچەکانی وولات دوور خرابووەوەو لەدوورگەی ( فەرمۆزا ) و دوورگە بچوکەکانی دەورو بەری گەمارۆ درابوو.پاش ئەو ڕوون کردنەوە گشتییە دەربارەی دان پێدانان بە پێویستی دەزانین بە شێوەیەکی کورت باسی هەریەکێ لەو تیۆرانە بکەین کە دەربارەی دان پێدانان وتراوون:ـ

### ١ـ تیۆری پەیداکەر(النظرية المنشئة).

بە پێی تیۆری پەیداکەر هەبوونی هەرسێ ڕیشاڵی هەرێم ، گەل ، دەسەلات (سەروەری) بەس نییە بۆ پێکهێنانی دەوڵەت. هەر یەکەیەکی نێودەوڵەتی (وحدة دولية) بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن کەسایەتییەکی یاسایی نێودەوڵەتی و بچێتە ناو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە پێویست دەکات دانی پێدا بنرێ لە لایەن دەوڵەتەکانی دیکەوە ، واتا دەوڵەت بە هەبوونی ئەم ڕیشاڵانە دەبێتە دەوڵەت: ١. گەل ٢. هەرێم ٣. دەسەلات ٤. دان پێدانان .

بە هەر حاڵ تیۆری پەیداکەر لە دان پێداناندا ، سێ تایبەتمەندی بە خۆوە دەگرێ.

ا. بە پێی ئەم تیۆرە هەر یەکەیەکی نێودەوڵەتی نابێتە دەوڵەت ونابێتە کەسایەتیەکی نێودەوڵەتی و ناچێتە ناو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیەوە تەنها بە دان

پێدانان نەبێت لە لایەن دەوڵەتانی دیکەوە ، ئەمەش پێی دەڵێن کارتێکردنی پەیداکەر ( الاثر المنشیء).

ب ـ دان پێدانان وەسفی کەسایەتی نێودەوڵەتی بەیەکەی تازە دەبەخشێ بەرانبەر ئەو دەوڵەتانەی دانیان پێدا ناوە و ئەو وەسفەی نابێ بەرانبەر ئەوانەی دانیان پێدا نەناوە، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێ کە دان پێدانان کارتێکردنێکی ڕادەیی هەیە ( أثر نسبی ).

جـ ـ دان پێدانان کارێکە بەتەواوی دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوی ئەو دەوڵەتانەی کە لە ئارادان ، دەتوانن دان بەدەوڵەتێکی نوێدا بنێن و دەتوانن دانیشی پێدا نەنێن. فەیلەسوفی ئەڵمانی هیگڵ ( ١٧٧٠ ـ ١٨٣١ )ز بە باوکی گیانیی (ڕوحی ) تیۆری پەیداکەر دادەنرێ. ئەو یاسازانایانەی باسی تیۆری پەیداکەریان کردووە و پاڵپشتیان لێ کردووە زۆرن وەکو لۆتەر باخت ، یلنك (١٨٥١ ـ ١٩١١)ز ، ویتون ( Wheaton) (١٧٨٥ ـ ١٨٤٨)ز ، کالفۆ (١٨٢٤ـ ١٩٠٦)ز ، فیور ، بۆنفیك.

بونفیك دەڵێ: ڕیشاڵەکانی دەوڵەت چوارن:ـ

ا) کۆمەڵێك مرۆڤ. ب) سەربەخۆیێ. جـ) حوکم کراو بە حوکمێکی خۆیی.

د) سەقامگیر لە سەر هەرێمێك.

بەڵام لە بەر ئەوەی لونرماند(Lenormand) لە هەموویان زیاتر بڕوای بە تیۆری پەیداکەر هەبووە و پاڵپشتی لێ کردووە ، لێرەدا بۆچوونەکانی دەخەینە ڕوو:

لۆنرماند[1] : بەرپەرچی ئەو بۆچوونانە دەداتەوە کە دەڵێن ، دەوڵەت هەبوونی واقعی هەیە پێش دان پێدانان ، بەڵام هەبوونی یاسایی پاش دانپێدانان دێتەکایەوەودەڵێ:

دانپیادانان کردارێکی یاسایی نییە هەبوونی ماددی دەوڵەت بگۆڕێتەوە بە هەبوونی یاسایی، بەڵکو دانپێدانان ڕیشاڵێکە لە ڕیشاڵەکانی هەبوونی ماددی دەوڵەت و کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی دەوڵەت و دەڵێ:

(١) بڕوانە: حامد سوڵتان ـ ل١٠٧-١٠٨.

لە دەرەوەی چواچێوەی یاسایی نەماف و نەکەسایەتی هەیە، واتا هەر یەکەیەکی نێودەوڵەتی نەمافی هەیە و نەکەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی ، تەنها بە دان پێدانان نەبێ، کە دەیخاتە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیەوەو دەیکاتە خاوەن ماف و کەسایەتی نێودەوڵەتی. لۆنەرماند جیاوازی دەکات لە نێوان تاك لە سێبەری یاسای نێوخۆییدا و دەوڵەت لە سێبەری یاسای نێودەوڵەتیداو دەڵێ:

تاك بە کەسایەتییەکی یاسایی لە قەڵەم دەدرێ بە لە دایکبوونی ، بەڵام دەوڵەت نابێتە ئەندامێکی کۆمەڵی نێودەوڵەتی تەنها بە دان پێدانان نەبێ . لە سەر ئەو بناغەیەی کە دەڵێت لە دەرەوەی چوارچێوەی یاسایی ماف و کەسایەتی نییە. لۆنرماند مافی بنەڕەتی بۆ دەوڵەت (الحقوق الاساسية للدول) ڕەت دەکاتەوەو دەڵێ :

ئەم تیۆرە پشت بە یاسای سروشتی دەبەستێ ، لە کاتێدا لۆنرماند یاسای سروشتی ڕەت دەکاتەوەو دەڵێ:

ئەنجامێك کە بە هۆیەوە هەبوونی یاسای نێودەوڵەتی هەبێ دان پێدانانە، نەوەك مافێکی بنەڕەتی دەوڵەت بێت و ڕیشاڵێك بێت لە ڕیشاڵەکانی کەسایەتی نێو دەوڵەتی کە مافی نێودەوڵەتی لێ دەبێتەوە،کارێکی ئاڵ و گوڕکێی دوو لایەنەیەو لەسەر داواکاری دەوڵەتی نوێ دەبێ، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دان پێدانانە، لەلایەن دەوڵەتی نوێوە بە دەوڵەتی کۆنە .

بە خوێندنەوەی هەموو بۆچوونەکان دەردەکەوێت، هەندێ لەو بۆچوونانە جیاوازییان کردووە لە نێوان هەبوونی دەوڵەت و ئەندامێتی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی؛ دەڵێن دان پێدانان مەرج نییە بۆهەبوونی دەوڵەت، بەڵام مەرجە بۆ ئەندامێتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیو سوود وەرگرتن لەو ماف و ئەرکانەی کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە ئەندامەکانی دەیدات.ئەوانەی ئەم بۆچوونانەیان هەیە ئەمانەن؛ نوبنهایمەر، لیست،شترۆب و زۆربەی یاسازانەکانی سەدەی نۆزدەیەم.

بەڵام لونرماند دژ بەم بۆچوونانە دەوەستێت و دان پێدانان بە مەرجێکی سەرەکی دادەنێ بۆ هەبوونی قەوارەی دەوڵەت .

### ٢ـ تیۆری پیشاندەر ، بڕیاردەر (النظرية المقررة)

ئەو یاسازانانەی کە بڕوایان بە ئەم تیۆرە هەیە هەموویان لە سەر ناوەڕۆکی بناغەی تیۆرەکە کۆ دەبنەوە. ناوەڕۆکی بناغەی تیۆرەکە دەڵێ: هەر یەکەیەکی نێودەوڵەتی ئەو ڕیشاڵانەی تێدا بێ، کە پێویستە بۆ دروست بوونی دەوڵەت کە یاسازانەکانی یاسای نێودەوڵەتی کۆکن لە سەری و بە هەبوونی دەوڵەت دروست دەبێ کەئەمانەن: هەرێم ، دانیشتوانی سەقامگیر بوو لە سەر ئەو هەرێمە ، حکومەت ، سەربەخۆیی لە کاروباری ناوخۆیی و دەرەوەدا، بە هەبوونی ئەم ڕیشاڵانە لەهەر یەکەیەکی نێودەوڵەتیدا ، ئەوە دەوڵەت و کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی لەو یەکەیەدا بەرجەستە دەبێت ئەگەر دانیشی پێدا نەنرابێت ، لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی تیۆری بڕیاردەر (پیشاندەر) جیاوازی نازانێت لە نێوان دەوڵەت و کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتیدا.

تشن (chen) دەڵێ: هەر دەوڵەتێك دروست بێت ئەوا بە شێوەیەکی سروشتی دەبێتە ئەندامێکی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ، دانپێدانان پێوەرێك نییە بۆ کەسایەتی نێودەوڵەتی و تشن جیاوازی نێوان دەوڵەت و کەسایەتی نێودەوڵەتی ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت ، دەوڵەت ئەگەر لە واقعدا هەبوو ئەوا لە یاساشدا دەبێت ،هەروەها دەڵێ: دەوڵەت لەوەیە دانیپێدانەنرابێ و پەیوەندی باشی لە گەڵ دەوڵەتانی دیکەدا نەبێت ، لەویە بۆ بەکارهێنانی مافەکانی تووشی گرانی و قورسی ببێتەوە ، بەڵام ئەوە ناگەیێنێ کە خاوەن ماف نەبێت و بەکاری نەهێنێت ، لە بەر ئەوەی گرانی سوود وەرگرتن لە ماف ، نەبوونی ناگەیەنێ. ئەگەر دانپێدانان کەسایەتی نێودەوڵەتی دروست ناکات و ئەو کەسایەتییە پێش دانپێدانان هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا دانپێدانان سوود و گرنگی خۆی هەیە لە بواری ڕامیاریو ئابووریو دەروونییدا. زۆرینەی ئەو یاسازانانەی کە بڕوایان بەم تیۆرە هەیە دەڵێن: دانپێدانان بە یەکەی نوێ دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوی دەوڵەتەکان ، بۆیان هەیە دان بە دەوڵەتی نوێدا بنێن ، بۆیانیش هەیە دانی پێدا نەنێن ،ئەو دانپێدانانە هیچ کار ناکاتە سەر کەسایەتی نێودەوڵەتی یەکەی نوێ. تەنها ڕێگا خۆشکەرە بو دروستکردنی پەیوەندییەکی ئاسایی و دۆستانە لە گەڵ دەوڵەتی

دانپێنراودا.پاش باسکردنی دانپێدانان و ئەو تیۆرانەی دەربارەی دانپێدانان وتراوون ، بە پێویستی دەزانم باسی هەندێ لە قۆناغە گرنگەکانی ڕێکخستنی نێودەوڵەتی بکەم ، بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە دانپێدانان.پاش ساڵی (١٦٤٨ز) ، بیرۆکەی دەوڵەت بەرەو سەقامگیربوون هەنگاوی نا. بزافە نەتەوەییەکان ئەوروپایان گرتەوەو دەوڵەتۆکە ئەڵمانیاییەکان و ئیتالیاییەکان یەکیان گرتەوە لە یەك دەوڵەتدا ، دەوڵەتی ئەڵمانیا ، دەوڵەتی ئیتالیا. ئەم هەنگاوە لە کۆنگرەی ڤیەننا ساڵی (١٨١٥ز) ڕەنگی دایەوە و بوە هۆی دروست بوونی کۆمەڵگەی ئەوروپی (المجتمع الاوربی) لەنێوان وولاتانی هاوپەیمانی پیرۆزدا (دول التحالف المقدس). دەوڵەتانی کونگرەی ڤیەننا بوونە خاوەن دەرگای کۆمەڵگەی ئەوروپی ، دەیان کردەوە بۆ ئەوانەی ئارەزویان لێ بوو ، دایان دەخست بۆ ئەوانەی ئارەزویان لێ نەبوو.

لەوانە قبوڵ کردنی بەلجیکا و یۆنان (١٨٣٠ز ) ، کە یەکەمیان لە هۆڵەندا جیا بووبوەوە ، دووەمیان لە تورکیا. بۆ چوونە ناو هەیارەی ئەو کۆمەڵەوە ، شتێکی ئاسایی بوو لەم ماوەیەدا تیۆری بنیاتنەر گەشە بکا ، لە بەر ئەوەی وەك ئامرازێك بوو بۆ ڕێگرتن لەو دەوڵەتانەی کە لە گەشەکردن و ئازاد بووندا بوون. بۆ ئەوەی نەبنە ئەندامێکی نێودەوڵەتی تەنها بە ئیزنی دامەزرێنەرەکان نەبێت ( السادة المؤسسین ). بەڵێ کۆمەڵگەی ئەوروپی لەو قۆناغەدا کۆمەڵگەیەکی کراوە نە بوو، بەڵکو کومەڵگەیەکی سنووردار بوو ، کە لە چەند دەوڵەتێکی مەسیحی ئەوروپی پێك هاتبوو. بەڵام بە گەشەکردنی کۆمەڵگە جیا جیاکانی ئەم سەر زەمینە و بە گەشەکردن و بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و پەیوەندی نێوان گەلان و پێداویستیەکانی ژیان ، ئەو کۆمەڵگەیە بەرە بەرە کرایەوە. لایەنگرانی تێۆری بنیاتنەر کە لە سەرەتادا زۆربوون ، لە سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم کەم بوونەوە بوونە کەمایەتی وەکو بەراورد لە گەڵ ئەوانەی لایەنگری تیۆری پێشاندەر ( بڕیاردەر ) بوون.

هەندێ بۆچوون هەن دەڵێن: کۆنگرەکانی لاهای لە ساڵی (١٨٩٩ ــ ١٩٠٧ز) ڕێگا خۆشکەر بوون بۆ ئەو ڕێکخستنە نێودەوڵەتیەی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هەیە و ئەم کۆنگرانە هەنگاوی باش بوون بۆ پێش خستنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، کە لە سەر

بناغـەی بەرپرسـیارێتی نێودەوڵـەتی بنیـات نـراوەو لـە هـەمان کـاتدا پێـوەرە مرۆڤایەتییەکان ( الاعتبارات الانسانیة ) لەبـەر چاو گیراون هـەر وەکو کلۆد دەڵێ : کۆنگرەکانی لاهای ڕێکخستنی نێودەوڵەتییان بۆ بەگەردوون بوون ئاراستەکرد ( نحو العالمیة ). لـە کۆنگرەی یەکەمدا ساڵی (١٨٩٩ز)، (٢٦) دەوڵەت کۆبوونـەوەو زۆربـەیان ئـەوروپی بـوون ، بـەڵام لـەکۆنگرەی دووەمـدا (٤٤) دەوڵـەت کۆبوونـەوە ، کـەزۆر لەدەوڵەتەکانی ئەمریکای لاتین و ئاسیایی تیایدا بەشداریان کرد. لەم چوارچێوەیەدا کلۆد دەڵێ: کۆمەڵگەیەکی گشتگیری جیهانی (جمعیـة عمومیـة للعـالم) ساڵی (١٩٠٧ز) هاتە کایەوە، کۆنگرەی لاهایی دووەم جگە لەوەی بەشداری فراوانـی تیـادا کـرا لەلایـەن دەوڵـەتانی جیهانـەوە ، لـە هـەمان کـاتدا دەوڵەتـە لاوازەکـان و بـەهێزەکانی پێکـەوە کۆکردەوە. پاش جەنگی جیهانی یەکەم ، وەکو ئەنجامێکی ئـەو شـەڕە و هەست کردنـی کۆمەڵگـەی نێودەوڵـەتی بـە هاتنـە کایـەوەی ڕێکخستنێکی نێودەوڵـەتی، کـە جیـهان لـە کارەسـاتی لـەو جـۆرە دوور بخاتـەوە ڕێکخـراوی کۆمەڵـەی نەتـەوەکان (عصبـة الامـم ) هاتە کایەوە.[1]

ئەوەی پەیوەندی بە دانپێدانانەوە هەبێت:

- ئەو ڕیاسایانەی کـە حوکمـی دانپێدانانیـان دەکـرد زیـاتر لـە تیـۆری پەیداکـەرەوە نزیك بوون ، لە بەر ئەوەی دانپێدانان کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی هەبوو ، بۆ بەشداری کردنی دەوڵـەتی دانپێدانـراو لـە ژیـانی کۆمەڵگـەی نێودەوڵـەتیدا و سـوود وەرگرتـن لـە مافـە دابـین کراوەکـان بـە پێـی ڕیاسـا نێودەوڵەتییـەکان (التمتـع بحمایـة القواعد الدولیة).

- دیاردەی دانپێدانان بە کۆمەڵ (الاعتراف الجماعي) لە لایەن دەوڵەتانەوە بە یەکەی نێودەوڵەتی نوێ، بۆ نموونە یۆنان ، بەلجیکا ، تورکیا و ئەو وولاّتانەی کە لە تورکیا جیـا بوونـەوە لـە ناوچـەی بـەلقان، ئـەم دەوڵـەتانـە هـەموو لـە لایـەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە ، بە کۆمەڵ دانیان پێدا نرا. ئەمەو بە ئـەندام بـوون

---

(١) بڕوانە: د. یحیی الجمل ـ الاعتراف في القانون الدولي العام ص٤١١-٤١٢.

لەکۆمەڵەی نەتەوەکاندا (عصبة الامم) پێوەرێك بوو بۆ چوونە ناو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە ، هەر دەوڵەتێك بە ئەندام بوایە ، مەرج نەبوو ، نە ئەوروپی بێ ، نەمەسیحی ، یا خاوەن شارستانییەکی ئەوتۆ. ئەمە خۆی لەخۆی دا بەڵگەی ئەوەیە کە پێوەری تازە هاتە کایەوە و پێوەرە کۆنەکانی بەلاوە نا بۆ بەئەندام بوونی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. مەرجەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ بە ئەندام بوون ، دەبوایە یەکەی نێودەوڵەتی کە داوای ئەندامێتی دەکرد خۆی حوکمی خۆی بکردبایە وگەرەنتی بدابایە کە پێبەندیە نێودەوڵەتییەکانی دەبێت( الالتزامات الدولية) و ئەو ڕێکخستنەی قەبوڵ بکردبایە کە کۆمەڵە داینابوو و پەیوەندی بە هێزی چەکداری و وشکایی و دەریایی و ئاسمانییەوە هەبوو.

لە کۆتاییدا دەمەوێ ئاماژە بە بۆچوونی خۆم بکەم دەربارەی دانپێدانان ، من پێم وایە هەبوونی دەوڵەت لە سێ ڕیشاڵی سەرەکی پێك دێت ، گەل ،هەرێم ، دەسەلات، بەلام لە هەمان کاتدا ئەم بۆچوونەش ڕەها نییە و بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆڕێ و لەکۆمەڵگەیە ، یان قەوارەیەکی ڕامیارییەوە بۆ کۆمەڵگەیەك یان قەوارەیەکی ڕامیاری تر دەگۆڕێ. ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ، جگە لەو ڕایەڵە سەرەکییانە کە ئاماژەمان پێ کرد و ڕایەڵی سەرەکین بۆ سەر دروست بوونی دەوڵەت ، بەرژەوەندی نێودەوڵەتی و هاوکێشی نێودەوڵەتیش کاریگەری خۆیان هەیە لە سەر دروست بوونی دەوڵەتی نوێ. هەر قەوارەیەکی ڕامیاریش ئەگەر جاڕی بە دەوڵەت بوونی خۆی بدات ، لە کاتێکدا دەبێتە دەوڵەت و لە سەر پێی خۆی دەوەستێ و سەقامگرتوو دەبێت ئەگەر کار نەکاتە سەر بەرژەوەندی نێودەوڵەتی وهاوکێشی نێودەوڵەتی تێك نەدات. ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی دیکەوە ، دەبێ دەسەلات لەو قەوارە ڕامیارییەدا توانای پاراستنی قەوارەی دەوڵەتی جاڕدراوی هەبێت، چ بە ئامرازیسەربازی بێت لە هەندێ حاڵەت دا چ بە ئامرازی دبلۆماسی بێت لە هەندێ حاڵەتی تردا.

## باسی سێیەم
## شێوەکانی هاتنە کایەوەی دەوڵەت

دەوڵەت بە چەند شێوەیەك دێتە کایەوە :

**یەکەم :** سەقامگیربوونی گروپێك لە دانیشتوان لە سەر پارچە زەوییەکی چۆڵ لە دانیشتوو ، یان دانیشتووانی خەڵکێکی سەرەتایی و کۆچبەر بن ، بە سەقامگیربوونیان کارو باری خۆیان ڕێك دەخەن ، دەزگاکانیان پێکەوە دەنێن ، کاری بەڕێوەبردن گەشە پێ دەدەن ، دەسەڵات دروست دەبێت و خۆی دەسەپێنێ . ئیتر گرنگ نییە چۆنێتی و جۆری ئەو دەسەڵاتە.بە هەبوون و پێکەوە نانی ڕیشاڵەکانی دەوڵەت ، ئەوە ئەو گرووپە سەقامگیربووەو خۆی دەسەپێنێ وەکو یەکەیەکی ڕامیاری بە خۆوە هەڵساو (وحدة سياسية قائمة بذاتها).

سروشتییە ئەگەر بڵێین کاتی دروست بوونی دەوڵەت بەم شێوەیە بە شێوەیەکی وورد دیاری ناکرێ ، لە بەر ئەوەی دەوڵەت تا ڕیشاڵەکانی کامڵ بێت بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات، شەڕ ، شۆڕش ، داگیرکاری ، دابەش بوون، یەکگرتن وپێوەلکان .

زۆربەی دەوڵەتانی سەر ئەم زەمینە لە سەرەتادا بەم جۆرە دروست بوون چ لە ئاسیا ، ئەفریقا ، ئەوروپا ...

نموونە بۆ دروست بوونی دەوڵەت بەم شێوەیە لە سەدەی ڕابوردودا و لەساڵی (١٨٢١ز) دەوڵەتی لیبیریایە ، لیبیریا کە دەکەوێتە کەناراوەکانی ئەفریقیای ڕۆژئاوایی. لە ئەو کۆیلە ئازاد کراوانە پێك هاتووە کە لە ژێر چاودێری کۆمپانیایەکی ئەمریکاییدا بۆ ڕزگارکردنی کۆیلەکان گوێزراونەتەوە بۆ لیبیریا و لەوێ دەوڵەتێکیان بۆ خۆیان پێکەوە ناوە. بەڵام دروست بوونی دەوڵەت بەم شێوەیە لەم سەردەمەدا نەماوە.

**دووەم :** دەوڵەت دروست دەبێ بە پێوەلکانی چەند دەوڵەتۆکەیەکی بچووك بۆ پێك هێنانی دەوڵەتێکی نوێ، ئیتر ئەگەر ئەو دەوڵەتە نوێیە دەوڵەتێکی سادە بێت ،

یەك پارچە (موحد ) وەكو ئیتالیا ، فەڕەنسا ، كە لەژێر كاریگەری بزافێكی نەتەوەییدا دروست بوون. یان ئەو دەوڵەتە بچووكانە كۆدەبنەوە بۆ پێك هێنانی دەوڵەتێكی فیدراڵی ، بۆ نموونە یەكگرتنی وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ساڵی( ١٨٧٨ز).

**سێیەم:** لەوەیە لە دابڕان و هەڵوەشانەوەی دەوڵەتێك، دوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێكی تازە بێنە كایەوە:

١. جیابوونەوەی هەرێمێك لە دەوڵەتێك ، بە شێوازی خەباتی شۆڕش گێڕانەو ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی و پێكەوەنانی دەوڵەتێكی سەربەخۆ، بۆ نموونە: جیابوونەوەی ئەریتیریا لە ئەسیوپیا و پێك هێنانی دەوڵەتی ئەریتیریا ، یۆنان لە توركیا، جیابوونەوەی وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لەئینگلتەرا ساڵی(١٧٧٦ز) ، بەرازیل لە پۆرتوگال (١٨٢٢ز) ، مەكسیك و پیرۆ و كوبا لە ئیسپانیا ، یۆنان لە توركیا ، تایوان لە چین.

٢. هەڵوەشانەوەی دەوڵەتێك بە هۆی جەنگ،یان بزافێكی جودا خوازی و دروست بوونی چەند دەوڵەتێك لە ئەنجامی ئەو هەڵوەشانەوەیە وەك هەڵوەشانەوەی ئیمبراتۆریەتی نەمسا و مەجەڕ پاش جەنگی جیهانی یەكەم و دروست بوونی دەوڵەتی نەمسا،مەجەڕ، تشیكۆسلۆفاكیا.

٣.جیابوونەوەی ئەو دەوڵەتانەی كە بە یەكگرتنێكی كرداری یان بەڵێنكاری پێكەوە لكاون. حاڵەتی یەكەم وەكو جیابونەوەی سوید و نەرویج . حاڵەتی دووەم ، هەڵوەشانەوەی یەكێتی سۆفێت و دروست بوونی چەند دەوڵەتێكی نوێ لە ئەنجامی ئەو هەڵوەشاندنەوەیە.

## باسی چوارەم

## بنەوانە (بنەچە) کردنی دروست بوونی دەوڵەت و دەسەڵاتی ڕامیاری

### تاصیل نشاة الدولة و السلطة السیاسیة Origine de Ietat

هەموو ئەو تیۆرانەی باس کراوون دەربارەی چۆنێتی دروست بوونی دەوڵەت[1] باس لە دەسەڵاتی ڕامیاری دەکەن، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی ڕامیاری(سیاسی) ڕایەڵێکی زۆر گرنگ و دیالکتیکییە(قابلە بە گۆڕان)، هەر ڕایەڵی دەسەڵات و پێشکەوتنی و فراوان بوونی قەوارەکەی لێرە ولەوێ بووە بە هۆی دروست بوونی دەوڵەت. لە کاتێکدا ڕایەڵەکانی دیکەی دەسەڵات (هەرێم، گەل) ئەوەندە باسی ناکرێت و جیاوازی بیرو بۆچوونەکانی لەسەر نییە.دەوڵەت لەبناغەوە شتێکی پێك هاتەیە(شئ مرکب)، کە لە چەند شتێك پێك هاتووە، هەر تیۆرێك لەو تیۆرانەی باسی بناغەی دروست بوونی دەوڵەت دەکەن، باسی بەشێ لەو پێك هاتەیە دەکەن، ئەو بەشە دەکەنە بەردی بناغە بۆ شیکردنەوەی چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەت.

ئەمەو هەندێ لەو تیۆرانە ئیفتیرازییەو هەندێکی ئایینی و هەندێکی دیکەشی دیفاکتۆ شێوەو زانستییە. بۆیە بەپێویستی دەزانم هەندێ لەو تیۆرانە بخەمە ڕوو، سەرەتا لەتیۆرە ئایینی و ئیفتیرازییەکانەوە دەست پێ دەکەم و بە باس کردنی تیۆرە زانستییەکان کۆتایی پێ دێنم.

---

(١) بڕوانە: د.محمد کامل لیله ـ النظم السیاية ـص٢٠١-٢١٩.

د. طعیمة الجرف ـ نظریة الدولة و الاسس العامة للتنظیم السیاسي ص ٢٩ـ٥٩.

## بەستی یەکەم :

## تیۆرە ئایینییەکان :

**Doctrines Theocratiques**

ئەم تیۆرە لە ڕاستیدا باس لە چەند قۆناغێکی جیا جیا دەکات کە دەسەڵاتی پێدا ڕۆیشتووە، کە چۆن لە سەرەتادا کەسی دەسەڵاتدار خودی خۆی بە خوداوەند زانیوە، خەڵکەکەی دەوروبەریشی بە خوداوەندیان زانیوە ، نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە لە میسری کۆن بە فرعەونیان ووتووە(رع) بە واتای خودا. ئەمە لە کاتی دەسەڵاتی فرعەونیەکان لە خێزانەکانی چوارەم و پێنجەم. ئەو کاتە باوەڕ وابوو، کەسی دەسەڵاتدار لە قوڕێ دروست کراوە جیاوازە لەو قوڕەی مرۆڤەکانی دیکەی لێ دروست کراوون.

هەر لەم قۆناغەدا هەندێ دەسەڵاتداران خۆیان بە کوڕی خودا دەزانی. نموونەش بۆ ئەمە خێزانەکانی شەشەم و حەوتەم و هەشتەم لە کاتی دەسەڵاتی فیرعەونیەکان لە میسر خۆیان بە کوڕی خودا دەزانی. ئەم قۆناغە جگە لەمیسر، هند، چین، فارس ی پێدا ڕۆیشتووە.شێوەی دەسەڵات لەم قۆناغەدا شێوەیەك لە دەسەڵاتدارێتی ڕەها بووە، هیچ هاوکێشییەك نەبووە لە نێوان دەسەڵاتدار و دەسەڵات بەسەردا. دەسەڵاتدارەکان ملکەچ دەبوون بە تەواوی بۆ ڕێنمایی و بڕیارەکانی کەسی دەسەڵاتدار. خۆ بە خودا یان کوڕی خودا زانینی کەسی دەسەڵاتدار، شێوازێکی پیرۆزی بە دەسەڵات دەبەخشی، خەڵك لە ترسی خودا و سزای ئەم دونیاو ئەو دونیا گیان و ماڵ و حاڵی لە خزمەت دەسەڵاتدابوو بێ دیالۆك و گفتوگۆ، خەڵك نە عەقڵی ئەوەی هەبوو ئەو کاتە و نەدەیتوانی دەسەڵات بە خۆدا یان بە کوڕی خودا نەزانێت و بەرهەڵستی بکات، تاکەکانی کۆمەڵگە لە ژێر کاریگران وچەوساندنەوەیەکی ڕادە بەدەردا بوون، ڕۆژیان بە دروستکردنی هەرمات ( اهرامات )و قەڵا و شورە و کارێز و بیر هەڵکەندن و زەوی کێڵان و کاری جۆراو جۆری تر دەبردە سەر ، جگە لە بەشداری کردنیان لە شەڕ و

جەنگەکانی کەسی دەسلاتدار.ئەو بۆچوونانەی دەربارەی ئەم قۆناغە باس کراوون پێیان دەڵێن تیۆری مافی خوداوەندێتی ڕاستەوخۆ (نظرية الحق االألهى المباشر).

ـ بە هاتنە کایەوەو دەست پێ کردنی ئایینی کریستینی ( مسیحی ) قۆناغێکی نوێ هاتە کایەوە ، ئەم قۆناغەش خۆی لە خۆیدا بریتی بوو لە هەوڵ و کۆششێکی بێ وچان لە لایەن پەیڕەوکەران وموریدانی ئایینی نوێوە ، هەموو شتێکیان قبوڵ کرد لە پێناو ئایینە نوێیەکەیاندا ، تووشی کوشتن و لێدان وتالان بوون و تووشی هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك هاتن لە ململانێیەکی نەفساوەدا بەرامبەر ڕۆمانییەکان. بەڵام وەکو ئەنجام ئایینی نوێ توانییەی لە سەر پێی خۆی بوەستێت و وەکو دیفاکتۆ خۆی بسەپێنێ ، لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی ئەو کاتەی ڕۆمانییەکان ناچار بکات دەستکاری پیاوانی ئایینی کریستینی نەکەن لە شیکردنەوەو بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان ، لە بەرامبەر ئەوەدا پیاوانی ئایینی کریستینی و هەڵگری پەیڕەو وپرۆگرامی ئەو ئایینە دەستێوەردانی کاروباری دەوڵەت نەکەن و تەنگ و چەڵەمەی بۆ دروست نەکەن ، بە پێچەوانەوە هاوکاری بکەن ، بناغەی ئەو ڕێککەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ وتەیەك ، هەندێ کەس دەڵێن (عیسا) وتوویەتی و هەندێکی تر دەڵێن پۆڵس وتویەتی : (( ئەوەی بۆ قەیسەرە با بۆ قەیسەر بێ ، ئەوەش بۆ خودایە با بۆ خودا بێ )).

لەم قۆناغەدا کە پێنج سەدەی خایاند دەسەڵاتداران نەبە خوداو نە بە کوڕی خودا دەزانران و لەو ڕووەوە مرۆڤێکی ئاسایی بوون وەکو هەموو مرۆڤێکی دیکە. بەڵام بە پێی قۆناغ و هەڵسەنگاندنی نوێی دەسەڵاتی دەسەڵاتداران مافێکی پیرۆز بوو خودا پێیانی بەخشیبوو و هەر خۆی ئەوانی هەڵبژاردبوو بۆ ڕێکخستنی کارو باری کۆمەڵگەو بەڕێوەبردنی. بەو پێیە خودا حەزناکات مەخلوقاتەکانی لە سەرگەردانی و بشێویدا بژین ، بۆیە دەسەڵاتی بەو دەسەڵاتدارانە دابوو بۆ ئەوەی ژیانی خەڵکی ڕێك بخەن و لە پشێوی دووری بخەنەوە ، بەو پێیە خەڵکی ملکەچی دەسەڵاتی کوێرانە دەبوون و هیچ گفتوگۆو دیالۆکێك لە سەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەسەڵات نەدەکرا. تاکەکانی کۆمەڵگە هەموو جۆرە ئەستەمێکی دەسەڵاتداریان قبوڵ دەکرد و بەرهەڵستکاریان نەدەکرد ، بە پێچەوانەوە ئەگەر بەرهەڵستکاریان بکردایە ، ئەوە بەرهەڵستکاری

خودایان دەکرد و سزای ئەم دونیایان دەنۆشی سەرەڕای سزای ئەو دونیاش ، دەبوایە هەموو شتەکانیان بدایەتە دەستی خودا ، خودا خۆی لەو دونیا لێپرسینەوەی دەبێ بەرانبەر دەسەڵاتداران و سزای سەرپێچییەکانیان دەدات. بەو پێیە کەسی دەسەڵاتدار لەم قۆناغەدا هیچ لێپرسینەوەیەکی بەرامبەر نەبوو لە لایەن خەڵکەوە ، خەڵك بۆی نەبوو دیالۆك لە سەر شێوەو ڕەفتاری دەسەڵات بکات ، بەڵکو تاکەکانی کۆمەڵگە ملکەچی تەواوی دەسەڵات دەبوون و جەوری دەسەڵاتیان دەدا بە دەستی خوداوە.

ـ لە گەڵ ڕۆژدا ئایینی کریستینی و کریستینییەکان بە هێزترو پتەوتر بوون، کەنیسە بووە خاوەن زەوی و زارێکی زۆر لە ئەوروپادا تا گەیشتە ئاستێك بەو ڕۆڵە نێگەتیڤانە قایل نەبێ دەستەوەستان دانیشێت و تەماشای دەسەڵات بکات. لاوازی ئەو کاتەی دەسەڵاتی ڕۆمانییەکان هەلی ڕەخساند بۆ کەنیسە بۆ دەستێوەردانی کاروباری دەسەڵات ، بە پێی هەڵسەنگاندنی نوێ خودا خۆی عەقڵ و هۆشی بە کریستینییەکان داوە وخۆیان ئازەزومەندن لە دیاری کردنی ئەو دەسەڵاتەی کە بەڕیوەیان دەبات، واتا قبوڵکردن ورەوایی دەسەڵات کەوتە دەستی کەنیسە ، دەبوایە ڕەزامەندی هەبوایە بۆ کەسێ یان گرووپێ دەسەڵاتی بە دەست بگرتایە. ڕەزامەندی کەنیسە لە سەر دەسەڵات ، ڕەوایی دەبەخشی بەو دەسەڵاتە، بە پێچەوانەوە ئەوە ئەو دەسەڵاتە ڕەوا نەدەبوو. بە پێی ئەم تیۆرە دەسەڵات لە دەسەڵاتێکی ڕەهاوە ، کە هیچ کەسێ بۆی نەبوو دیالۆکی لە سەر بکا و ڕەخنەو بەرهەڵستی بکا، بووە دەسەڵاتێك لە ژێر چاودێری و لێپرسینەوەی کریستینییەکان بەڕێوە دەچوو لە ڕێگای کەنیسەوە، کەنیسە چاودێری دەسەڵاتی دەکرد تا بزانێ تا چ ڕادەیەك پەیڕەوی فەرمودەکانی ئایینەکە دەکات. ئەم قۆناغە پێی دەڵێن : تیۆری مافی خوداوەندێتی ناڕاستو خۆ (theorie du droit divin providentiel).

دەربارەی تیۆرە ئایینییەکان دکتۆر مەحەمەد کامیل لەیلە لە کتێبەکەیدا سیستەمە ڕامیارییەکان دەڵێ: [1] هەڵەیە ئەم تیۆرانە بە تیوری ئایینی ناوزەرد

(١) بڕوانە : د.محمد كامل ليله ـ النظم السياسية ص ٢٠٥

بکرێت، ئەو ئایینانە چ ئایینی کریستینی بێ ، کە جیاوازی دەکات لە نێوان ئایین و دەسەڵات ، چ ئایینی ئیسلامی کە ئایین و دەسەڵات پێکەوە کۆ دەکاتەوە، لە بەرنامەکان و پرانسیپەکانیاندا لە گەڵ ئەم تیۆرانە یەك ناگرنەوە و پەسەندی ناکەن. کۆمەڵێ خەڵك بۆ مۆنۆپۆل کردنی دەسەڵات خۆیان داوەتە پاڵ ئەو تیۆرانە، بۆ چەوساندنەوەو ئەشکەنجەدانی خەڵکی بەناو ئایینەوە.

هەر وەها دەڵێ : ئەم تیۆرانە لە بیر وباوەڕی خورافی پێك هاتوون ، کە عەقڵی مرۆڤ هیناویانێتیە کایەوە و دایڕشتوون .

_ ئێمە بڕوامان وایە ڕاستە ئایینەکان لەبناغەدا بۆ چەوساندنەوەو ئەشکەنجەدانی خەڵکی نەهاتوونەتە کایەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆ خێرو خۆشی خەڵکی هاتوون ، بەڵام ئەو تیۆرانەش ڕەنگدانەوەی قۆناغێکن لە قۆناغەکانی ژیانی ڕامیاری مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. کە تیایدا مرۆڤ خۆی داوەتە پاڵ ئەو تیۆرانە و دەسەڵاتی بەکار هێناوە بۆ چەوساندنەوەو ئەشکەنجەدانی خەڵکی ، بەڵام ئەو تیۆرانە مرۆڤ هەروەها پەیدای نەکردوون ، بەڵکو دیڤاکتۆی قۆناغێکی دیاری کراو سەپاندویانێتی و تەنانەت لە کاتی ئێستاشدا بەشێ لەو قۆناغە تا ڕۆژی ئەمڕۆ کاریگەری خۆی ماوە.

## بەستی دووەم :

## تیۆرە گرێ بەستییەکان ( النظريات العقدية )

بە پێی تیۆرە ئایینییەکان ، وەکو لە سەرەوە باسم کرد و ئاماژەم پێکرد. دەوڵەت ودەسەڵات و چۆنێتی دروست بوونی دەوڵەت و دەسەڵات دەخاتە سەرەوەی ئیرادەو ئارەزوی مرۆڤەوە ، بەڵام بەگەشەکردنی بیری ڕامیاری لە سەردەمی ژیانەوەدا ( عصر النهضة )، بە پێی بیری نوێ دەوڵەت و دەسەڵات لە ئاسمانەوە هینرانە خوارەوە بۆ سەر زەوی ، واتا هەبوونی دەسەڵات و دەوڵەت بە پێی بۆچوونی نوێ گرێ درا بە ئیرادەو ئارەزوی مرۆڤەوە ، ئیرادەو ئارەزوی مرۆڤ خۆی بووە دروست کەرو بنیادنەری دەوڵەت و دەسەڵات، ناوەڕۆکی ئەم بۆچوونە لە گرێ بەستیدا خۆی دەبینێتەوە. تاکەکانی کۆمەڵگە هەموو کۆبوونەتەوەو پێکەوە گرێبەستییەکیان بەستووە و لەڕێگای

ئەو گرێ بەستییەوە دەوڵەت و دەسەڵات دروست بووە. ئەمە ناوەڕۆکی تیۆرەکەیە، وا دیارە ئەم تیۆرە گریمان ئامێزە(ئیفتیرازییە)، وا ئیفتیراز دەکات تاکەکانی کۆمەڵگە هەموو کۆبوونەتەوەو گرێ بەستیان بەستووە. هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر نییە، بیسەلمێنێ ئەو گرێ بەستییە وەکو دیفاکتۆ(واقع) ڕووی دابێ، یان قۆناغێکی ڕاستەقینە بێ لە دروست بوون و گەشە کردنی دەسەڵات و دەوڵەت، بۆیە ئەو بۆچوونانەی دروست بوونی دەسەڵات و دەوڵەت دەبەستنە گرێ بەستی کۆمەڵایەتییەوە، پشت بە ئیفتیراز دەبەستن، بۆیە دەتوانین بەو تیۆرانە بڵێین (تیۆرە گریمان ئامێزەکان) ، لێرەدا بیرو بۆچوونی سێ فەیلەسوف دەخەینە ڕوو بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە ناوەڕۆکی ئەو تیۆرە.

**یەکەم:** بۆچوونی هۆبز ( ١٥٨٨ ـ ١٦٧٩ز )

هۆبز لە ئینگلتەرا ژیاوەو مامۆستای میرنشین شارڵ بووە کە پاشان بووەتە خاوەن دەسەڵاتی ئەو وڵاتە، لە کاتی ژیانیدا بە چاوی خۆی بشێوی و ناهەمواری ڕەوشی ڕامیاری ئینگلتەرای بینیوە، هەر لەو ماوەیەدا لە ئەو وڵاتە میرنشینێك و دوو وەزیر لە سێدارە دراوون و سیستەمی ڕامیاری لە میرنشینییەوە بووە بە کۆماری و دیسان گەڕاوەتەوە بۆ میرنشینی، ئەم ڕوداوانەو پەیوەندی هۆبز لەگەڵ میرنشیندا کاریگەرییەکی تەواوی لە سەر بۆچوونەکانی هەیە، هۆبز پێ وایە: مرۆڤ جموجۆڵە، لە جموجۆڵەوە هەست: ئارەزوو، خۆشەویستی،ڕق لێ بوون دروست دەبێ، لەبەر ئەوەی ئەم ڕەوشتانە گشتی‌یەو هاوبەشە لە نێوان هەموو خەڵکدا، دەبنە هۆی دروست بوونی ململانێ لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە، گیانی ململانێ پاڵیان پێوە دەنێت یەکتری پاکتاو بکەن، ئەم ململانێیە و پاشکۆکانی وەکو نەمانی متمانەو بەرپابوونی تەماح و لە خۆ دەرچوون دەبێتە هۆی شەڕێکی بەردەوام و هەمیشەیی لە نێوان هەموو تاکەکانداو تاکەکان بۆ ئەوەی‌خۆیان لە نەهامەتی ئەم ژیانە سەرەتاییە ڕزگار بکەن، دەبێ عەقڵیان بەکار بێنن بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەك ڕزگاریان بکات و لە مەینەتی دەرباز بن.

بە بۆچوونی هۆبز ژیانی مروڤ لە سەرەتادا پێك هاتبوو لە شەڕو ناکۆکی و ململانێ، هەر تاك و گرۆپێ هەڵی دەکوتایە سەر تاك و گرۆپەکانی تر، خاوەن ماف ئەو

کەسە بوو بە زۆر بە دەستی بێنێ و بیپارێزێ، واتا مافێك ئەگەر خاوەنەکەی نەیتوانیبایە بە هێز بیپارێزێ، ئەوە خاوەن ئەو مافە نەدەبوو. ژیان دارستان ئاسا، بەهێز لاوازی قووت دەداو دەیخستە خزمەتی خۆیەوە. هیچ گرنتییەك (ضمان) لە سەر ژیان و ماڵی هیچ کەسێك نەبوو. کۆمەڵگە بە پشێوی و شەڕو هەڵ کوتانە سەر یەکتر دەژیا. کەس خاوەن سەرو ماڵی خۆی نەبوو. لەم بارودۆخەدا تاکەکانی کۆمەڵ عەقڵیان بە کار هێنا بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك کە ڕەوشێکی باشتر بێتە کایەوە بۆ هەمووان، سەرو ماڵی هەموویان لە مەترسی ڕزگار بکات. لێرەدا هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بڕیاریان دا دەست لە هەموو مافەکانی خۆیان هەڵگرن بە شێوەیەکی یەکجاری و ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی هەموویان دەست هەڵگرن لە هەموو مافەکانی خۆیان بۆ کەسێك کە دەرەوەی ئەو بڕیاردان و ڕێککەوتنەیە، کە ئەویش میرە (پاشا). لێرەدا خەڵکی هەموویان دەستیان هەڵگرت لە هەموو مافەکانی خۆیان و دەسەڵاتیان دایە دەستی میر، کە لایەن نەبوو لە ڕێکەوتنەکەدا، بەو پێیەی ڕەوشی نوێ هەرچۆن بێ هەر باشتر دەبێ لە ڕەوشی پێشو.بە پێی ئەم بۆچوونە پاشا هەموو دەسەڵاتێکی دەکەوێتە دەست و بەرپرسیار نییە بەرانبەر بە هیچ، لەبەر ئەوەی لایەن نەبووە لەو ڕێککەوتنەدا و هیچ لێپرسینەوەیەکی نابێ لە لایەن کۆمەڵەوە. بەڵکو دەبێ کۆمەڵ و تاکەکانی کۆمەڵ ملکەچی دەسەڵات بن و دیالۆکی دەسەڵاتەکەشی نەکەن.ئەم بۆچوونەی هۆبز لە ژیانی هۆبز و ئەو قۆناغەی تیایدا ژیاوە سەرچاوەی گرتووە.

**دووەم:** بۆچوونی جۆن لۆك ( ١٦٣٢ـ ١٧٠٤ز ) :

جۆن لۆك کە هاوڵاتیەکی ئینگلیزی بوو، وای دەبینی ژیانی سەرەتایی مرۆڤ ژیانێکی ئاسودەو پڕ هێمنی و ئارامی بووە، سەربەستی و ڕاستی خوازی و یەکسانی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا هەبووە، تاکەکانی کۆمەڵگە لە سایەی یاسای سروشتیدا بە یەکسانی و ئارامی و سەربەستی دەژیان، ئەم بۆچوونانەش بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی هۆبزن، کە ئەو وای دەبینی ژیانی سەرەتای مرۆڤ پێك هاتبوو لە کوشتن و بڕین و نایەکسانی و زاڵ بوونی بەهێز بەسەر بێ هێزدا.

جۆن لۆك وا دەبینێ، تاکەکان هەرچەندە لە سەرەتاوە ژیانیان بە ئاسودەیی بەسەر دەبرد، بەلام لە پێناو ژیانێکی چاکترو ڕێك و پێك تر پەنایان بردەبەر گرێ بەستی کۆمەلایەتی (العقد الاجتماعي) کە هەر تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ، دەست هەڵدەگرێت لە هەندێ لە مافەکانی خۆی نەك لە هەموو مافەکانی، بۆ کەسی دەسەلاتدار، کە تاکەکانی کۆمەڵ هەر خۆیان ئەو مافانە دیاری دەکەن بەو پێیە کەسی دەسەلاتدار دەسەلات بە ڕێوە دەبا لەو سنوورەی کە مافی پێ دراوەو تاکەکانی کۆمەڵ دەستیان لەو مافانە هەلگرتووە بۆ ئەو. بەلام لە هەمان کاتدا کەسی دەسەلاتدار، بۆی نییە دەست درێژی بکاتە سەر ئەو مافانەی کە هی هاوولاتیانن و دەستیان لێ هەڵنەگرتووەو نەیان سپاردوە بەکەسی دەسەلاتدار، واتا کەسی دەسەلاتدار دەسەلاتەکەی ڕەها نییەو بەرپرسیارە لە بەڕێوەبردنی دەسەلاتەکەی، کە دەبێ لە چوار چێوەی دیاری کراودا بەڕێوەی ببات. ئەگەر ئەو چوارچێوەیە دەرباز بکات تووشی بەرپرسیاری دەبێتەوە لە لایەن تاکەکانی کۆمەڵەوە، کەسی دەسەلاتدار بەرپرسیارە لە ئاسایش و سەلامەتی و دابین کردنی یەکسانی و ڕاستی خوازی ( العدالة) لە نێوان هاوولاتیاندا.

**سێیەم:** بۆچوونی جان جاك ڕۆسۆ: -

ڕۆسۆ دەڵێ:((مرۆڤ بە سەربەستی لە دایك بووە لە کاتێکدا ئێستا کۆت و زنجیر کراوە)).واتا ڕۆسۆ پێی وایە، مرۆڤ لە سەرەتادا پێش ئەوەی مولکیەتی تایبەتی (الملكيه الخاصه) بێتە کایەوە ئازاد و سەربەست بووەو بە خۆڕسکێ یەکسانی هەبووە. بەلام کاتێ مولکیەتی تایبەت هاتە کایەوە، ئەو یەکسانییە نەما.

هەروەها ڕۆسۆ دەڵێ:((لە جیاتی - جێگای - ئەوەی هێزو توانامان لە خۆماندا وون کەین، با تێکەڵی کەین لە هێزێکی سەرەوەدا کە حوکممان بکات بە پێی یاسایەکی عادلانە، بمانپارێزێ و بەرگریمان لێ بکاو بەرانگیری دوژمنە هاوبەشەکانمان بکات، بەرانگیرمان لێ بکات لە پێکهاتنێکی هەتا هەتاییدا.)).

لێرەدا ڕۆسۆ پێی وایە، دەبێ هەموو تاکەکانی کۆمەڵ هێزو توانا تایبەتییەکانی خۆیان لە خۆیاندا گەمارۆ نەدەن و نەیخنکێنن، بەڵکو دەبێ ئەو هێزو تواناییانە هەموو کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی هێزێکی گەورەترو کاریگەرتر پێکەوە بنێن، ئەو هێزەی سەرەوە

لە هێزی تاکەکان پێك هاتووەو شتێکی سروشتییە ئەگەر بڵێین واز هێنانی هەر تاکێك لە هێزو توانای خۆی و هەر کەسێ لە لای خۆیەوە. ئەمە خۆی لە خۆیدا گرێ بەستییەکە، پێویستی بە یاسایەکە کە ڕۆسۆ ناوی ناوە (یاسایەکی عادلانە). بۆ ئەوەی بە پێی ئەو یاسایە هەر تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ بپارێزرێ و بەرگری لێ بکرێ و ڕووبەڕووی دوژمنە هاوبەشەکانیان ببنەوە.هەروەها دەڵێ:((چۆن شێوازێ بۆ کۆمەڵ بدۆزرێتەوە کە بە هەموو هێزو توانایەکی هاوبەشەوە سەرو ماڵی هەر تاکێکی کۆمەڵ بپارێزرێ، بە پێی ئەم شێوازە هەموو تاکەکان لە کۆمەڵدا یەکبگرنەوەو ملکەچی کەس نەبن تەنها خودی خۆیان نەبێ و سەربەست بن وەکو جاران)). لێرەدا ڕۆسۆ پرسیاری ئەوە دەکات، چۆن شێوازێك بدۆزینەوە کە مەخسەتی(پێك هاتنی کۆمەڵایەتیە)، کە بتوانێ سەرو ماڵی هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بپارێزێ بە هێزێکی هاوبەش کە لە هێزی هەموو تاکەکان پێك هاتبێ، ئەو کاتە ملکەچی تاکەکان بۆ ئیرادەی هەمووان و هێزو دەسەڵاتی هاوبەش، ملکەچییە بۆ خودی تاکەکان لەبەر ئەوەی ئەو هێزە هاوبەشە لە خودی خۆیان پێك هاتووە. ئەمەو ڕۆسۆ دەربارەی مەرجەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ( العقد الاجتماعي ) دەڵێ : (( مەرجەکانی گرێبەستی هەموو بە یەك مەرج کۆتایی پێ دێت ، هەر تاکێك بە تەواوی واز لە مافەکانی دێنێ بۆ هەمووان و لەبەر ئەوەی هەر تاکێك واز لە مافەکانی خۆی دێنێ بە تەواوی ئەوا هەر هەموویان لەو بارەیەوە یەکسان دەبن وەکو یەك ، وازهێنانی لەو مافانە دەبێ بێ خۆگرتن ( تحفظ )بێت ، ئەو کاتە یەکگرتن بە تەواوترین شێوە دەبێت )).

ڕۆسۆ وا دەبینێ ودەڵێ :ـ بۆ ئەوەی تواناو هێزی مرۆڤ لە خۆیدا نەتوێتەوە ، پێویست دەکات تاکەکان هەموو هێز وتواناکانیان یەك بخەن و کۆی بکەنەوە لە یەك هێز و تواناداو بەیەك تەییاردا ئاراستەی بکەن ، تا هەموو پێکەوە لە سایەی یاسایەکی عادلانەدا بحەسێنەوە. ئەو یاسایە بیانپارێزێ لە دوژمنە هاوبەشەکانیان و پاڵ پشتیان لێ بکات. هێزو تواناکان بەو شێوەیە ڕێك دەخرێن و ئاراستە دەکرێن کە هەموو تاکێك لەلای خۆیەوە واز (تنازل)لە هەموو مافەکانی بێنێ بێ خۆگرتن (تحفظ) بۆ هەمووان ، بۆ ئەو قەوارەیەی کە هەمووانی لە خۆ گرتووە، لێرەدا تاکەکان هەموویان وەکو یەکن

و یەکسانن لەوازهێنان لە هەموو مافەکانیان ، کە لە ڕاستیدا وازهێنانیان بۆ خۆیان بووە. بەو پێیە هێزو تواناکان هەموو یەك دەگرن و لە خزمەتی هەمووواندا کار دەکەن و یەك دەگرنەوە لە هەمووواندا و وەکو جاران سەرفراز دەبن و خۆیان دەخەنە ژێر ئاراستەی ئیرادەی گشتییەو. لێرەدا دەسەڵات بەدەست و دەسەڵات داران هەمان کەسن بەڵام لە دوو گۆشە نیگای جیاوازەوە تەماشا دەکرێن.

پاش خستنە ڕووی بۆچوونەکانی هەر سێ فەیلەسوف تۆماس هۆبز ، جۆن لۆك ، جان جاك ڕۆسۆ بۆمان دەردەکەوێ ، چەند جیاوازییەك لە بۆچوونەکانیاندا هەیە : ـ

ـ هۆبز : سەرەتای ژیانی مرۆڤایەتی وا شی دەکاتەوە کە شەڕو شۆڕو نا ئارامی و هەڵکوتانە سەر یەکتر دەستوری ژیانی ئەو کاتە بووە.

ـ لۆك دەڵێ : ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە سەرەتادا تا ڕادەیەکی زۆر ئارامی و هێمنیان بە خۆیانەوە بینیوە و یەکسانی وڕاستی خوازی لە ئارادا هەبووە.

ـ ڕۆسۆ دەڵێ : مرۆڤ بە ئازادی لە دایك بووە و لە سەرەتادا یەکسانی سروشتی هەبووە تا موڵکیەتی تایبەت هاتووەتە کایەوە و ئەو یەکسانییەی تێك داوە.

ـ هۆبز دەڵێ : تاکەکانی گرێ بەستییەکە ( افراد العقد ) لە هەموو مافەکانیان واز دەهێنن بێ خۆگرتن (تحفظ) بۆ کەسێکی دیکە کە بەرانبەریان هیچ ئیلتزامێکی نییە و بەرپرسیار نییە بەرانبەر بە هیچ.

ـ لۆك دەڵێ : دابەزینی تاکەکان لە مافەکانیان دابەزینە لە هەندێ لە مافەکانیان نەك هەمووی. ئەو کەسەی یان ئەو گروپەی ژێرەیی (تنازل) بۆکراوە بەرپرسیارە بەرانبەر تاکەکان ، نابێ دەستکاری ئەو مافانە بکات کە تاکەکان دەستیان لێ هەڵ نەگرتووە.

ـ ڕۆسۆ دەڵێ : تاکەکان بێ خۆ گرتن واز لە هەموو مافەکانیان دێنن و هەر یەکەو لە لایەن خۆیەوە بۆ هەمووان نەك بۆ کەسێك یان گروپێك ، هەرکەسێ دەست لەو دەسەڵاتەی هەیەتی هەڵ دەگرێ ، بۆ ئەوەی ئەم دەسەڵاتانە هەموو کۆببنەوە لە دەسەڵاتێکی بڵندا کە دەسەڵاتی هەمووان پێك دێنێ ، بە بۆچوونی ڕۆسۆ ئەم گرێبەستیە دەوڵەتی دروست کردووە و وەکو هەر گرێبەستێکی دیکە نییە، بەڵکو

گرێبەستییەکە لە جۆرێکی تایبەت. هەروەها فەیلەسوفە کاسۆلیك و پرۆتستانتەکان[1] لە سەدەی شازدەیەم

باسی گرێ بەستی کۆمەڵایەتیان کردووە و باسی ئەوەیان کردووە کە گەل و

میر لەسەر گرێ بەستییەکی ئارەزومەندانە ڕێککەوتوون وخۆگرتنی(التزامات) ئاڵوگۆڕکێ لە نێوانیاندا هەبووە بە پێی چەند حوکمێکی تایبەت.

ئەمەو مامۆستا ڤالین (Waline) دەڵێ:

سەرچاوەی بیری گرێبەستی لە لای پیاوانی ئایینی دەگەڕێتەوە بۆحوکمەکانی تەورات کە لەهەندێکیدا هاتووە ، کە لەنێوان خوداو یەهوددا هاوپەیمانییەك بەستراوە، بەپێی ئەو هاوپەیمانییە یەهود دەتوانێ ملکەچ نەبێ بۆ خودا لەکاتێکدا ئەگەر خودا وازیان لێ بێنێ ، ئەو کاتەش دەتوانن واز لەخودا بێنن و بەدوای خودایەکی دیکەدا بگەڕێن.

## بەستی سێیەم

## تیۆرە زانستییەکان

تیۆرە زانستییەکان بەو تیۆرانە دەوترێت کە لە سەر بناغەیەکی زانستییانە دامەزراوون ، لە سەر بۆچوونی عەقڵی مرۆڤ بۆ شتەکان و شیکردنەوەی چەمکی دەسەڵات و دەوڵەت لە ڕۆشنایی دیڤاکتۆی (وقائع) ژیانی کۆمەڵایەتیدا. ئەو بۆچوونانەی باسی دەسەڵات و دەوڵەت بە شێوەیەکی زانستییانە دەکەن زۆرن بەڵام ئێمە ئەم چوار تیۆرە دەخەینە ڕوو :

١. تیۆری پێشکەوتنی خێزان (نظرية التطور العائلي).
٢. تیۆری هێزو زاڵبوون (نظرية القوة والغلبة).
٣. تیۆری مارکسی (النظرية الماركسية).
٤. تیۆری پێشکەوتنی دیرۆکی (نظرية التطور التأريخي).

---

(١) بڕوانە : د. طعيمة الجرف ـ النظريات و النظم السياسية و سيادة القانون الدستوری ص٧.

## ١. تیۆری پێشکەوتنی خێزان :

ـ ئەرستۆ دەڵێ : مرۆڤ بە سروشت شارستانییە ، کۆمەڵ کە دیاردەیەکی سروشتییە (ظاهرة طبیعیة) خۆی دروست دەبێت بە پێی پێویستی غەریزەی کۆمەڵایەتی لە مرۆڤدا.سروشت نێری دروست کردوە ، مێینەشی دروست کردوە،نێرو مێ یەك دەگرن بە حوکمی غەریزە و لە پێناو زیادبوون و پاراستنی جۆردا. هەروەها سروشت بە شێوەیەکی جیاواز خەڵکی دروست کردووە، زیرەکی بەخشیوەتە ئازادەکان(سەربەستەکان) و بێ بەشی کردووە لە کۆیلەکان، بە یەك گردنی نێر و مێ و ئازادو کۆیلەکان،خێزان دروست بووە، بە کۆمەڵ بوونی خێزانەکان و فراوان بوونیان تیرە دروست بووەو بە کۆمەڵ بوونی تیرە خێڵ دروست بووەو بە فراوان بوونی خێڵ لادێ دروست بووەو بە گەورە بوونی لادێو فراوان بوونی ، شارەڕامیارییەکان هاتوونەتە کایەوە.

هەروەها ئەرستۆ دەڵێ: دەوڵەت گشتە، لە چەند بەشێك پێك هاتووە(خێزان، خێڵ، تاکەکان).

ـ بۆدان پێی وایە، دەوڵەت یەکگرتنەوەی چەند خێزانێکە دەچنە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتێکی خاوەن سەروەرییەوە.

ئەم تیۆرە بۆ شیکردنەوەی چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەت دەچێتە ناو قوڵایی مێژووەوە، لە یەکەم شانەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە دەست پێ دەکات. ئەوانەی باسی ئەم تیۆرە دەکەن پێیان وایە لە سەرەتادا خێزان ـ خێزانی دایك بووە، واتا خێزان لە دایك و منداڵەکانی پێك هاتبوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ بە چەند پیاوێك لە گەڵ یەك ژن تێکەڵ بوونەو پاشان کەسیان خۆیان بە خاوەنی ئەو خێزانە نەزانیوە. بەڵام لە گەڵ ڕۆژدا ئەو سیستەمە گۆڕاوەو هەر پیاوێك ژنێك یا چەند ژنێکی هەبووەو خێزان بوەتە خێزانی باوك، باوك خاوەن خێزان بووەو دەسەڵاتی تەواوی بە سەر ژن و منداڵدا هەبووە، تاڕادەی لە ناوبردن و کۆتای هێنان بە ژیانیان. هەروەها هەندێ جار خێزان کۆیلەو لەو جۆرانەی گرتووە بەخۆوە و دەسەڵاتی خاوەن خێزان کە باوك بووە ئەوانیشی گرتوەتەوە. هەر خێزانێك لەو خێزانانە زیادی کردووەو بووە بە چەند

خێزانێك، ئەم خێزانانە پەیوەندی هاو خوێنی لە نێوانیاندا هەبووە، بە هەبوونی ئەم خێزانە هاوخوێنانە پێکەوە تیرە دروست بووە، واتا بنەمای هەر تیرەیەك دەگەڕێتەوە بۆ چەند خێزانێك کە لە سەرەتاوە لە یەك خێزانەوە هاتووە. واتا ئەندامانی هەر خێزانێك لەو خێزانانە بە زاو ـ زێ زیادیان کردووەو چەند خێزانێکی دیکەیان لێ بووەتەوە، بە زیاد بوونی هەر یەك لەم خێزانانە چەند تیرەیەك دروست بوونە، کە ئەم تیرانە پێکەوە عەشیرەتیان پێك هێناوە، بە کۆمەڵ بوونی چەند عەشیرەتێك پێکەوە و هاوخوێنی لە نێوانیاندا نەتەوە پێك هاتووە، زۆربەی دەوڵەتانیش لە سەر بناغەی نەتەوە پێك هاتوون. ئەمەو لە ڕۆما و زۆربەی شارەکانی یۆنانی کۆن، دەسەڵات بە دەست بەخێوکەری خێزانەکانەوە بووە، شار لە چەند خێزانێك پێك هاتبو و دەسەڵات بە دەست ئەو خاوەن خێزانانەوە بوو .

ئەم تیۆرە هەندێ ڕەخنەی لە سەرە، بەڵام ڕخنەکان لەبەر ئەوەی زۆر لاوازن پێویست بە دیالۆك کردنیان ناکات. بەڵام ئەوەش دەخەینە ڕوو، لەوەیە تیۆری پێشکەوتنی خێزان تەنها هۆ نەبێ بۆ شیکردنەوەی چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەت، بەڵام تیۆرێکە گونجاوە لەگەڵ قۆناغە مێژوویییەکاندا و چۆنیەتی پێشکەوتنی کۆمەڵ و بەشێك یان قۆناغێك لە چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەت شیدەکاتەوە.

## ٢. تیۆری هێز و زاڵبوون (نظرية القوة و الغلبة).

زۆر لە نووسەران دەربارەی ئەم تیۆرە دوواون و ئەم تیۆرەیان بە بناغەی دەوڵەت داناوە لە(بۆلیبەوە بۆ ئۆبنهایمەر و دیگی و جۆفنێل).

ئەم تیۆرە لە سەرەتاوە هەبووەو تا ئێستاش هەر لایەنگری خۆی هەیە. ئەو یاسازانایانەی دەربارەی ئەم تیۆرە دوواوون وا دەبینن، هێز هۆی دروست بوونی دەوڵەتە. لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا یەکێ لە خاوەن خێزانەکان بە هۆی زەبرو زەنگەوە توانیویەتی کۆنترۆڵی خێزانەکانی دیکە بکات، یان سەرخێڵێك توانیویەتی دەسەڵاتی خۆی بەسەر خێڵەکانی تردا بسەپێنێت و ژێر دەستیان بکات. بەو شێوەیە کۆمەڵی ڕامیاری یەکی گرتووەو پێکەوە لکاوەو دەسەڵات پتەو بە هێز بووە. ئەمەو

هێز ئامرازێك بووە بۆ پێکەوە نانی کۆمەڵی ڕامیاری و پەرش و بڵاو بوونەوەی و بە دەسەڵات بوونی.مێژووی مرۆڤایەتی کۆمەڵێ شەڕو شۆڕو بگرەو بەردە بووە، تیایدا خاوەن هێز بووەتە دەسەڵات و دەسەڵاتی خۆی بە سەر بێ هێزو دۆڕاودا سەپاندووە.لە ڕاستیدا هێزو جەنگ و بە کارهێنانی ئەو ڕێگایانە بۆ دروست کردنی قەوارەی ڕامیاری و فراوان کردنی دەسەڵات، شتێکە نکۆڵی لێ ناکرێ، لە ڕۆڵی کەم ناکرێتەوە، کۆمەڵگە ڕامیارییە سەرەتاییەکان زۆر جار پەنایان بردوەتە بەر هێز بۆ پاکتاو کردنی یەکترو هەندێ جار کۆمەڵێکی ڕامیاری کۆنترۆڵی کۆمەڵێکی ڕامیاری دیکەی کردووە و خستوویەتیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە،هەندێ جاریش لە ئەنجامدا کۆمەڵی ڕامیاری ژێر دەستە لە قەوارەی کۆمەڵی ڕامیاری باڵادەستدا وون بووە و تواوەتەوە. بەڵام لەحاڵەتی دیکەدا کۆمەڵی ڕامیاری ژێر دەستە یان دۆڕاو، توانیویەتی تایبەتمەندییەکانی خۆی بپارێزێ، هەرچەندە کۆمەڵی ڕامیاری باڵا دەست خۆی بە سەردا سەپاندووە و لە سەر حیسابی ئەو فراوان بووە،بەڵام ئەم فراوان بوونە کاتی بووە و سەقام گرتوو درێژ خایان نەبووە، لە هەل و مەرجی گونجاودا شتەکان دووبارە گەڕاونەتەوە بۆ حاڵەتی خۆیان. ئەمەو دیگی کە یەکێکە لەوانەی لە گەڵ تیۆری هێزدایە بەڵام بە تێڕوانینێکی فراوانترەوە، دەڵێ:

دەوڵەت جیاکارییەکە لەنێوان دەسەڵات بە دەستان و دەسەڵات بە سەران، دەسەڵات بە دەستان لە ڕێگای بە کارهێنانی ناچار کردنی ماددیەوە ئەو دەسەڵاتە بە ڕێوە دەبەن. بەڵام دیگی بە تەنها پشت بە دەسەڵاتی ماددی نابەستێ، بەڵکو هێز لە دیدەی دیگییەوە هێزی ئایینی و هێزی ئابووری و لەو جۆرانەش دەگرێتەوە. لەم ڕوانگەیەوە لەوەیە بەکارهێنانی هێزی ماددی لەگەڵ ڕۆژدا بگۆڕێ و کۆمەڵگە قەناعەت بە شێوەی دەسەڵات بکات، بە هۆی ئەو خزمەتانەی کە دەسەڵات پێشکەش بە کۆمەڵگەیان دەکات، یان کۆمەڵگە ملکەچی هەندێ پێوەری ئەخلاقی یان ئایینی دەبێ کە لە دەسەڵاتدا بەرجەستە دەبێ ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ملکەچی تاکەکانی کۆمەڵ لەوانەیە ملکەچی بێ بۆ پێوەرە ئایینیەکان یان ئەخلاقییەکان نەك بۆ هێزی ماددی. دیگی پێی وایە جیاوازی ئەوتۆ نیە لە نێوان دەسەڵاتی سەرۆك خێڵ و دەسەڵاتی دەوڵەتدا، لەبەر

ئەوەی هەردوگیان پەنا دەبەنە بەر بەکارهێنانی هێزو جیاوازی ئەو دوو دەسەڵاتە لە سروشتی خودی دەسەڵاتدا نییە بەڵکو جیاوازییە لە پلەدا(الدرجة). ڕەخنەکەرانی ئەم تیۆرە دەڵێن: ئەو دەسەڵاتانەی تەنها بە هێزی ماددی بەن بن، ئەوە دەگەیەنێ کە کەم و کورتی لە بونیانی کۆمەڵایەتیدا هەیە،مەحاڵە ئەو دەسەڵاتانە تا سەر بڕۆن. دەسەڵات بۆ ئەوەی کاتی نەبێ و تاکەکانی کۆمەڵ ملکەچی بن، دەبێ ئەو تاکانە قەناعەتیان بە دەسەڵات هەبێ، نەك تەنها لەترسی هێزی ماددیدا ملکەچ بن. واتا دەبێ دەسەڵات هەڵقوڵاوی بونیانی کۆمەڵ بێ بۆ ئەوەی دەسەڵاتێکی پتەو بێ.

ئەمەو لە دووایدا ئەم بۆچوونانە دەربارەی تیۆری هێز دەخەینە ڕوو.[1]

ـ پلۆتارك:Plutarke : کۆنترین یاسا کە گەردوون ملکەچی بووە، یاسای بە هێزەو باڵا دەستیەتی بە سەر بێ هێزدا.

ـ بلنتشی: بە بۆچوونی پێشینەکان، سەرکەوتن لە جەنگدا، حوکمێکی خودایی بوو لە قازانجی ئەوانەی کە سەرکەوتنیان بە دەست دەهێنا.

ـ ئۆبنهایمەر: دەوڵەت سیستەمێکی کۆمەڵایەتییە سەرکەوتوو سەپاندویەتی بەسەر ژێر کەوتودا.

عەلی عەبدولڕەزاقیش[2] دەربارەی خیلافەتی ئیسلامی ووتویەتی، لە ئیسلامدا دەبێ خیلافەت بە موبایەعە بێ، بەڵام لە مێژووی خیلافەتی ئیسلامیدا سێ خەلیفەکەی ئەوەڵ نەبێ، ئەودوای بە هێزی ماددی و زەبر و زەنگ هاتوونەتە کایەوەو بوونەتە دەسەڵات.

### ٣ـ تیۆری مارکسی بۆ شیکردنەوەی دەوڵەت:

شیکردنەوەی مارکس و هاوڕێکانی بۆ چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەت شیکردنەوەیەکی ئابوورییە. تیۆری مارکسی وا دەبینێ کۆمەڵە هەرە سەرەتاییەکان دەوڵەتیان بە خۆوە نەبینیوە لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا چین و توێژ

---

(١) بڕوانە :د.طعيمة الجرف ـ نظرية الدولة و الاسس العامة للتنظيم السياسي.

(٢) بڕوانە : د.محمد كامل ليلة ـ النظم السياسية ص٢١٣.

نەبووە، واتا کۆمەڵ ئەو کاتە نەبووبوو بە چین و توێژ، بەڵام کاتێ کۆمەڵ بوو بە چین و توێژ و ململانێی چینایەتی هاتە کایەوە و چینی چەوسێنەرو چینی چەوساوە پەیدا بوون، دەوڵەت هاتە کایەوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندی چینی چەوسێنەر بپارێزێ بەرانبەر چینی چەوساوە. لە سیستەمی ئەرۆستۆکراتیدا(فیۆدالی) دەوڵەت بەرژەوەندی خاوەن زەوییەکان دەپارێزێ بەرانبەر جوتیارەکان. لە سیستەمی بورجوازیدا دەوڵەت بەرژەوەندی خاوەن سەرمایەکان دەپارێزێ بەرانبەر کرێکارەکان. بە پێی ئەم تیۆرە دیموکراسی ساختەیەو هەموو کاتێ بەرژەوەندی کەمایەتی خاوەن سەرمایە دەپارێزێ بەرانبەر کرێکارەکان و چەوساوەکان. لینین دەڵێ: ((دەوڵەت ئەنجامێکە، هەم تەعبیرە لە توانا نەبوونی پێک هاتن لە نێوان ململانێ چینایەتییەکاندا)). دەوڵەت دروست دەبێت لە شوێن و کاتێکدا و تا ئەو ڕادەیەی کە لە پراکتیك و بابەتدا پێك هاتن نەکرێ لە نێوان ململانێ چینایەتییەکاندا و بەو پێیە هەبوونی دەوڵەت ئەو ململانێ چینایەتییانە دەسەلمێنێ کە ناکرێ پێك بێن.

ئەمە بۆچوونی مارکسییەکانە لە سەر دەوڵەت تائەو کاتەی شۆڕشی سۆشیالیزم بەرپا دەبێت.

ئەم شۆڕشە لە کاتێکدا بەرپا دەبێت کە چەوساندنەوەی سەرمایەداران بگاتە ئاستێك ئیتر لە لایەن کرێکاران و چەوساوەکانەوە تەحەمول نەکرێت. ئەو کاتە شۆڕشی چینی کرێکار دەبێتە شتێکی حەتمی و دەوڵەتی سەرمایەداری چەوسێنەر دەڕوخێنێ و لە جێگەی ئەوە دەوڵەتی چینی کرێکار پێکەوە دەنێ، واتا دکتاتۆریەتی سەرمایەدار دەڕوخێ و لە جێگەیدا دکتاتۆریەتی چینی کرێکار دێتە کایەوە و سیستەمی سۆشیالزم پەیڕەو دەکرێ، بە پەیڕەو کردنی سیستەمی سۆشیالزم لە گەڵ ڕۆژدا چین و توێژ نامێنێ و کۆمەڵگەی شیوعی دێتە کایەوە. ئەو کاتە ئەو کۆمەڵگەیە پێویستی بە دەوڵەت نامێنێ و دەوڵەت لاوازو کز دەبێ تا دەتوێتەوە. بەڵام ئەم تیۆرە وەکو تیۆرەکانی تر ڕەخنەی ئەوەی لە سەر دەگیرێ کە شی کردنەوەی چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەتی بەستووە بە ڕەوشی ئابوورییەوە و ڕایەڵی ئابووری کردوەتە بناغەیەك بۆ شی کردنەوەی دروست بوونی دەوڵەت، ئەو بناغەیە ڕاستە بەدرێژایی

مێژوو ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لەسەر دەسەڵات و دەوڵەت و کۆمەڵگەبەڵام لە هەمان کاتدا تاکە هۆ نیە بۆ شی کردنەوەی چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەت.

لەوەیە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا ڕایەڵی ئایینی، هەندێ شتی خورافی، ئەو کەسانەی خەڵك وا لێیان تێگەیشتبوو نهێنی دیاردە سروشتییەکانیان لایە، ڕۆڵێکی زیاتریان بینیبێ لە دەسەڵات و بەڕێوەبردنی کۆمەڵ تا ڕایەڵی ئابووری و ئەو کەسانەی ڕەوشی ئابوورییان بەدەست بووە.

شتە ڕوحییەکان زۆر جار سەرچاوەی دەسەڵات و دەوڵەت بوونە. هەروەها تیۆری مارکسی دەڵێ : پاش دروست بوونی دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو سیستەمی سۆشیالزم و پاشان کۆمەڵگەی شیوعی، دەوڵەت کزو لاواز دەبێت تا لە ناو دەچێت. بەڵام لە پراکتیکدا لەو دەوڵەتانەی کە بە سیستەمی شیوعیان وەرگرت بۆ ماوەیەك، لە لایەکەوە لە کاتی دەسەڵات وحوکمی مارکسیەکاندا ڕۆڵی دەوڵەت بە هێزتر بوو، دەوڵەت دەستێوەردانی زۆربەی کاروباری تاکەکانی نیشتەجێی دەوڵەتی دەکرد و هەموو کارو بارەکان و هەموو دام ودەزگاکان ئاراستە دەکران لە لایەن دەوڵەتەوە. لە لایەکی دیکەوە سیستەم و دەسەڵاتی مارکسیەکان لە زۆربەی ئەو دەوڵەتانە ڕوخان لە بەر ئەوەی نەیانتوانی سیستەمی چینایەتی بە تەواوی بڕوخێنن و قەناعەت بە خەڵکی بکەن کە دەبێ کۆمەڵگەیەکی شیوعی بن ، هەروەها دەسەڵاتی دیکتاتۆری حوکمی زۆربەی ئەو دەوڵەتانەی دەکرد ، ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەڵاتی خۆیان بتەو دەکرد، خۆشگوزەرانی خۆیان و بنەماڵەکەیان خستبووە سەرەوەی خۆشگوزەرانی میللەت و بە تەنگەوە هاتنی بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی شیوعی. نموونە بۆ ئەم حاڵەتەی دواییش دەوڵەتی ڕۆمانیایە لە کاتی دەسەڵاتی تشاوشیسکۆدا.

## ٤.تیۆری پێشکەوتنی دیرۆکی

تیۆری پێشکەوتنی دیرۆکی ، دروست بوونی دەوڵەت ناگەڕێنێتەوە بۆ هۆیەکی دیاری کراو، بەڵکو دروست بوونی دەوڵەت بە دیاردەیەکی سروشتی دادەنێ لە دیاردەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی دیرۆکی کۆمەڵایەتی بێ ووچان، واتە تیۆری پێشکەوتنی دیرۆکی دروست بوونی دەوڵەت ناگەڕێنێتەوە بۆ تەنها هۆیەك ،

هەر وەكو چۆن لە تیۆرەكانی دیكەدا دەبینرێ، لە ڕاستیدا دروست بوونی دەوڵەت دەگێڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك، پێشكەوتنی خێزان، بە كارهێنانی هێز، ڕەوشی ئابووری، هۆیە ئایینییەكان، واتا ئەم تیۆرە، تیۆرێكی پێك هاتەیە، هەموو تیۆرەكانی دیكە پێكەوە دەبەستێتەوە. بە پێی ئەم تیۆرە دەوڵەت چەند جۆرێكە و ڕەوشی كۆمەڵایەتی جیاوازە و ئەو قۆناغ و بارودۆخانەی پێیدا ڕۆیشتووە، یان پێشكەوتنی هەر دەوڵەتێك بە پێی قۆناغ یان بارودۆخی تایبەتی خۆی بووە. بەم پێیە سیستەمی ڕامیاری لە دەوڵەتدا ڕێژەییە، لەوەیە سیستەمێكی دیاری كراو گونجاو بێت بۆدەوڵەتێك بەڵام گونجاو نەبێت بۆدەوڵەتێكی دیكە. لەوەیە گونجاو بێت لە دەوڵەتدا لە كاتێكدا، بەڵام گونجاو نەبێ لە هەمان دەوڵەتدا بۆ كاتێكی دیكە.

بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم تیۆرە هەندێك وا دەبینن، ئەم تیۆرە تیۆرێكی هەڵساو نییە خۆی لە خۆیدا، بەڵكو كۆكەرەوەی هەموو تیۆرەكانی دیكەیە. ئەم بۆچوونە ڕاستە، تیۆری پێشكەوتنی دیرۆكی كۆكەرەوەی هەموو تیۆرەكانی دیكەیە، لە ڕاستیدا دەوڵەت و دیاردەی دەسەڵات و دروست بوونی دەوڵەت ئەنجامی یەك هۆ یان یەك حاڵەت نیین، بەڵكو دەرئەنجامی چەند هۆیەكن، پێشكەوتنی خێزان، هۆی ئایینی، بەكارهێنانی هێز، حكمەتی لایەنە ململانێ كەرەكان، هۆی ئابووری. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم تیۆرەش خۆی لە خۆیدا ئەنجامی تیۆرو بۆچوونەكانی دیكەیە.هەروەهاهەندێ بۆچوون هەیە هاتنەكایەوەی دەوڵەت دەبەستنەوەبە دەستوورەوە و دەڵێن: [1] دەوڵەت كاتێ دێتەكایەوە كە دەستوور جاڕ بدرێ، واتا بە جاڕدانی دەستوور دەوڵەت دێتەكایەوە، ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە:(كاری دی ملیرج، هانس كلسن).

بەڵام لە ڕاستیدا و وەكو لە دیفاكتۆشدا هەر وایە، دەوڵەت كاتێ دێتەكایەوەو سەقامگرتوو دەبێت، ئەو كاتە دەستوور دێتەكایەوە، هەر دەوڵەت و دام و دەزگاكانی دەوڵەت دەستوور دادەنەن و هەڵی دەوەشێننەوەو هەمواری دەكەنەوە.

---

(١)بڕوانە : د. طعيمة الجرف ـ نظرية الدولة و الاسس العامة للتنظيم السياسي ص٥٦.

بەڵام هەندێ بۆچوونیش هەیە دەڵێن:

دەستوور ڕۆڵێکی مەزنی هەیە لە پێکهاتنی دەوڵەت ، بەڵام ئەویش هۆکارێکە لە هۆکارەکانی هەبوونی دەوڵەت و تاکە هۆکاریش نییە.

هەروەها بۆچوونێکی دیکە هەیە، کە بۆچوونی یاسازان(دیگی)یە دەڵێ:[1]

دەوڵەت لە کاتێکدا دێتە کایەوە، ئەگەر جیاوازی هەبێ لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا لە نێوان دەسەڵاتداران و دەسەڵات بە سەران، ئیتر ئەو کۆمەڵگەیە ئەگەر کەم بێ یان زۆر، سەقامگرتوو بێ لە سەر هەرێمێك یان کۆچبەر.

دەسەڵات بە دەست دەبێ خاوەن هێزو توانایەکی وا بێت، کە هیچ هێزو توانایەك لە دەوڵەتدا نەتوانێ ڕووبەڕووی ببێتەوە.

ئەم بۆچوونە وەکو لە بابەتێکی دیکەمدا ئاماژەم پێ کرد کەم و کورتی زۆرن، ئەوەی پێویست دەکات لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین، ئەوەیە؛ دەسەڵات و جیاوازی نێوان دەسەڵات بەدەستان و دەسەڵات بەسەران ئەگەر ڕایەڵێك بن لە ڕایەڵەکانی دەوڵەت، بەڵام بە تەنها دەوڵەت پێك ناهێنن، بۆ ئەوەی دەوڵەت هەبێ، دەبێ هەموو ڕایەڵەکان هەبن، گەل، هەرێم، دەسەڵات جگە لە دانپێدانانیش بە بۆچوونی هەندێ لە یاسازانەکان.

---

[1] بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی دووەم

بەشی دووەمی بەرگی یەکەم باسیشێوەکانی دەوڵەت دەکات کەکردوومانە بە دوو باسەوە، لە باسی یەکەمدا،باسی دەوڵەتی سادە دەکەین(دەوڵەتی یەك پارچە)،لە باسی دووەمدا، باسی دەوڵەتی فیدرالی دەکەین.

## بەشی دووەم:
## ((شێوەکانی دەوڵەت))[1]

کاتێ باسی شێوەکانی دەوڵەت دەکرێ، یان دابەشکردنی دەوڵەت بۆ چەند شێوەیەك، ڕایەڵی دەسەڵات دەکرێتە بناغە بۆ ئەو دابەش کردنە، ئەگەر هاتو دەسەڵات لە دەوڵەتدا یەك بوو، ئەوە پێی دەڵێن دەوڵەتی سادە(الدولة البسیطة). بەلام ئەگەر دەسەڵات لە دەوڵەتدا فرە بوو(متعدد) ئەوە پێی دەڵێن دەوڵەتی فیدرالی.*بۆیە پێویست دەکات بە دوورو درێژی باسی ئەم دوو شێوەیەی دەوڵەت بکەین.

---

(١) بڕوانە: د. منذر الشاوي ـ نظریة الدولة ٢٠٠.

* هەندێ لە یاسازانەکان کاتێ باسی جۆرەکانی دەوڵەت دەکەن ، لە پاڵ جۆرەکانی تری دەوڵەتدا باسی کۆنفیدرالیش دەکەن ، بەڵام لە ڕاستیدا شتێك نیە ناوی دەوڵەتی کۆنفیدرالی بێت ؛ لە بەر ئەوەی کۆنفیدرالی ئەو حاڵەتانە دەگرێتەوە کە چەند دەوڵەتێك پێکەوە کۆدەبنەوە ، هاوپەیمانیەك کۆیان دەکاتەوە، لە سەر بەڵگەنامەیەك یان پەیماننامەیەك ڕێك دەکەون . لە نێوان خۆیاندا دەزگایەك دیاری دەکەن کە پێی دەڵێن کۆمەڵە یان ئەنجومەن یان کۆنگرس ، کە لە نوێنەری هەموو دەوڵەتە بەشداربووەکان پێك دێت و هەڵدەستێ بە ڕاپەڕاندنی ئەو خاڵانەی کە پێشان دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لە سەری ڕێك کوتوون . هەروەها لە حاڵەتی کۆنفیدرالیدا هەر دەوڵەتێك سەروەری ناوخۆی خۆی دەپارێزێ جگە لەوەی کە کەسایەتی نێودەوڵەتی خۆی دەبێ ، هەروەها

## .باسی یەکەم

## دەوڵەتی یەك پارچە ( یەکبوون )

## دەوڵەتی سادە ( الدولة الموحدة )

لە دەوڵەتی سادەدا، یەك دەسەڵات هەیە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە تاکە کەسێ یان چەند کەسێ دەسەڵاتیان بە دەستەوە هەبێ، بەڵکو یەکێتی بیرو بۆچوون(تعبیر) سەبارەت بە دەسەڵات دەگەیەنێ، واتا یەکبوونی بیرو بۆچوون دەربارەی دەسەڵات. لەوەیە دەسەڵات دابەش ببێتە سەرچەند لایەنێکدا، بەڵام تەعبیر لەو دەسەڵاتە بە شێوەیەکی یەکگرتوو دەبێت. یەکبوونی دەسەڵات، یەکبوونی دەسەڵاتی یاسادانانی بە دوادا دێت، واتەیەك دەزگای یاسادانان کاروباری یاسادانان لە دەوڵەتدا بەڕێوە دەبات، یەکبوونی سەنتەری یاسادانان، یەکبوونی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی بە دوادا دێت، واتا یەك ئامێر هەموو دەوڵەت بە ڕێوە دەبات لە ڕووی ڕاپەڕاندنەوە.

لە دەوڵەتە سادەکاندا، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی یەکێکە، واتا ئامانج و بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەو دانیشتوانی دەوڵەت لە یەکەوە نزیکن و یەکن. هەر دەوڵەتێك ئامانج و بەرژەوەندییەکانی دانیشتوانی یەك بوون، ئەوە یەکبوونی پێك هاتەی کۆمەڵایەتی دەگەیەنێ. ئەمەش خاڵێکی گرنگە کە لە دەوڵەتی سادەدا بەرجەستە دەبێ.

---

ئەو بڕیارانەی کە نوێنەری دەوڵەتەکان دەریان دەکەن ، مەرج نیە بە کۆی دەنگەکان دەربچن ، لەوەیە ئەو بڕیارانە بە زۆرینەی دەنگەکان دەربچن ، لەم حاڵەتەدا ئەو دەوڵەتانەی کە دەنگیان بۆ بڕیارەکە نەداوە پێبەند نابن پێیەوە ؛ لە بەر ئەو خاڵانەی لە سەرەوە باسمان کرد ، حاڵەتی کۆنفیدرالی حاڵەتێکی لەرزۆکە ، ئەو دەوڵەتانەی کە لە یەککرتنێکی کۆنفیدرالیدا کۆ دەبنەوە لە ئەنجامدا یان لە دەوڵەتێکی فیدرالیدا کۆدەبنەوەو دەبنە دەوڵەتێکی فیدرالی ، یان هاوپەیمانی نێوانیان لە کۆنفیدرالیەتێکدا تێك دەچێ و پێکەوە بوونیان پێکەوە نامێنێ .

مەرج نییە لە هەموو دەوڵەتێکی سادەدا، یەك سیستەمی بەڕێوەبردن پەیڕەو بکرێ، ئەو دەوڵەتانەی هەرێمەکانیان کەم و بچوکن و یەکێتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی تیایاندا بەهێزەو پتەوە، ئەوە لە بەڕێوەبردندا، سیستەمی(ناوەندی) تیایاندا پەیڕەو دەکرێ. بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کە رووبەرەکانیان فراوان و هرێمەکانیان بەربڵاوون و یەکێتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی تیایاندا زۆر بەهێز نییە، هەرچەندە ئەو یەکێتییە دەبێ تارادەیەکی گونجاو هەر هەبێت، ئەوە سیستەمی (نانـاوەندی) تیایاندا پەیڕەو دەکرێ.

ئەو دەوڵەتانەی کە بە دەوڵەتی سادە دەژمێردرێن بەریتانیا، کە سیستەمێکی ناناوەندی بەربڵاوی تیادا پەیڕەو دەکرێ. فەرەنسا، کە تا رادەیەکی زۆر سیستەمی ناوەندی تیادا پەیڕەو دەکرێ، هەروەها، ئیسپانیا، پرتغال، بەلجیکا، هۆڵەندا، سوئێد، نەرویژ، دانیمارك و هەندێ وولاتانی ئەوروپایی و ئاسیایی و ئەمریکای لاتینی تر.

بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی سیستەمەکانی ناوەندی و ناناوەندی لە چوارچێوەی دەوڵەتی سادەدا، بە پێویستی دەزانین ئەو دوو بابەتە شیبکەینەوە.

## بەستی یەکەم:

## سیستەمی ناوەندی ( المركزية )

سیستەمی ناوەندی، واتا یەکبوونی دەسەڵات، ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە تاك رەوی لە دەسەڵاتدا هەبێ، یان چەند جەمسەرێك نەبێ بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات، یان چەند دەسەڵاتێك نەبێت و جیاوازی لە نێوان ئەو دەسەڵاتانەدا نەبێت لە دەوڵەتدا، دەسەڵاتی یاسادانان، راپەراندن، دادوەری، واتا چەند دەسەڵاتێکی جیاواز هەیە. بەڵام یەکبوونی دەسەڵات، یەکبوونی تەعبیر کردن لەو دەسەڵاتە دەگەیەنێ، واتا یەك دەزگای یاسادانان هەیە، کە یاسا و ریاسا بۆ هەموو ناوچەکانی دەوڵەت دەردەکات. هەروەها یەك دەزگای راپەراندن هەیە، کە هەموو کاروباری بەڕێوەبردنی دەوڵەت رادەپەڕێنێ بە شێوەیەکی هەرەمی لە سەرەوەی هەرەمەکەوە، کە لە سەرۆکی دەزگای راپەراندنەوە

دەست پێ دەکات(سەرۆك کۆمار، سەرۆك وەزیران).  تا دەگاتە وەزیرەکان، بەڕێوەبەرە گشتییەکان، بریکارەکان تا خوارەوەی هەرەمەکە، بەم شێوەیە ئاستی نزمتر لە ژێر کۆنترۆڵی ئاستێکی بەرزتردا دەبێت لە ڕووی بەرپرسیارێتییەوە.

لێرەدا دەسەڵات خۆی بریکارەکان و فەرمانبەرە گشتییەکان دادەنات و لایان دەبات.

هەروەها ناوەندیەت پێویستی بە یەکێتی پێك هاتەی کۆمەڵایەتی هەیە لە دەوڵەتدا، واتا هەبوونی بەرژەوەندی و ئامانجی هاوبەش لە نێوان هاووڵاتیانی دەوڵەتدا، لە ڕاستیدا هەبوون و نەبوونی ئەو یەکێتییە دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو و ڕادەی پێبەند بوونی هاووڵاتیان بەشتە تایبەتمەندەکانەوە وەکو: ئایین، ڕەگەز، ڕەنگ، ناتوانرێ باسی یەکێتی پێك هاتەی کۆمەڵایەتی بکرێ لە دەوڵەتێکدا خەڵکەکەی زۆر خۆیان گرێ دابێ بە بیرو باوەڕی ئایینی، ڕێچکەیی، ڕەگەزییەوە، لە کاتێکدا ئەو دەوڵەتە لە چەند ئایینێك، ڕەگەزێك  پێك هاتبێت. لە هەمان کاتدا پەیڕەوکردنی سیستەمی ناوەندی وەکو ئەنجام دەبێتە هۆی یەك بوون و زیاتر لەیەکتر نزیك بوونی عەقڵیەتی هاووڵاتیانی دەوڵەت و زیاتر یەککگرتنی کۆمەڵانی خەڵکی.

بە هەر حاڵ سیستەمی ناوەندی، واتا پەخش بوونەوەی دەسەڵات  لە ناوەندەوە بۆ هەموو ناوچەکانی دەوڵەت، کە بە شێوەیەکی هەرەمی پەخش دەبێتەوە لە سەرەوە بۆ خوارەوە، ئاستی خوارو لە ژێر کۆنترۆڵی بەرپرسی سەرەوەی خۆی کار دەکات.

### ـ لە ناوەندیەوە ( عنِ المرکزیة )

وەکو ڕوونمان کردەوە هەندێ لە دەوڵەتەکان ڕووبەرێکی پان و فراوانیان هەیەو پێك هاتەی کۆمەڵایەتی تیایاندا مامناوەندە، نە فرە بەهێزەو نە لاوازیشە، لێرەدا بەڕێوەبردنی کاروباری دەسەڵات لە لایەن ناوەندەوە بە شێوەیەکی ناوەندی، هەم لە توانای دەسەڵات بە دەرە، هەم بۆ خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی دەوڵەتیش نەگونجاوە، جا بۆیە دەسەڵاتی ناوەندی نوێنەری  تایبەتی خۆی لە ناوچە جیاجیاکاندا دادەنات، کە نوێنەرایەتی دەسەڵاتی ناوەندی دەکەن و لە ژێر ئیرادەی دەسەڵاتی ناوەندیدا دەبن و بارێکی تایبەتیان دەبێت و جیاواز دەبن لە گەڵ بریکارو فەرمانبەرە  ئاساییەکانی تری

دەوڵەتدا لە ڕووی(دانانیان، کۆنترۆڵ کردنیان، لادانیان). چونکە ئەرکی ئەوانە بە پلەی سەرەکی ڕامیارییە، کە هەڵدەستن بە تەرجەمەکردنی یاساو ڕیاساکانی دەسەڵاتی ناوەندی لەو ناوچانە، بەو شێوەیەی کە لە گەڵ بارودۆخی تایبەتی هەر ناوچەیەك لەو ناوچانە بگونجێ، لە ڕاستیدا لێرەدا دەسەڵات هەم لە ناوەندەوەیە، بەڵام لە بەر دووری و فراوانی هەرێمەکانی دەوڵەت، ناوەند ناتوانێ بە شێوەیەکی کاریگەرو ڕاستەوخۆ هەموو کاروبارەکان بە ڕێوەبەرێ، بۆیە نوێنەری دەوڵەت لە هەر ناوچەیەك یان هەرێمێك، لە ڕۆشنایی‌و لە چوارچێوەی یاساو ریاساکانی ناوەندا، لە ڕێگەی بڕیار دەرکردنەوە، چ بڕیارێ بێ پەیوەندی بە کۆمەڵی خەڵکەوە بێ(بڕیاری گشتی)، یان بڕیارێ بێ پەیوەندی بە تاکێکەوە بێ(بڕیاری تاکی). بە لە بەرچاوگردنی بارودۆخ و ڕەوشی تایبەتی ناوچەکە، کاروباری ناوچەکە بەڕێوە دەبات. لە گەڵ ئەوەشدا دەسەڵات هەر ناوەندیە، بەڵام لە حاڵەتی لە ناوەندیەوە کاروبارەکان باشتر بەڕێوە دەچن. دەڵێن: (ئەو چەکوشەی پێی لێ دەدرێ هەمان چەکوشە، بەڵام لە کاتی لە ناوەندیەوە دەسکەکەی کورت ترە)،واتا لێدانەکە بەهێزترو بە پێزتر دەبێ. نموونەی لە ناوەندنەوە،لە فەرەنسا نوێنەرەکانی دەوڵەت لە ئایەڵات و شارەوانیەکان هەن کە پێیان دەڵێن بەڕێخەر(متصرف) کە دەوڵەت لە پاڵ دەزگاکانی تری ئایەڵات و شارەوانییەکاندا دایانی ناوە، بۆ بەشداری کردنی ئەوان لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان لەو جێگایانە.

## بەستی دووەم:

## سیستەمی ناناوەندی ( اللامركزية )

لەبەر فراوانی ڕووبەری دەوڵەت و بە گرێبوونی کاروباری فراوانی دەوڵەت و هەبوونی هەرێمە جیاجیاکانی، کە هەریەك لەو هەرێمانە تایبەتمەندی خۆی هەیەو خەڵکی هەر هەرێمێك لەو هەرێمانە بەرژەوەندی هاوبەشی خۆیان هەیە، شێوازی لە ناوەندیەوە هاتە کایەوە وەك و نزیك بوونەوەیەك لە خەڵکی هەرێمە جیاجیاکان، بۆ بەڕێوەبردن و کاریگەر کردنی کاری بەڕێوەبردن لەو هەرێمانەدا. وەکو بینیمان لەبەر ئەوەی (لە ناوەندەوە)، نوێنەرانی دەوڵەت لە هەرێمەکاندا دەوڵەت خۆی دایان دەنات،

نوێنەرایەتی دەوڵەت دەکەن نەك خەڵکی ناوچەکان، بۆیە لە ڕاستی ئیرادە و پێداویستی خەڵکی ئەو ناوچانەوە دوورن، لەبەر ئەم هۆیانە سیستەمی ناناوەندی وەك و شێوازێکی گونجاو هاتە کایەوە، هەم لە لایەك یەکێتی دەوڵەت دەپارێزێ و دەوڵەت بەیەك پارچەیی دەمێنێتەوە، هەم کاروباری هەموو ناوچەکانی دەوڵەت و پێداویستی‌و ئارەزوی خەڵکی هەرێمە جیاجیاکان دەکرێنە یاساو ڕیاساو فەرمان و جێبەجێ دەکرێن بە شێوەیەکی هاوبەش لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و هەرێمە جیاجیاکاندا، یاساکانی دەوڵەت کاروباری هەردوو دەسەڵاتی ناوەندی و دەسەڵاتی هەرێمەکان دیاری دەکەن و ڕێکیان دەخەن.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە، هەرێمە ناناوەندییەکان دەبێ سەربەخۆیی داراییان هەبێت، واتا هەر هەرێمێك دەبێ پشت بە دارایی خۆی ببەسێت و بودجەی تایبەتی خۆی هەبێت، ئەمە مەرجێکی سەرەکیە بێ ئەم مەرجە، هیچ هەرێمێك ناتوانێ خۆی بەڕێوەبەرێ لە سەر شێوازی سیستەمی ناناوەندی. ئەگەر هات و هەر هەرێمێك پشت بە توانای دارایی دەوڵەت ببەستێت لە بەڕێوەبردنی کارەکان، ئەوە ناتوانێ ببێتە هەرێمێکی ناناوەندی.

وەکو ئاماژەمان پێ کرد، خەڵکی ناوچەکان یان هەرێمەکان بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان هەیە، کە هاوبەشە لە نێوانیاندا، ئارەزو و هەستی هەمە جۆریان هەیە، بۆیە بۆ ئەوەی هەر دەزگایەك یان دەسەڵاتێك دەبێ ڕەنگدانەوەی ئەو ئارەزو و هەست و پێداویستیانە بێت کە پەیوەندیان بە خەڵکی ناوچەکانەوە هەیە. باشترین گەرنتی بۆ ئەوەی دەزگا دەسەڵاتدارەکان لە ناوچەکاندا نوێنەرایەتی تەواوی خەڵکی ئەو ناوچانە بکەن دەبێ لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێن، واتا بەپێی پرۆسیسێکی دیموکراسیانە، دام و دەزگاکان دادەمەزرێن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پەیوەندییەکی توند و تۆڵ هەیە لە نێوان دیموکراسی و ناناوەندیدا. وەکو زانراوە بایەخ دان بە کاروباری وردەکاری خەڵکی و تەعبیر کردن لە ڕاو بۆچوونەکانیان و بایەخ دان بە هەست و ئارەزوەکانیان، پاراستن و تەرجەمەکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان، چ لەسەر ئاستی دەوڵەت و چ لە سەر ئاستی خەڵکی ناوچەکان، خۆی لە خۆیدا پرۆسیسی دیموکراسی دەگەیەنێ بەبێ دیموکراسی، یان

با بڵێین لە چوارچێوەی دکتاتۆریـەتدا ناناوەندیـەکی ڕاستەقینە وەك و پـەیڕەوکراوێکی بـەردەوام مومکـین نییـە. بـە هـەڵبژاردنی دەزگاکـانی هەرێمـەکان لـە لایـەن خـەڵکی ناوچەکانـەوە، پـەیوەندی ناوچـەکان بـە دەسـەڵاتی ناوەندییـەوە دەبێتـە پەیوەندییـەك لـە نێوان خەڵکی ناوچەکان و دەسەڵاتی ناوەندی، لەبەر ئەوەی دەزگاکانی هەرێمـەکان نوێنـەری خەڵکی ئەو هەرێمانەن، کە بەهەڵبژاردن دانراون لەلایەن خەڵکی ئەو هەرێمانەوە .

## سروشت و پلەی ناناوەندی : ـ

دەزگـا هـەڵبژێردراوەکان لەهەرێمـەکان، لەگـەڵ بریکارەکـانی دەوڵـەتدا چـەند جیاوازییەکیان هەیە لـە بـواری پەیوەندییسان لەگـەڵ دەسـەڵاتی نـاوەندیدا. چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی لەسەر دەزگا هەڵبژێردراوەکان دەبێ بەپێی یاسا بێ، واتـا یاسا ئـەو چاودێرییە دیاری دەکات ، واتا چاودێری نییە کاتێ یاسا باسـی لێوە نـەکات، چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی چاودیرییـەکی تـاك وتـەرا کارانەیـە ( أستثنائی ) بـواری تایبـەت و جموجوڵی تایبەت دەگریتەوە، هەروەها دەسەلاتی ناوەندی فـەرمان و ڕاسپاردەی پیش وەختە ئاراستەی دەزگاکانی ناوچـەکان ناکـات ، بـەڵام بریکارەکـانی دەوڵـەت لـە ناوچـە گەڕەکییـەکاندا ( هەرێمـەکان ) ، چـاودێری دەکرێـن لەلایـەن دەسـەڵاتی ناوەندیـەوە بەشێوەیەکی بەردەوام تەنانەت ئەگەر یاساش باسی لێوەنەکات، هەموو کاروبارەکانیـان دەکەوێتـە ژێـر چاودێرییـەوە، هـەروەها دەسـەڵاتی نـاوەندی بـۆی هەیـە ئاراسـتەی پێشوەختەی بریکارەکـان بکـات لـەڕێگای دەرکردنـی ڕاسپاردەو فەرمانـەوە، بـەپێی ئـەم بەراوردکردنـە لـەنێوان دەزگـا هـەڵبژێردراوەکانی هەرێمـەکان لـە گـەڵ بریکارەکـانی دەوڵەتدا، بۆمـان دەردەکـەوێ کـەدەزگا هـەڵبژێردراوەکان حوکمڕانـن بـەڵام حوکمڕانـی لاوەکـین، لـە پاڵ حوکمڕانـە ناوەندییـەکاندا کاردەکـەن، ئـەرکی سەرشانی ئـەوان کـەم دەکەنـەوە، بـەڵام بەهـەر حـاڵ حوکمڕانـی لاوەکـین، بۆیـان هەیـە سـوود لـەتواناکانی دەسەڵاتی ناوەندی وەرگرن لەکاتی پێویستدا.

وەکو باسمان کرد لە دەوڵەتدا لـە پاڵ دەسـەڵاتی نـاوەندیدا کـە بـاڵ بەسـەر هـەموو ناوچەکانی دەوڵەتدا دەکێشێ، دەسەڵات یان حوکمڕانـی لاوەکی هـەن، کـە بـە بەشداری

دەسەڵاتی ناوەندی ناوچەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن، ئەو تایبەتکاریانەی کە حوکمڕانە لاوەکییەکان هەیانە لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆڕێ، لەوەیە بگۆڕێ لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر لە هەمان دەوڵەتدا، یاساکانی دەوڵەت کاروباری ئەو ناوچانەو ئەو تایبەتکارییانەی بەدەزگاکانی ناوچەکان دراون دیاری دەکەن، کە هەندێ جار دەسەڵاتی حوکمڕانەکانی هەرێمەکان زۆرو بەربلاوە، تاڕادەیەك دەگاتە لێواری فیدرالی. بەلام هەندێ جاریش تایبەتکارییەکانی ئەو ناوچانە سنووردارو لەقەوارە دراون، بە هەر حاڵ پلەی ناناوەندی لە دەوڵەتدا پەیوەندی نێوان ناوچەکان و دەسەڵاتی ناوەندی دەری دەخات، هەروەها ڕادەی کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکان لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە. ئەگەر چاودێریو دەستێوەردانی دەسەڵاتی ناوەندی لەسەر هەرێمە ناناوەندییەکان بەرفراوان بووشەوە دەسەڵاتی ناوچە ناناوەندییەکان لاوازە، بەلام ئەگەر هاتوو زۆربەی کاروباری هەرێمەکان لە لایەن خەڵکی ئەو هەرێمانەوە بەڕێوە بران لە گەڵ دەستێوەردان و چاودێرییەکی کەمی دەسەڵاتی ناوەندی، ئەوە ئەو هەرێمانە لەئەوپەڕی پلەی ناناوەندییەتدا دەژین ونزیك دەبنەوە لە فیدرالی .
لەڕۆشنایی ئەم باسەی سەرەوەماندا بەپێویستی دەزانین بەشێوەیەکی فراوان باسی دوو جۆری ناناوەندی بکەین، جۆرێکیان لە فەرەنسا پەیرەو دەکرێ لە سەر ئاستی ئایەلاتەکان و شارەکان کەپێی دەڵێن(ناناوەندی کلاسیکی)، ئەوەی تریانیش لە ئیتالیا پەیرەو دەکرێ کەپێی دەڵێن(هەرێمایەتی ڕامیاری).

## یەکەم : ناناوەندی کلاسیکی :ـ

سیستەمی ناناوەندی کلاسیکی لە فەرەنسا بەدی دەکرێ، لە سەر ئاستی ئایەلاتەکان و شارەوانییەکان :

**١- ئایەلاتەکان (اللواء) ( Le Departement ) :**

ئایەلاتەکان وەکو چەند ناوچەیەکی ناناوەندی هەر یەکەو دوو دەزگای تێدایە:_ أ_ کۆنسەی ئایەلات ، ب_ بەڕێخەر (متصرف).

أ ـ کونسەی (ئەنجومەن) ئایەلات( Le conseil Genreral )

ئەم دەزگایــە بــە شــێوەیەکی ڕاســتەوخۆ لــە لایــەن خــەڵکی ئایەڵاتەکانــەوە هـەڵدەبژێردرێ و هـەر ئایـەڵاتێك لـە وولاتـی فەرەنسا کۆنسەی خـۆی هـەڵدەبژێرێت ، بڕیارەکانی کۆنسەی ئایـەڵات تایبەتـە بـە کاروبـاری ئایەڵاتـەوەو جێبـەجێ دەکـرێ بـێ ئـەوەی پێویستی هـەبێ بـە ڕەزامـەندی پێشوەختەی دەسـەڵاتی نـاوەندی، تەنـها لـەو حاڵەتانەدا نەبێ کە یاسا بە ئاشکرا بیسەپێنێ. یـەکێ لـەو حاڵەتانـەش کـە بڕیارەکانی کۆنسـەی ئایـەڵات جـێ بـەجێ نـاکرێن پێـش ڕەزامــەندی دەسـەڵاتی نـاوەندی ئـەو بڕیارانەیە کە پەیوەندی دارن بە کارو بارە داراییەکانەوە. وەکو ئامـادەکردنی بودجـەی ئایەڵات و خستنە ڕووی قەرز ، کە دەبێ ڕزامەندی دەسلاتی ناوەندییان لەسەر بێ ، بـە شێوەی ڕێ و ڕەسمێـك دەردەچێـت لـە لایـەن سـەرۆك کۆمـارەوە ، یـان بـە بڕیـارێکی وەزاری. هەروەها بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئایەڵات ڕووبەڕووی هەڵوەشاندنەوە دەبنـەوە لەم دوو حاڵەتەدا : ـ

ـ کاتـێ کۆنسـەی ئایــەڵات بڕیـار دەربکـات بـە پێچەونـەی سیسـتەم و یاسـاکانی دەسەڵاتی ناوەندیەوە بێ. ئەو بڕیارانە هەڵدەوشێنرێنەوە لە بەر ئەوەی ناڕەوان (عدم المشروعیە) ، بە ڕێ و ڕسمێك (مرسوم) لە لایەن سەورۆك کۆمارەوە دەردەچێت ، پاش ڕاوێژکاری لە گەڵ ئەنجومەنی دەوڵەتدا ، لە سـەر داواکاری بەڕێخەر (متصرف) ، واتا بەڕێخەر داوا لە سەرۆك کۆمار دەکات بڕیارە ناڕەواکـە هەڵوەشـێنێتەوە ، ئـەویش پاش ڕاوێژکاری لـە گـەڵ کۆنسـەی (ئەنجومـەن) دەوڵـەتدا بـەڕێ وڕەسمێـك بڕیارە ناڕەواکـە هەڵدەوەشێنێتەوە.

ـ کاتـێ کۆنسـەی ئایـەڵات بڕیــار وەربگــرێ لـە دەرەوەی تایبەتکارییــەکانی خـۆی (خارج اختصاصاته) ، یان بڕیار دەربکات لە دەرەوەی دانیشتنەکانی یاسایی خۆی ، ئـەم بڕیارانە لە لایەن بەڕێخەرەوە (متصرف) هەڵدەوشێنەوە بە بڕیـارێکی هۆکارانـە (قـرار مسبب). واتا دەبێ بەڕێخەر لە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەکەدا هۆکەیشی دیاری بکات.

ب ـ بەڕێخەر (متصرف) :

بەڕێخەر دەزگایەکە دانراوە لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە، بریکاری ڕاستەوخۆی دەسەڵاتی ناوەندیە، جگە لەو کارانەی کـە بەڕێخـەر پێیـان هەڵدەسـێ و لـە بابەتەکـەی

سەرەوەماندا باسمان کرد، هەڵدەسێ بە جێبەجێ کردنیئەو بڕیارانەی کە کۆنسەی ئایەڵات دەریان دەکات.

١- شارەوانی (Le municipal) : ـ دەزگاکانی شارەوانی پێك هاتوون لە :

ـــ ئەنجومەنی شارەوانی، کە ئەندامەکانی ڕاستەوخۆ لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن .

ـ سەرۆکی شارەوانی و یاریدەدەرەکانی کە لە لایەن ئەنجومەنی شارەوانییەوە هەڵدەبژێردرێن.

ـ نوێنەری دەسەڵاتی ناوەندی کە پێی دەڵێن بەرێخەر (متصرف).

ئەنجومەنی شارەوانی بۆ بەڕێوەبردنی شار بڕیار دەردەکات ، ئەو بڕیارانە ڕاستەوخۆ جێبەجێ دەکرێن تەنها لەو حاڵەتانەدا نەبێ کە یاسا دەیان بەستێتە بڕوا پێدانەوە لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە، ئەنجومەنی شارەوانی دەنگ دەدات سەبارەت بە بودجەی ساڵانە، کە لە لایەن سەرۆکی شارەوانییەوە ئامادەو جێبەجێ دەکرێت، هەڵدەسێ بە ڕێکخستنی کاروباری فەرمانبەرانی شارەوانی ، دەسەڵاتی پۆلیسی پێ دراوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی، کارو بارەکانی بەڕێوە دەبات لە ڕێگای دەرکردنی بڕیارە گشتی و تایبەتییەکانەوە (قرارات فردیة و عامة) ، بوودجەی ساڵانە ئامادە دەکات و دیخاتە بەردەم ئەنجومەنی شارەوانی بۆ دەنگدان لە سەری ، هەر خۆی ئەو بودجەیە جێبەجێ دەکات. پەیوەندی لە گەڵ دەسەڵاتی ناوەندی زۆرجار لە ڕێگەی بەرێخەرەوە ئەنجام دەدرێت ، بەرێخەر (متصرف) بۆی هەیە بڕیارەکانی سەرۆکی شارەوانی هەڵبوەشێنێتەوە ، ئەگەر هاتوو ئەو بڕیارانە ڕەوا نەبوون ، یان گونجاو نەبوون لە گەڵ سیستەم ویاساکانی دەسەڵاتی ناوەندیدا ، بۆی هەیە بڕیارەکانی سەرۆکی شارەوانی بەتاڵ بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر ڕەوایش بن ، ئەمە ئەو بڕیارانە دەگرێتەوە کە پەیوەندیان بە دەسەڵاتی پۆلیسیەوە هەیە، بەرێخەر بۆی هەیە خۆی هەڵسێ بە ئەنجامدانی کاری پێویست بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی دەسەڵاتی ناوەندی ، ئەگەر سەرۆکی شارەوانی جێبەجێیان نەکات یان کەم تەرخەمی بکات لە جێبەجێ کردنیان ، هەروەها دەسەڵاتی ناوەندی بۆی هەیە سەرۆکی شارەوانی لابدات و دەستی لەکار بکێشێتەوە، بۆ لادانی پێویستە ڕێ ورەسمێك لە سەرۆك

وەزیرانـــەوە دەربچێــت.بــەڵام پەیوەندییــەکانی ئەنجومــەنی شــارەوانی بـــە دەســـەڵاتی ناوەندییەوە لەچەند ڕوویەکەوە بەدەر دەکەوێت ، ئەو بڕیارانەی کە ئەنجومەنی شارەوانی دەریان دەکات و پەیوەندیان بە باری دارایی‌یەوە هەیە دەبێ بڕوایان پێ بدرێت لە لایەن نوێنەری دەسەڵاتی ناوەندییەوە ـ بەڕێخەر (متصرف) ، هەندێ جاریش لە لایەن سەرۆك وەزیران یان وەزیری ناوخۆوە، بەڕێخەر دەتوانێ جێگای ئەنجومەنی شارەوانی بگرێتەوە لە کاتێکدا ئەگەر دەنــگ نــەدات بــۆ بودجەیــەکی هــاوکێش یــان نــەتوانێ پەککــەوتویی (عجز)بودجە پڕ بکاتەوە، ئەوە ئەو کاتە بەڕێخەر ئەم شتانە ئەنجام دەدات . بەڕێخەر دەتوانێ بڕیارەکانی ئەنجومەنی شارەوانی هەڵوەشێنێتەوە ئەگەر هاتوو ئەو بڕیارانە بە پێچەوانەی سیستەم و یاساکانی دەسەڵاتی ناوەندییــەوە بــوون ، یــان بڕیارەکــان لــە کــاتی خولەکانی دانیشتنی ئەنجومەندا وەرنــەگیرابوون یــان لــە چوارچێــوەی تایبەتکارییــەکانی ئەنجومەندا نەبوون یان لە ژێر کاریگەری یەکێ لە ئەندامانی ئەنجومەندا وەرگیرابوون، بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندی کەسێتی. لێرەدا بەڕێخەر ئەو بڕیارانە پوچەڵ دەکاتــەوە بــە بڕیاری خودی خۆی ، یان لە سەر داواکاری کەسێك بەرژەوەندی تێدا هەبێت، لە بڕیاری پوچەڵ کردنەوەکەدا هۆیەکانی بەیان دەکرێــن ، دەســەڵاتی نــاوەندی بــۆی هەیــە بــە ڕێ وڕەسمێکی هۆکارانەی سەرۆك وەزیران ئەنجومەنی شارەوانی هەڵوەشێنێتەوە.(بۆ نموونــە نــاکۆکی نێــوان ئەنجومــەنی شــارەوانی و ســەرۆکەکەی ، کــە کــار بکاتــە ســەر کاروبــاری ئەنجومەن)دەبێ لەو ماوەیەدا لێژنەیەك پێك بێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شارەوانی تا هەڵبژاردنێکی تازە دەکرێت لە ماوەی دوو مانگدا.

## دووەم : هەرێمایەتی ڕامیاری (الاقليمية السياسية)

ئەم هەرێمانە لە وڵاتــدا جۆرە سیستەمیکیان تێدا پەیڕەو دەکرێ کە باشترین نموونەی ناناوەندی‌یە، تا ڕادەیەك لە سیستەمی فیدرالیەوە نزیــك دەبێتــەوە، نموونــەی هەرێمایــەتی ڕامیــاری لــە ئیتالیــا دەبینینــەوە. هەرێمــەکانی ئــەم دەوڵەتـــە چـــەند دەزگایەکیان تێدایە، کــە کاروبــاری هــەرێم بــەڕێوە دەبــەن: دەزگای یاسادانان ، دەزگای ڕاپەڕاندن (جۆنتا) ، سەرۆکی دەزگای ڕاپەڕاندن (سەرۆکی جۆنتا) ، نوێنەری دەسەڵاتی

ناوەندی (مندوب) ، کە لە پایتەختی هەرێم دادەنیشێ. پەیوەندییەکی بتەو و دەستێوەردانێکی زۆر هەیە لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە بەرانبەر ئەو دەزگایانە لە چۆنیەتی دامەزراندنیانەوە تا بەڕێوەبردنی کارەکانیان. هەرچەندە دەزگای یاسادانان لە لایەن خەڵکی هەرێمەکەوە هەڵدەبژێردرێ ، دەزگای ڕاپەڕاندن و سەرۆکەکەی لە لایەن دەزگای یاسادانانەوە هەڵدەبژێردرێن ، ئەنجومەنی هەرێم مافی یاساو سیستەم دانانی هەیە ، سەرۆکی دەزگای ڕاپەڕاندن پاش دانانی یاساو سیستەمەکان لە لایەن ئەنجومەنی هەرێمەوە، هەڵدەسێ بە دەرکردنی (أصدار) ئەو یاسا و سیستەمانە، کە ئەرکە بەڕێوبەرایەتیەکان بەڕێوە دەبەن (يدير الوظائف الادارية). بەڵام دەسەڵاتی ناوەندی ڕۆڵێکی باش دەبینێ لە کاروباری ئەو هەرێمانە، سیستەمی بناغەیی هەرێمەکان پاش پەسەند کردنیان لە لایەن زۆرینەی ڕەهای ئەنجومەنی هەرێمەکانەوە، دەبێ پەرلەمانی ئیتالیا بە یاسا ڕەزامەندییان لە سەر بکات ، دەبێ ئەو سیستەمە بناغەییيانە گونجاو بن لە گەڵ دەستوورو یاساکانی کۆماری ئیتالیادا. ئەمەو نوێنەری یان نێردراوی دەسەڵاتی ناوەندی (مندوب) لە پاڵ دەزگاکانی هەرێمدا هاوکاری کاروباری بەڕێوەبردن لە هەرێمەکەدا دەکات ، لە گەڵ کاروباری دەسەڵاتی ناوەندیدا ڕێکیان دەخات. ئەو یاسایانەی کە لە لایەن ئەنجومەنی هەرێمەوە دادەنرێن دەبێ بە فیزەی (تأشيرة ـ Visa) نێردراوی دەسەڵاتی ناوەندی دەربچن ، ئەمەو ئەو یاسایانەی کە لە لایەن دەزگای یاسادانانەوە دەردەچن ، ئەگەر دەسەڵاتی ناوەندی بینی زیادەڕەویە لە تایبەتکارییەکانی (أختصاصات) هەرێم ، یان زیان بە بەرژەوەندی گشتی ، یان بە بەرژەوەندی هەرێمەکان دەگەیەنن ، ئەو کاتە دەتوانێ بیانگێڕێتەوە بۆ ئەنجومەنی هەرێم بۆ سەر لە نوێ چاوپیاخشاندنەوەیان. ئەگەر ئەنجومەن داکۆکی لە سەر یاسا دانراوەکە کرد بە زۆرینەی ڕەهای دەنگەکان ، ئەو کاتە بۆی هەیە ئەو یاسایە بداتە دادگای دەستووری باڵا(المحكمة الدستورية العليا) بۆ چاوپیاخشاندنەوە بە ڕەوایەتی یان ناڕەوایەتی بڕیارەکە، یان دەیخاتە بەردەم ئەنجومەنکانی یاسا دانان لە کۆماری ئیتالیا بۆ هەڵسەنگاندنی لە ڕووی گونجاوی یان نەگونجاوی ئەو یاسایە، ئەگەر هاتوو گومان هەبوو لە کام لەو دوو دەزگا تایبەتە بە بڕیاردان بۆ چاوپیاخشاندن بە

ڕەوایی یان ناڕەوایی لە سەر چارەنوسی یاسا دانراوەکە، ئەوە دادگای دەستووری باڵا بڕیار لە سەر ئەو بابەتە دەدات ، واتا ئەو لایەنە دیاری دەکات بڕیار لە سەر چارەنوسی ئەو یاسایە بدات کە لە ئەنجومەنی هەرێمەوە دەرچووە و گومان هەیە لە لادانی لە تایبەتکاریەکانی (اختصاص) هەرێم، یان بە لادانێکی زەق دادەنرێ لە بەرژەوەندی دەوڵەت یان هەرێمەکانی تر.هەروەها دەستوری ئیتالیا مافی داوەتە دەسەڵاتی ناوەندی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی هەر هەرێمێك لە هەرێمەکان لە کاتێکدا ئەگەر هاتوو زۆربەی ئەندامەکانی وازیان هێنا ، یان زۆرینەی ڕەهای تێدا دروست نەبوو لە کاتی دەنگداندا، یان ئەنجومەنی هەرێم هەڵسا بە سەرپێچی کردنی دەستوور، یان شکاندنێکی ترسناکی یاساکانی کۆمار، یان بوو بە هەرمەترسییەك لە سەر ئاسایشی نەتەویی ، هەروەها ئەگەر داواکرا لە ئەنجومەنی هەرێم (جۆنتا و سەرۆکەکەی) بەلاوەبخات، کاتێك ئەگەر جۆنتا و سەرۆکەکەی سەرپێچی دەستوور بکەن یان هەڵسن بە شکاندنێکی ترسناکی یاساکان ، دەبێ هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی هەرێم بە بڕیارێکی هۆکارانە دەربچێت لە سەرۆك کۆمارەوە، واتا سەرۆك کۆمار بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی هەرێم دەدات و تیایدا هۆی ئەو بڕیارە دیاری دەکات ، لەو ماوەیەدا سەرۆك کۆمار بە ڕاوێژکاری چەند پسپۆرێك لە بواری هەرێمەکاندا لە نێوان ئەندامانی ئەنجومەنی (پیران و نوێنەران) هەڵدەسێ بە دانانی گروپێك کە لە سێ کەس پێك هاتبێ (لەو کەسانەی کە مافیخۆپاڵاوتنیان هەیە لە ئەنجومەنی هەرێمدا). ئەم گروپە هەڵدەسێ بە کاروباری هەرێمەکە تا هەڵبژاردنێکی نوێ ، کە دەبێ لە ماوەی سێ مانگدا ئەو هەڵبژاردنە ئەنجام بدرێت.

لە کۆتایید بۆمان دەردەکەوێ ، کە دەوڵەت لەوەیە ناوەندی بێ ، یان ناناوەندی ، لە بەر ئەوە پەیڕەوکردنی یەکێ لەو سیتەمانە (ناوەندی ، ناناوەندی ) پەیوەندی بە کارو باری بەڕێوەبردنی دەوڵەتەوە هەیە و پەیوەندی بە دیاریکردنی جۆری دەوڵەتەوە نیە.

## باسی دووەم
## دەوڵەتی فیدرالی

ئەم باسەمان دەکەین بە دوو بەستەوە، لە بەستی یەکەمدا باسی چەمکی دەوڵەتی فیدرالی دەکەین و لە بەستی دووەمدا باسی چەند نموونەیەك دەربارەی دەوڵەتی فیدرالی (دەوڵەتی فیدرالی لە جێبەجێکردندا)دەکەین.

### بەستی یەکەم:
### چەمکی دەوڵەتی فیدرالی
#### یەکەم : چەمکی دەوڵەتی فیدرالی :ـ

زاراوەی فیدرالیزم (Federalism) ، هاوپەیمانێتی ، کۆمەڵە ، یەکێتی لە نێوان دوو لا، یان زیاتر دەگەیەنێ ، هەرچەندە لە ڕاستیدا زاراوەکە زاراوەیەکی تەم و مژاویە. بە هەر حاڵ لە دەوڵەتی فیدرالیدا ، چەند دەوڵەتۆکەیەك ، یان چەند هەرێمێك پێکەوە کۆ دەبنەوە ، لە هەندێ کارو باردا دەچنە ژێر ڕکێفی یەك دەسەڵاتەوە (دەسەڵاتی فیدرالی) ، لە هەندێ کاروباری تردا دەسەڵاتی تایبەتی خۆیان هەیە، لە هەمان کاتدا یەك دەوڵەت پێك دەهێنن لە ڕووی ڕامیاری و یاساییەوە. ئەمەو هەندێ بیرو بۆچوون هەیە دەربارەی دەوڵەتی فیدرالی :[1]

ـ د. محەمەد هەمەوەندی لەو بڕوایەدایە کە دەوڵەتی فیدرالی (( یەك دەوڵەتە، لە چەند کیانێکی دەستووریی جۆراوجۆر پێك دێ کە هەر یەکێکیان سیستەمی یاسایی تایبەت و سەر بەخۆی خۆی هەیە، هەمووشیان ملکەچی دەستوری فیدرالین ، کە بە پێکەوەنەر و ڕێکخەری پێکهاتنە یاسایی وڕامیاریەکان دەژمێردرێ و سەرەنجام ،

---

(١) بڕوانە : سەیوان کاکە ڕەش ـ سیاسەتی دەولی ـ ژمارە ٢ ساڵی سێیەم (١٩٩٤) ـ ل١١٧

دەوڵەتی فیدرالی ڕژێمێکی دەستووری و ڕامیاری ئاوێتەیە)). ـ هەر لەم بارەیەوە ئەندرێ هۆریۆ وتویە: (( فیدرالیزم شەریکایەتی چەند دەوڵەتێکە کە لەگەڵ یەکتریدا پەیوەندییەکی

یاسایی ناوخۆییان هەیە، واتا هەموویان پێکەوە یاسایەکی دەستووریيان هەیە کە دەوڵەتێکی باڵا لە سەروی دەوڵەتە بەشدارەکان دادەمەزرێنێ )).

ـ یاسازان دیوراند دەڵێ (( ڕژێمی فیدرالی چوارچێوەی یاسایی دیاردەیەکی ڕامیاریە )).

ـ د. ئیسماعیل غەزالیش دەوڵەتی فیدرالی بەم جۆرە دەناسێنێ: ((دەوڵەتی فیدرالی کۆمەڵە دەوڵەتێکە لە سەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە دەوڵەتێکی ناوەندی دادەمەزرێنن. سیستەمە دەستووریيە سەربەخۆکەی ئەم دەوڵەتە بە سەر سیستەمە دەستوورییەکانی دەوڵەتە ئەندامەکاندا زاڵ دەبێ )).

پەیدا بوون و هاتنەکایەوەی دەوڵەتی فیدرالی پێویستی بە زەمینە و هەل و مەرجی گونجاو هەیە ، بارودۆخ و ڕەوشی ڕامیاری و دیرۆکی و کۆمەڵایەتی دەیسەپێنێ. بۆ نموونە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێش سەربەخۆبوونی ، لە چەند هەرێمێکی لە یەك جودا پێك هاتبوو لە ژێر داگیرکاری بەریتانیدا بوون. بەڵام پاش ڕزگار بوونی ئەو هەرێمانە، ساڵی (١٧٨٧ز) لە کۆنفرانسی فلادلفیا بڕیاریاندا لە دەوڵەتێکی فیدراڵدا کۆ ببنەوە و دەوڵەتی فیدرالی ئەمریکا پێك بهێنن.

هەروەها زۆری و پەرش و بڵاوبوونەوەی ڕووبەری زەمینەی دەوڵەت و جیاوازی زمان و ئایین لە نێوان ئەو دانیشتوانەدا چەند هۆیەکن بۆ سەپاندنی دەوڵەتی فیدرالی ، نموونە بۆ ئەم حاڵەتەش هند و کەنەدا و هەندێ ووڵاتی دیکەی ترە.

کۆمەڵ بوون و یەکگرتن ، پێویستیەکە پەنای بۆ دەبرێ ، چونکە هەرێمێك یان دەوڵەتێکی بچووك بەتەنها زۆر شتی پێ ناکرێ و ناتوانێ بەرژەوەندیەکانی بپارێزێ و گەشە بەو بەرژەوەندیانە بدات.بۆ نموونە هەرێمێك لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، ئەگەر یەکگرتن نەبوایە، توانای بەرگریکردنی لەخۆی لاواز دەبوو ، نەیدەتوانی ببێتە خاوەنی ئامرازی جەنگی پێشکەوتو و مۆدێرن. سەرمایەو پیشەسازی

و بازرگانی لە چواچێوەی بازاڕێکی تەسکدا بەڕێوە دەچوو ، لە کاتێکدا هەندێ جم وجۆڵی ئابووری هەن لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا سنووری دەوڵەتیش دەبەزێنن و لە سەر ئاستی جیهانیدا مامەڵەیان لە گەڵدا دەکرێ.هەروەها پێشکەوتنی تەکنەلۆجی و ململانێی تەکنەلۆجیا لە نێوان دەوڵەتەکاندا وای کردووە، کە هەرێمێك بە تەنها ناتوانێ ڕووبەڕووی ئەو ململانێیە ببێتەوە. بەڵام بە یەکگرتن ، ئێستا ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خاوەنی هێزی سەربازی وڕامیاری و ئابووری بەرچاوە لە جیهاندا ، کە ئەو هێز و توانایە هی هەموو هەرێمەکانەو بە قازانجی هەموو هەرێمەکان دەگەڕێتەوە.

## دووەم : دیاردەکانی دەوڵەتی فیدرالی

١.دەوڵەتی فیدرالی کەسایەتی نێودەوڵەتی هەیە ، بەشداری دەکات لە دانانی ڕیاسا(القواعد) نێودەوڵەتیەکان لە ڕێگای ئەو پەیمانناماانەی کە لە گەڵ دەوڵەتەکانی تردا دەیبەستێ. هەر خۆی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی دەکەوێتە ئەستۆ. بەڵام هەرێمەکان هیچ لەم مافانەیان نییە، نە دەتوانن مامەڵە لە گەڵ دەوڵەتان بکەن ، نە کەسایەتی نێودەوڵەتییان هەیە،

نە بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتییان دەکەوێتە ئەستۆ.

٢.لە دەوڵەتی فیدرالیدا گەلی دەوڵەت دەبێ هەموو یەك پێناسە هەڵگرن وهەموو لە ژێر یەك ئاڵادا بن کە ئاڵای دەوڵەتی فیدرالییە.هەرچەندەلەوەیە هەر یەك لەو هەرێمانە پێناسە، یان ئاڵا ، یان هەرنیشانەیەکیتایبەتیبەخۆیهەبێ،بەڵام لەچوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتی گشتی (القانون الدولی العام)و یاسای نێودەوڵەتی تایبەتدا (القانون الدولي الخاص)، هیچ بایەخێکی پێ نادرێ. لەم ڕوانگەیەوە هەرکەسێك نیشتەجێی هەر هەرێمێك بێت بەهاووڵاتیو گەلی دەوڵەت نازمێردرێ، ئەگەر پێناسەیدەوڵەتی فیدرالی پێ نەدرێ ، گەلی دەوڵەتی فیدرالی کە هەڵگری یەك پێناسەن ، بەو شێوەیە دیاردەکەون لە بەردەم جیهانی دەرەوەدا.

٣. بەهەموو هەرێمەکانی دەوڵەتی فیدرالیەوە، یەك هەرێم پێك دەهێنن ، ئەو هەرێمەش ، هەرێمی دەوڵەتی فیدرالیە و قەوارەی نێودەوڵەتی هەیە. بەڵام هەرێمی

ولایەتەکان ـ کانتۆنەکان بەشێکن لە هەرێمی دەوڵەتی فیدرالی و هیچ قەوارەیەکی نێودەوڵەتییان نییە.

٤. لەدەوڵەتی فیدرالیدا دەستووری دەوڵەتی فیدرالی هەیە، کە کاروباری هەموو وولات ڕێکدەخات.لەپاڵ دەستووری دەوڵەتی فیدرالیدا، دەستوورەکانی هەرێمەکان هەن کە لەوەیە دەستووری وولایەتێك (هەرێمێك) جیاواز بێت لە گەڵ دەستووری هەرێمێکی تردا ، بەڵام نابێ دەستووری هیچ وولایەتێك لە وولایەتەکانی دەوڵەتی فیدرالی گونجاو نەبێت یان بە پێچەوانەی دەستووری دەوڵەتی فیدرالییەوە بێت.

جگە لەو دیاردانەی دەوڵەتی فیدرالی و لە بەر گرنگی دیاردەی دووانەی دەسەڵات و دووانەی دەزگای یاسادانان لە دەوڵەتی فیدرالیدا بە پێویستی دەزانین بە درێژی باسی ئەو دوو بابەتە بکەین. هەروەها ئاماژە بەوەش دەکەین کە دەوڵەتی فیدرالی لە ولایەتەکان بەهێزترە.

## دووانەی دەسەڵات لە دەوڵەتی فیدرالیدا :

لە دەوڵەتی فیدرالیدا دوو دەسەڵات هەیە. دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدرالی ، کە پەیوەندی بە هەموو دانیشتوانی دەوڵەتی فیدرالییەوە هەیە و یاساکان و سیستەمەکانی دەسەڵاتی فیدرالی لە هەموو ناوچەکانی دەوڵەتدا کاریان پێ دەکرێ و پەیڕەو دەکرێن ، بێ ئەوەی هەبوونی هەرێمەکان یان ناوچەکان ببنە کۆسپ لە بەردەم ئەو یاساو سیستەمانەدا و زیاد لەوەش دەبێ دەسەڵاتی هەرێمەکان ، ڕێاساو فەرمان داڕێژن و دەربکەن بۆجێبەجێ کردنیان. دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدرالی ، هەڵدەسێ بەو کارو ئەرکانەی کە شێوەیەکی گشتگیریان پێوە دیارە و پەیوەندییان هەیە بە ڕەوشی گشتی ئاسایش و باری ئابووری و پەیوەندیەکانی دەوڵەتی فیدرالی لە گەڵ دەوڵەتانی تردا. هەروەها ئەرکی بەرگری ، دروست کردن و دانانی پەیوەندی ، بەستنی بەڵێنکاری ، دانانی کۆنسڵ و نوێنەری دەوڵەت لە دەوڵەتان و کۆڕ کۆمەڵە نێودەوڵەتییەکان. ئەمەو دەسەڵاتی فیدرالی پێك دێت لە : ـ

ـ دەزگای یاسادانان : ــ ئەم دەزگایە لە دوو ئەنجومەن پێك دێ یەکێکیان نوێنەرایەتی هەموو وڵات دەکات، ئەوی تریان نوێنەرایەتی ناوچەکان دەکات.

ـ دەزگای ڕاپەڕاندن : ــ پێك دێت لە سەرۆك کۆمار ، یان سەرۆك وەزیران بە گوێرەی سیستەمی پەیڕەو کراو لە دەوڵەتدا.

ـ دەزگای دادوەری : ـ کە زۆر جار پێی دەڵێن دادگای فیدرالی باڵا.

بەڵام دەسەڵاتی هەرێمەکان لە لایەن خەڵکی هەرێمەکانەوە پێکەوە دەنرێن بەگوێرەی سیستەمێك، کەدەبێ گونجاو بێ لەگەڵ دەستووری فیدرالید، ئەو دەزگایانە، دەزگاکانییاسادانان وڕاپەڕاندن ودادوەریدەگرنەوە. بەڵام لەڕاستیدا ئەو کارو ئەرك وجموجوڵانەی کە هەریەك لە دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدرالی و دەسەڵاتی هەرێمەکان پێیان هەڵدەسن، بە پێی ڕێگایەك لەو سێ ڕێگایەی کە لە ئارادان ڕێك دەخرێن ، ئەو ڕێگایانەش ئەمانەن :ـ[1]

**ڕێگای یەکەم** ـ دەستوور و یاساکانی دەوڵەتی فیدرالی ئەو ئەرك و کارانە دیاری دەکەن کە هەر یەك لە دەسەڵاتی هەرێمەکان پێیان هەڵدەسێ، واتا دەستوور و یاساکان بە شێوەیەکی تەنراو ( حصر ) کارو ئەرکی هەردوو دەسەڵاتی فیدرالی و دەسەڵاتی هەرێمەکان دیاری دەکەن، ئەو کارو ئەرکانە دیاری دەکەن کە دەسەڵاتی فیدرالی پێیان هەڵدەسێ ، ئەو کارو ئەرکانەش دیاری دەکەن کە دەسەڵاتەکانی هەرێمەکان پێیان هەڵدەسێ. بەڵام ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی پراکتیکی (عملی) نییە لە بەر ئەوەی کاروبارو باری نوێ دێنە کایەوە، کە پێویست دەکات بە شێوەیەکی بەردەوام ڕێك بخرێن و بدرێنە پاڵ ئەرك و کاری یەکێ لە هەردوو دەسەڵاتەکە، هەروەها بە گۆڕانی بارودۆخ لەوەیە هەندێ کارو بار گۆڕانکاریان بە سەردابێت و پێویست بکات لە دەسەڵاتی هەرێمەکان دەربکرێن و بخرێنە پاڵ دەسەڵاتی فیدرالی و بە پێچەوانەوە، هەروەها فراوانی ئەرك و کاروباری دەوڵەت وەکو دیفاکتۆ ئەوە دەسەپێنێ ، کە مەحاڵ بێت هەموو ئەرك وکارەکان لە چوارچێوە بدرێن و بخرێنە پاڵ دەسەڵاتی فیدرالی ، یان دەسەڵاتی هەرێمەکان.

---

(١) بڕوانە : د. محمد کامل لیلة ـ النظم السیاسیة ص ٢٣٩ .

**ڕێگـای دووەم** :ـ کـارو ئەرکـەکانی دەسـەڵاتی هەرێمـەکان دیـاری دەکرێـن بـە شێوەیەکی تـەنراو (حصـر) و ئـەو کـارو بارانـەی کـە دەمێننـەوە و دیـاری نـەکراون دەکەونە ئەستۆی دەسەڵاتی فیدراڵی. واتا کارو بـاری هەرێمـەکان بـە شـێوەیەکی تـەنراو دیاری دەکرێـن و ئـەو کـارو بارانـە کـە دەمێننـەوە[1] هـەموو دەسـەڵاتی فیـدراڵی پێیـان هەڵدەسێ. ئەم ڕێگایە لە کەنەدا پەیڕەو کـراوە (مـادەی٩١) ، هـەروەها یـەکێتی باشـوری ئەفەریقیا (مادەی ٨٥).

**ڕێگـای سـێیەم**: کـارو بارەکـانی دەسـەڵاتی فیـدراڵی دیـاری دەکرێـن بـە شـێوەیەکی تەنراوو هەرچی دەمێنێتـەوە دەسـەڵاتی هەرێمـەکان پێیـان هەڵدەسـێ ، واتـا دەسـەڵاتی هەرێم هەموو ئەو کاروبارانەی کە دەمێننـەوە و دیـاری نـەکراون دەیانگرێتـە ئەسـتۆی خۆی و ئـەرکی بـەڕێوەبردنی ئــەو کاروبارانــەی دەکەوێتـە ئەسـتۆ. ئەمــەو زۆربــەی دەوڵەتە فیدرالیەکان بە ڕێگای سێیەمیان وەرگرتـووە[2] لەوانـە سویسـرا (مـادەی سـێ)، وولایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا (هەموارکردنـەوەی دەیـەم سـاڵی ١٧٩١)، مەکسـیك (مادەی ١١٧)، ئەرجەنتین (مادەی ١٠٤)، ئوسترالیا (مادەی ٥١). ئەمەو لە کاتێکدا دەوڵەتی فیدراڵی لە چـەند هـەرێمێك پێـك دێـت و هەریـەك لـەو هەرێمانـە دەسـەڵات و دەزگـای تایبـەتی خـۆی هەیـە ، ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێ کەهـەر یـەك لـەو هەرێمانـە قەوارەکـەی بـەهێزبێ بەرامبـەر دەسـەڵاتی فیـدراڵی ، لـە بـەر ئـەوەی دام و دەزگاکـانی دەسـەڵاتی فیدراڵی هەڵقوڵاوی بیروڕای جەماوەرن لە هەموو ناوچەکانی دەوڵەتی فیـدراڵی. ئـەم دام ودەزگایانە نوێنەرایەتی هەموو هەرێمەکان دەکەن ، لە لایەن ئەوانەوە هەڵدەبژێردرێن ، بۆیە دەسەڵاتی فیدراڵی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە لە گەڵ هـەموو هاووڵاتیـانی دەوڵەتدا ، بێ ئـەوەی هـەبوونی دەسـەڵاتەکانی هەرێمـەکان ببنـە کۆسـپێك لـە ڕێگـادا. یاسـاکانی دەوڵـەتی فیـدراڵی ڕاسـتەوخۆ پـەیڕەو دەکرێـن لـە هـەموو ناوچـەکاندا ، هـەر یاساو ڕیاسایەك لە هەرێمەکان دەبێ گونجاو بێ لە گەڵ دەستوور و یاساکانی دەسەڵاتی

---

(١)بڕوانە : د. سعد عصفور ـ القانون الدستوري ، الطبعة الاولى (١٩٥٤) ص ٢٧٨

(٢) هەمان سەرچاوە.

فیدرالیدا. ئەو بەشەی کە نەگونجاوە لە گەڵ دەستوور ویاساکاندا بەتاڵ دەبێتەوە. ئەو یاساو سیستەمە بنەڕەتییانەی کە لە دەوڵەتی فیدرالییەوە دەردەچن ، لە سەر هەرێمەکانە، فەرمان و ڕێاسای گونجاو دابڕێژن بۆ پیادە کردن و پەیڕەوکردنیان ، لە سەر هەرێمەکانەو دەبێ سیستەمی ڕامیارییان گونجاو بێ لە گەڵ دەستوور و یاساکاندا و نابێ باج بسەپێنن لە سەر هاوردەو ناردن (أستیراد و تصدیر) و یان بەڵێنکاری ببەستن لە گەڵ دەوڵەتانی دەرەوەدا و یان لە نێوان خۆیاندا (هەرێمەکان) ، تەنها بە ڕەزامەندی ئەنجومەنی یاسادانانی فیدرال نەبێ.لە ڕۆشنایی ئەم باسەمان دەردەکەوێت کە دەسەڵاتی فیدرالی باڵا دەستە بە سەر دەسەڵاتی هەرێمەکاندا.

ئەمەو دەستووری فیدرالی بایەخێکی زۆری هەیە، لە ڕۆشنایی دەستووری فیدرالیدا دەستڕۆیشتویی و کاروبارەکان دابەش دەکرێن لە نێوان دەسەڵاتی فیدرالی و دەسەڵاتی هەرێمەکاندا. بۆیە هەر هەموارکردنەوەیەکی دەستوور (تعدیل الدستور) پێویستی بە بەشدارییەکی کاریگەری هەموو هەرێمەکان هەیە ، لەبەر ئەوەی هەر هەموارکردنەوەیەکی دەستوور لەوەیە ببێتە هۆیەك بۆ زەوت کردنی هەندێ لە مافەکانی هەرێمەکان ، جا ئەم هەرێمانە لە ڕێگای بەشداری بوونیانەوە لە هەموارکردنەوەی دەستوور ، دەتوانن هاوکێشی بپارێزن لە نێوان خۆیان و دەسەڵاتی فیدرالی و پاراستنی هاوکێشی لە نێوان خودی هەرێمەکاندا.

## دووانەی دەزگای یاسادانان لە دەوڵەتدا.

دەوڵەتی فیدرالی وەکو باسمان کرد لە چەند هەرێمێك پێك دێ ، کە لە نێوانیاندا زۆر جیاوازی هەیە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، جیاوازی زمان و ئایین و چەند تایبەتمەندیەکی تر. بۆیە لە دەوڵەتی فیدرالیدا ، دوو ئەنجومەنی یاسادانان هەیە، یەکێکیان لە سەرجەم هاووڵاتیانی دەوڵەتی فیدرالی پێك دێت بە گوێرەی ڕێژمیەکی دیاری کراوو ، واتا نوێنەرایەتی هەموو هاووڵاتیانی دەوڵەتی فیدرالی دەکات ، بە چاوو پۆشین لە هەموو هەرێمە جیاجیاکان. بۆ نموونە دەستووری فیدرالی ڕێژەی

(٢٠٠٠٠)دەنگ بەرامبەر کورسیەك لەو ئەنجومەنەدا دادەنێت. واتا هەر (٢٠٠٠٠) دەنگ کورسییەکی بەر دەکەوێت.

جا لێرەدا ئەگەر هەرێمێك هەبێت دانیشتوانی (٤٠٠٠٠)کەس بێت ، ئەوە دوو کورسی لە ئەنجومەنی گەلدا بەر دەکەوێت. هەرێمێکی تر ئەگەر دانیشتوانی(١٦٠٠٠٠) کەس بێت ئەوە (٨) کورسی بەر دەکەوێت. وەکو دەبینین لێرەدا هەندێ لە هەرێمە فیدرالەکان بە هۆی کەمی دانیشتوانیانەوە نوێنەریان کەم دەبێ لە ئەنجومەنی گەلدا ، لەوەیە ببێتە هۆی زاڵ بوون و باڵادەستی هەرێمە گەورەکان بە سەر کاروباری دەوڵەتی فیدرالیدا و هەرێمە بچووکەکان ماف خوراو بن ، بۆیە بۆ هاوکێشی لە نێوان هەرێمەکانی دەوڵەتی فیدرالیدا ، ئەنجومەنێکی تر هەیە کە نوێنەرایەتی هەرێمەکان دەکات بە شێوەیەکی یەکسان ، بە چاوپۆشین لە ژمارەی دانیشتوان و ئاستی کۆمەلایەتی و ئابووری ئەو هەرێمانە، هەر هەرێمێك لەو هەرێمانە بە شێوەیەکی یەکسان نوێنەریان لەو ئەنجومەنەدا هەیە کە پێی دەڵێن ئەنجومەنی هەرێمەکان ، بۆ نموونە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجومەنی پیران ، کە ئەنجومەنی هەرێمەکانە، هەر هەرێمێك لە هەرێمەکانی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوو نوێنەری تیادا هەیە. ئەم دوو ئەنجومەنە ئەنجومەنی گەل و ئەنجومەنی پیران ، لە سەر بناغەی یەکسانی کار دەکەن لە ڕووی یاسادانانەوە، واتا هەر یاسایەکی فیدرالی دەبێ بە ڕەزامەندی هەردوو ئەنجومەن دەربچێ. بەلام هەندێ حاڵەتی دەگمەنیش هەیە، کە یاسا دەردەچێ تەنانەت ئەگەر ئەنجومەنی هەرێمەکانیش بەرهەڵستکاری بکەن ، ئەم دیاردەیە لە دەوڵەتی فیدرالی ئوسترالیا و نەمسا دەبینرێت. ئەمەو جگە لەکاری یاسادانان، کە لەسەر بناغەی هاوکێشی نێوان هەردوو ئەنجومەن بەڕێوە دەچێ، هەندێ حاڵەتیتر هەیە کەباڵادەستیی یەکێ لە ئەنجومەنەکانی تیادا بەدی دەکرێ لەسەر ئەویتر. بۆ نموونە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دەبێ ئەنجومەنی پیران ڕەزامەندی دەربڕێ لە سەر دانانی گەورە لێپرسراوانی دەوڵەت و پێك هێنانی یان بەستنی بەڵێنکاری لە گەڵ دەوڵەتاندا ، کە سەرۆك کۆمار پێیان هەڵدەسێ. لە سویسرا پێویست دەکات هەردوو ئەنجومەنی گەل و ئەنجومەنی هەرێمەکان پێکەوە لە

یەك کۆمەڵدا کۆببنەوە کە پێی دەڵێن (( کۆمەڵی فیدرالی )) بۆ وەرگرتنی هەندێ بڕیار وەکو هەڵبژاردنی ئەنجومەنی فیدرالی ، ئەندامانی دادگای فیدرالی مەزن ، بڕیاردانی لیبوردنی گشتی ، چارەسەرکردنی ململانێ و ناکۆکییەکانی نێوان دەزگاکانی دەوڵەتی فیدرالی ، ئەمە لە کاتێکدا کە ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی گەل دوو جار زیاترن لە ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی هەرێمەکان ، واتا لە کاتی دەنگداندا بۆ ئەو کاروبارانەی کە باسمان کرد ئەگەر ئەنجومەنی هەرێمەکان یەك دەنگی هەبێ ئەوە ئەنجومەنی گەل بەرامبەر ئەو یەك دەنگە دوو دەنگی دەبێ ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەنگی ئەنجومەنی گەل باڵا دەکات بە سەر ئەنجومەنی هەرێمەکاندا.

## دەوڵەتی فیدرالی لە ولایەتەکان بە هێزترە.[١]

دەوڵەتی فیدرالی لە ولایەتەکان بە هێزترە ، واتا دەوڵەتی فیدرالی لە ئەو ولایەتانە بە هێزترە کە لێیان پێك هاتووە. بەهێزی دەوڵەتی فیدرالی بەرامبەر ولایەتەکان لەچەند لایەکەوە بەدەر دەکەوێ لەوانە : ـ

ـ دەوڵەتی فیدرالی خاوەن دەسەڵاتێکی تەواوە، دەسەڵاتێك کە سەروەری هەبێ ، دەوڵەتی فیدرالی ڕاڤەی ئەو دەسەڵاتە دەکات لە ڕێگای دەزگای یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادوەرییەوە.

لەوەیە لە ڕووی یاساییەوە بگاتە ئەو ئاستە بتوانێ شێوەی فیدرالی دەوڵەت بگۆڕێ بۆ دەوڵەتێکی سادە و تیایدا ولایەتەکان تەنها ببنە چەند یەکەیەکی کارگێڕی لە جێگای ئەوەی کە چەند یەکەیەکی ڕامیاری بن . بەڵام دەسەڵاتەکانی ولایەتەکان پەیوەندییان بە ڕێکخستنی خودی خۆیانەوە هەیەو چەند دەسەڵاتێکی سنووردارن و لەوەیە بەردەوام کەم وزیاد بکرێن بە پێی دەستووری دەوڵەتی فیدرالی .

---

(١) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٩ ـ ٢٨٢ .

- وەکو دەزانین لە دەوڵەتی فیدرالی و ولایەتەکان ، دەسەڵاتی یاسادانان هەیە کە کاری یاسادانانی دەکەوێتە ئەستۆ هەر یەکەو لە سنووری تایبەتکاریەکانی خۆیدا ، بەڵام کاتێ یاساکانی ولایەتەکان و یاساکانی دەوڵەتی فیدرالی گونجاو نەبن لە گەڵ یەکتردا . ئەوە یاساکانی ولایەتەکان بێ بایەخ دەمێننەوەو یاساکانی دەوڵەتی فیدرالی پەیرەو دەکرێن . دەستوورەکانی ئەڵمانیا لە ساڵی (١٨٧١ز - مادەی دوو)، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (ماددەی شەش برگەی دوو) ، سویسرا(مادەی ١١٣) ، ئاماژەیان بەو خاڵەی سەرەوە کردووە .

- ئەو ئامانجانەی کەوا لە ولایەتەکان دەکەن لە دەوڵەتێکی فیدرالیدا کۆببنەوە ، وایان لێ دەکات کە دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدرالی والا دەست بکەن بۆ بەدی هێنانی ئەو ئامانجانە کە هەندێ لەوانە مامۆستا موسکیلی باسی کردووەو دەڵێ :

(( دەوڵەتی فیدرالی خاوەن هەموو ئەو دەسەڵاتانەیە کە پەیوەندیدارن بە هەموو ولایەتەکانەوە. بەتایبەت ئەو دەسەڵاتانەی کە پەیوەندییان هەیە بە: دراوو ، پۆست و گەیاندن ،گومرك و بازرگانی دەرەوە ، هێزی سەربازی ،وەرەقەو نیشانە بازرگانییەکان و مایە پووچی (افلاس) ، پێناسەو پێناسەپێ دان و کۆچ (هجرە) ، قەبوڵکردنی ئەندامی تازە لە دەوڵەتی فیدرالی سنووری دەرەوەی دەوڵەت ، جاڕدانی حاڵەتی فریاگوزاری یاسا داراییەکان ، کاروباری جەنگی )).

- دەوڵەتی فیدرالی تەماشای ناکۆکییەکانی نێوان خۆی و یەکێ لە ولایەتەکان ، یان لە نێوان ولایەتەکان دەکات. زۆربەی دەوڵەتە فیدرالیەکان بەم کارە هەڵدەسن لە رێگای دەزگایەکی دادوەرییەوە. بۆ نموونە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دادگای فیدرالی بالا (Supreme court) بەو کارە هەڵدەسێ ، واتا بە تەماشاکردنی ناکۆکییەکانی نێوان دەوڵەتی فیدرالی و یەکێ لە ولایەتەکان ، یان ناکۆکییەکانی نێوان خودی ولایەتەکان خۆیان.

هەروەها لە سویسرا دادگای فیدرالی (Tribunal fedreral) بەو کارە هەڵدەسێ. بەڵام هەندێ لە دەستوورەکان ئەو تایبەتکاریەیان خستووەتە ئەستۆی دەزگایەك کە

دادوەری نییە، بۆ نموونە دەستووری ئەڵمانیا لە ساڵی (١٨٧١ز) ئەو تایبەتکاریەی خستە ئەستۆی کۆنسەی فیدرالی (Conseil federal).

ئەو تایبەتکارییەی سەرەوە، واتا تەماشاکردنی ناکۆکییەکان ، دەستوور جەختی لە سەر کردووە و بڕیاری دەوڵەتی فیدراڵییش لەو بوارەدا کۆتایەو نابێ تانە بکرێ لە بەردەم هیچ دەسەڵاتێکی تردا.

## بەستی دووەم :

## چەند نموونەیەك دەربارەی دەوڵەتی فیدرالی

## (دەوڵەتی فیدرالی لە جێبە جێ کردندا)

### یەکەم : دەوڵەتی فیدرالی ئەمریکا(١)

وولایەتەکانی ئێستای وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پاش ڕزگار بوونیان لە داگیرکاری بەریتانیا ، سەرەتا لە کۆنفدراسیۆنێکی (١٣) وولایەتیدا پێکەوە کۆبووبوونەوە، ئەم کۆنفدراسیۆنە گەشەی کرد و بە دەوڵەتێکی فیدرالی کۆتایی پێ هات. ئێستا ئەم وولاتە لە پەنجا وولایەت پێك دێت.[٢]

### أ- دەزگاکانی دەوڵەت فیدرالی ئەمریکا :-

### ١. دەزگای یاسادانان :-

دەزگای یاسادانان لە دەوڵەتی فیدراڵی ئەمریکادا لەدوو ئەنجومەن پێك دێ ، کە بەهەردووکیان پێکەوە دەڵێن (کونگرس). ئەنجومەنی یەکەم، ئەنجومەنی نوێنەرانە ،کەنوێنەرایەتی هەموو هاووڵاتیانی ئەمریکا دەکات بەگێورەی ڕێژەی دانیشتوانی هەر وولایەتێك، واتا ئەو وولایەتانەی کە دانیشتوانی زۆرن نوێنەریان

---

[١] بڕوانە : د.محمد كامل ليلة - النظم السياسية - ص ٢٣٧ .

[٢] هەمان سەرچاوە

زیاترە لەو وولایەتانەی کە دانیشتوانی کەمترن، سەرجەم ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران لە حالی حازردا (٤٣٥) ئەندامن ، کە بۆ دوو سال هەلدەبژێردرێن بۆ ئەندامێتی ئەم ئەنجومەنە، هەر یەکێ لەو ئەندامانە نوێنەرایەتی نزیکەی (٤٠٠)هەزار کەس دەکات ، بەلام دەبێ هەر وولایەتێك هیچ نەبێ نوێنەرێکی هەبێ لە ئەنجومەنی نوێنەراندا بە چاوپۆشین لە ژمارەی دانیشتوانی ئەو وولایەتە. کاری ئەنجومەنی نوێنەران کاری یاسادانانە بە شێوەیەکی تەواو. هەروەها مافی پێشنیاری پرۆژەی یاساکانی دارایی، لەو ڕووەوە بالا دەستە بە سەر ئەنجومەنی پیراندا هەیە، ماوەی نوێنەرایەتی لە ئەنجومەنی پیراندا (شەش ساڵە)، بە مەرجێك دەبێ (1/3)ی نوێنەرانی هەموو دوو سال جارێ نوێ بکرێنەوە. ئەنجومەنی پیران جگە لە یاسادانان بەشداری لە بەڕێوەبردنی دەسەلات دەکات ، بۆ نموونە ئەنجومەنی پیران دەبێ ڕەزامەند بێت لە سەر دانانی گەورە فەرمانبەرانی دەولەت، هەمان شت بە نسبەت بەستنی بەلێنکاری لە گەل دەولەتاندا لە لایەن سەرۆك کۆمارەوە. بەهەر حال هەردوو ئەنجومەنی پیران و نوێنەران دەزگای کاری یاسادانانن، لەم ڕووەوە یەکسانن ، واتا بەبێ قایل بوونی یەکێ لەم دوو ئەنجومەنە هیچ پرۆژەیەکی یاسایی نابێ بە یاسا ، دەبێ هەردوو ئەنجومەن قایل بن بەپرۆژە یاساییەکان، تا ئەو پرۆژە یاساییانە ببن بە یاسا و کاریان پێ بکرێ.

٢. **سەرۆك كۆمار** : سەرۆك کۆمار لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆماوەی چوار سال هەلدەبژێردرێ و نابێ لە هەشت سال زیاتر سەرۆك بێ. واتا نابێ دوو جار زیاتر هەلبژێردرێتەوە (ئەمە بە گوێرەی هەموارکردنەوەی ٢٢لە دەستووردا لە سالی ١٩٥١ز).

**سەرۆك کۆمار دەسەلاتی فراوانی هەیە : ـ**

لەوانە: توانای دەرکردنی سیستەم ، سەرۆکی بالای دەزگای بەڕێوەبردنە. هەر خۆی فەرمانبەرە فیدرالییەکان دادەنات و لایان دەبات ، لەو کارەدا ئەنجومەنی پیران هەماهەنگی دەکات ، سیاسەتی دەرەوە ئاراستە دەکات لە دانانی نوێنەرانی دەولەت و کونسولەکان لە وولاتەکاندا و بەلێنکاری دەبەستێت ئەمانە بە هاوکاری لە گەل

ئەنجومەنی پیراندا ، دان بە دەوڵەتاندا دەنا (الاعتراف بالدول) ، سەرۆك كۆمار سەرۆكی گشتی سوپایە و لە كاتی جەنگدا دەسەڵاتێكی نیمچە دكتاتۆری هەیە، مافی بڕیاردانی لێبوردنی هەیە، هەروەها لە بواری كاری یاسادانانداا ، سەرۆك بۆی هەیە پێشنیاری پرۆژەی یاسایی بكات و ئاراستەی كۆنگرسی بكات بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ ، یان بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ پێشنیاری پرۆژەی یاسایی دەكات لە ڕێگای ئەو بەرنامە و پرۆگرامانەی كە لە ماوەی ساڵێكدا ئامادەیان دەكات و بە شێوەی نامە ئاراستەی كۆنگرسیان دەكات ، كە لە ڕاستیدا ئەو پرۆگرامانە لە پرۆژەی یاسایی پێك هاتوون ، یان لە ڕێگای پارتەكەیەوە لە كونگرسدا؛ سەرۆك لە ڕێگای یەكێ لە ئەندامەكانی پارتەكەیەوە دەتوانێ پرۆژەیەكی یاسایی بخاتە بەردەم كۆنگرس.

## ب. وولایەتەكان :

وولایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا لە (٥٠) ولایەت پێك هاتووە، هەر وولایەتێك دەزگای یاسادانان و حاكمی وولایەتی خۆی هەیە، كاری سەرەكی دەزگای یاسادانان یاسادانانە، كە لە ساڵێكدا دوو جار كۆ دەبێتەوە و خولی كۆبوونەوەكانی كورتن. حاكمی وولایەتەكان دەسەڵاتێكی فراوانتریان هەیە لەوەی سەرۆك لە دەوڵەتی فیدرالیدا.

لە دەسەڵاتەكانی حاكمی وولایەت: سەرۆكی دەزگای ڕاپەڕاندنە لە وولایەتدا ، ئامادەكردنی بودجەی ساڵانەی وولایەت، ئاراستەكردنی نامە بۆ ئەنجومەنی یاسادانان كە پێك هاتووە لە پرۆژەی یاسایی.

## جـ. پەیوەندی نێوان دەسەڵاتدارانی ناوەندی و دەسەڵاتدارانی هەرێمەكان :

بە گوێرەی دەیەمین هەمواركردنەوەی دەستوور لە ساڵی( ١٧٩١ز)، بۆ دابەشكردنی كاروبارەكان لە نێوان دەسەڵاتی فیدرالی و دەسەڵاتی وولایەتەكان ئەم بناغەیە پەیڕەو كراوە:

ئەو دەسەڵاتانەی كە نەسپێردراونەتە دەسەڵاتی فیدرالی یان قەدەغە نەكراون لەسەر وولایەتەكان ، دەمێننەوە بۆ دەسەڵاتی وولایەتەكان. واتا دەستوور ، دەسەڵاتی

فیدرالی دیاری کردووە، هەوەها هەندێ کاروباری دیارە کردووە کە نابێ وولایەتەکان بیکەن ، ئەو کاروبارانەی کە دەمێننەوە بە کاروباری وولایەتەکان دەژمێردرێن. ئەمەو بالادەستی دەسەلاتی فیدرالی بە سەر هەرێمەکاندا لە چەند ڕوویەکەوە بە دەر دەکەوێت. دەستوورو ئەو یاسایانەی بە پێی دەستوور دادەنرێن و ئەو بەلێنکاریانەی کە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیان بەستێ ، بە یاسای بالای وولات دادەنرێن و جێبەجێ و پەیرەو دەکرێن لە هەموو دادگاکانی دەولەتدا لە هەر وولایەتێك بێت ، ئەو دەستوور ویاسایانەی کە پێچەوانەی دەستوور و یاسای بالا بن لە دەولەتدا لە هەر هەرێمێکدا بن ، ئەوە کاریان پێ ناکرێ و بەتالْ دەبنەوە لەو بەشەیاندا کە نەگونجاوە لە گەلْ دەستوور و یاساکانی دەولەتی فیدرالیدا. (م٦ ف٢) ئەمەو وولایەتەکان ناتوانن دەستێوەردانی هەندێ کاروبار بکەن تەنها بە ڕەزامەندی دەزگاکانی دەولەتی فیدرالی نەبێ. (م١ ـ فصل ١٠ـ ف٢، ف٣).

لەوانە، هەندێ کاروبار هەن پێویستیان بە ڕەزامەندی کۆنگرس هەیە وەکو: هەبوونی هێزی سەربازی نیزامی یان پاپۆڕی جەنگی لە کاتی ئاشتیدا، بەستنی بەلێنکاری یان ڕێککەوتن لە گەلْ وولایەتێکی تردا یان لە گەلْ دەولەتێکی بێگانەدا ، چوونە ناوەوەی (تدخل) هەرجەنگێك تەنیا لە کاتێکدا نەبێ ، کە وولات تووشی داگیرکاری ببێتەوە ، یان لە هەر حالەتێکی تری ترسناکدا کە بوار بەدواخستن نەدات. ئەمەو دەسەلاتی فیدرالی بە پشت بەستن بە ڕیاسا گشتییەکان لە دەستوور و یاساکاندا ، دەتوانێ سیاسەتی خۆی بسەپێنێ بە سەر دەسەلاتی وولایەتەکاندا لێردا بۆ نموونە : حاکمی وولایەتی میسیسیبی (بارنێت) داواکاری یەکی لەقوتابییە زنجییەکانی ڕەتکردبوەوە کە داوای کردبوو ببێتە قوتابی لە زانکۆی ئکسفۆردی سەر بەو وولایەتە، بەلام سرۆکی دەولەتی فیدرلی جۆن کندی لە (٢٤) ئەیلولی (١٩٦٢ز) حاکمی وولایەتەکەی ناچار کرد لەو بڕیارە پاشگەز ببێتەوە و مافی خوێندن بە قوتابییە زنجیەکە بدات لە وولایەتی ناوبراو. سرۆك کۆمار پشتی بە چواردەیەمین هەموارکردنەوەی فەسلی یەکەم بەست لەدەستووری سالی (١٨٦٨ز) ، کە باس لە یەکسانی هاوولاتیانی دەولەتی فیدرالی دەکات لە هەر جێگەو شوێنێك نیشتەجێ بن لە

دەوڵەتدا، چ لە ڕووی ئمتیازاتەوە بێت، چ لە ڕووی پاراستنی ژیان و سەربەستیەکان و یەکسانییانەوە بێت لە بەردەم دادگادا .

## باسی دووەم
## ـ دەوڵەتی فیدرالی سویسرا ـ

دەوڵەتی فیدرالی سویسرا لە سەرەتادا لە سەدەی سیازدەیەمەوە سەری هەڵدا ، ئەو کاتە تەنیا لە سێ کانتۆن پێکهاتبوو کە پاراستنی بەرژەوەندی هاوبەشی نێوانیان کۆیانی کردبووەوە ، ئەم سێ کانتۆنە لە ناوەڕاستی سەدەی هەڤدەیەمدا بوو بە ( ١٣) کانتۆن و لە پەیماننامەی ووستفالیا دان بە سەربەخۆیاندا نرا، کەچەند دەوڵەتێکن بە شێوەی یەکێتی هاوپەیمانی پێکەوە کۆبوونەتەوە . بەڵام کاتێ شۆڕشی فەرەنسایی کراو دەسەڵاتی کۆماری بەهێز بوو، فەرەنسا دەستووری ساڵی (١٧٩٨ز)ی سەپاندە سەر سویسرادا ، بە گیۆرەی ئەو دەستوورە کانتۆنەکانی سویسرای بەیەکەوە گرێدا و لە دەوڵەتێکی سادەدا کۆی کردەوە، سویسرا بوو بە دەوڵەتێکی یەك پارچەی سادە (دولة موحدة بسيطة ). بەڵام ئەم ڕەوشە لەگەڵ باروردۆخی دەوڵەتی سویسرادا یەکی نەدەگرتەوە، بۆیە ناپلیۆن درگی بەمە کردو بواری داوە کانتۆنەکان بگەڕێنەوە بۆ سەر شێوەی کۆنفیدرالی بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان کانتۆنەکان، لە کاتی دەسەڵاتی ناپلیۆندا ژمارەی کانتۆنەکان بوو بە(١٩) کانتۆن و لەکاتی بەستنی کۆنفرانسی ڤیینا ساڵی (١٨١٥ز) ژمارەی کانتۆنەکان گەیشتە(٢٢)کانتۆن، لەم کۆنفرانسەدا بڕیاردرا سویسرا دەوڵەتێکی بێ لایەن بێت بە شێوەیەکی هەمیشەیی . بەڵام بەپێی دەستووری ساڵی (١٨١٥ ز )دەرکەوت کە پەیوەندی نێوان کانتۆنەکان لاوازە، سویسراییەکان درکیان بەو لاوازیە کرد ، بۆیە بڕیاریان دا حاڵەتی کۆنفدرالی بگۆڕن کە بە گیۆرەی دەستووری ساڵی (١٨١٥ ز )لەئارادا بوو بەسیستەمی فیدرالی، بەپێیدەستووری ساڵی(١٨٤٨ ز ) وهەموارکردنەوەی ئەو دەستوورە لەساڵی (١٨٧٤ ز )، دەوڵەتی سویسرا بوو بەدەوڵەتێکی فیدرالی تا کاتی ئێستا .

## ا ـ دەزگاکانی دەوڵەتی فیدرالی لە سویسرا .

دەزگاکانی دەوڵەتی فیدرالی لە سویسرا لەم دوو دەزگایە پێکهاتوون .

**١ـ کۆمەڵەی فیدرالی : ـ**

کۆمەڵەی فیدرالی لە دوو ئەنجومەن پێکهاتووە ، ئەنجومەنی گەل و ئەنجومەنی کانتۆنەکان (هەرێمەکان)، کە پێکەوە کۆدەبنەوە لە یەك دانیشتندا بە سرۆکایەتی سەرۆکی ئەنجومەنی نەتەوەیی و بڕیار لە سەر ئەم بابەتانە دەدەن: هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی فید رالی ، دانانی سەرۆك سالاری سوپای فیدرالی ، بڕیاردانی لێبوردن ، یەك لاکردنەوەی کێشەو ململانێکان لە نێوان دام ودەزگاکانی دەوڵەتی فیدرالی دا ، دانانی ئەندامانی دادگای فیدرالی باڵا. هەروەها کۆمەڵەی فیدرالی زۆربەی کاروبارەکانی دەوڵەتی فیدرالی بەڕێوە دەبا ، وەکو کاری یاسادانان کەدەبێ بە ڕەزامەندی هەردوو ئەنجومەنی نەتەوەییو کانتۆنەکان دەربچێت ، بەبێ ڕەزامەندی لایەنێکیان مەحاڵە یاسا دەربچێت یان دروست بکرێت ، دانانی بودجە ، سەرۆکایەتی کردنی سوپا ، ڕاگەیاندنی جەنگ و وەستاندنی بەستنی ڕێکەتن و بەڵێن کاری لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەوەدا ، دانانی کۆنسڵ و نوێنەری دەوڵەت لە دەوڵەتاندا و پاراستنی ئاسایشی دەوڵەتی فیدرالی لە ناوەوەو دەرەوە .

**٢ـ ئەنجومەنی فیدرالی :**

ئەندامەکانی ئەنجومەنی فیدرالی لەلایەن کۆمەڵەی فیدرالیەوە هەڵدەبژێردرێن بۆماوەی چوار ساڵ، ئەو ئەندمانەی هەڵدەبژێردرێن بۆ ئەم ئەنجومەنە، دەبێ مەرجی بەئەندام بوونیان تێدابێ لەئەنجومەنی کانتۆنەکاندا، نابێ لەیەکێ زیاتریان دانشتووی هەمان کانتۆن بێت، واتا نابێت لەیەك کانتۆن دوو ئەندام هەبێت لەئەنجومەنی فیدرالیدا، لەنێوان خۆیاندا سەرۆك وجێگرەکەی بۆماوەی دووساڵ هەڵدەبژێرن ونابێ بۆجاری دووەم هەڵبژێردرێن. واتا سەرۆك وجێگرەکەی تەنیا بۆ دووساڵ هەڵیان دەبژێرن ونابێ تازە بکرێنەوە، سەرۆکی ئەنجومەنی فیدرالی سەرۆکی دەوڵەتی فیدرالی سویسرایە. بەڵام لەڕووی کارکردنەوە هەر ئەندامێکی ئەنجومەنی فیدرالی کارو باری یەکێ لەوەزارەتەکان بەڕێوە دەبات .

**ب.کانتۆنەکان :**

دەوڵەتی فیدراڵی لە سویسرا لە(٢٢) کانتۆن پێك هاتووە .هەرکانتۆنێ لەو کانتۆنانە دەزگای یاسادانانی خۆی هەیە، کە ئەندامەکانی لەسەر بناغەی سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی هەڵدەبژێردرێن، تەنها لە هەشت کانتۆندا نەبێ پەیڕەوی سیستەمی زۆرینە دەکەن لەسەر بناغەی لیست. ئەمەو لەپاڵ دەزگای یاسادانانداا، ئەنجومەنی هەرێم هەیە، لەلایەن دەزگای یاسادانانی هەرێمەوە هەڵدەبژێردرێ ، کە لەهەندێ کانتۆندا پێی دەڵێن ئەنجومەنی دەوڵەت ، لەهەندێکی تردا پێی دەڵێن ئەنجومەنی حکومەت، ژمارەی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە لە (٥-١١) ئەندام پێك دێ . پەیوەندی نێوان دەزگای یاسادانان وئەنجومەنی هەرێم ، یان ئەنجومەنی حکومەت، تاڕادەیەك وەکو هەمان پەیوەندییە لەنێوان کۆمەڵەی فیدراڵی و ئەنجومەنی فیدراڵیدا. بەڵام لێرەدا دەزگای یاسادانان بۆی هەیە ئەندامەکانی ئەنجومەنی حکومەت لابدات ، تەنانەت پێش تەواوبوونی ماوەی هەڵبژاردنیانیش. ئەمەو لەهەندێ لەکانتۆنەکانی دەوڵەتی فیدراڵی سویسرادا دیموکراسی ڕاستەوخۆ پیادە دەکرێ ، لەسێ کانتۆنی دەوڵەتی فیدراڵیدا هەموو دانیشتووانی هەریەك لەو کانتۆنانە ساڵانەو بۆ جارێك (زیاتر لە ڕۆژی یەك شەممەو لەمانگی نیسان یان ئایار) کۆدەبنەوە لەگۆڕەپانێکی گشتیدا بۆ دەنگدان ویەکلاکردنەوەی ئەو پرۆژانەی کە لەلایەن ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراوەوە ئامادە دەکرێن ، لەوانە:

دەنگدان لەسەر یاسا ئامادە کراوەکان ، بودجەی کانتۆن ، هەموارکردنەوەی دەستوور ئەگەر هەبێت.

هەروەها پەیڕەوکردنی دیموکراسی ناڕاستەوخۆ بەشێوەیەکی زەقتر دەبینرێت ، لە دیاردەکانی پەیڕەوکردنی دیموکراسی ناڕاستەوخۆ: دەسپێشخەری گەلی‌میلی ( المبادرة الشعبية )، ریفراندۆم، هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەکانی یاسادانان و کانتۆنەکان لەسەر داواکاری ڕێژەیەکی دیاری کراو لەهاووڵاتیان.

## ج ـ پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی فیدراڵیو دەسەڵاتی کانتۆنەکان: ـ

دابەش کردنی کاروبارەکان لەنێوان دەسەڵاتی فیدراڵی و دەسەڵاتی کانتۆنەکان بەپێی ماددەی (٣)ی دەستووری (٢٩)ی مایسی ساڵی (١٨٧٤ز)بەم شێوەیە دابەشکراوە : ـ

ئەو کاروبارانەی کە نەدراونەتە پاڵ دەسەڵاتی فیدراڵی دەگەڕێنەوە بۆ کانتۆنەکان ، واتا کاروباری دەسەڵاتی فیدراڵی دیاریکراوە و ئەو کاروبارانەی کە دەمێننەوە کاروباری دەسەڵاتی کانتۆنەکانن ، ئەمەو دەسەڵاتی فیدراڵی زاڵە بەسەر دەسەڵاتی کانتۆنەکاندا ، ئەم زاڵبوونە لەماددەکانی(١٦،٦،٥) دەردەکەوێ . دەسەڵاتی فیدراڵی دەبێ نەخزێتە ناو کاروباری کانتۆنەکانەوە. گەرەنتی کانتۆنەکان و ناوچەکانیان وسەروەریان بکات لە سنووری دیاریکراودا کە ماددەی (٣ ) دیاریکردووە، هەروەها گەرنتی کردنی مافە دەستوورییەکانی هاووڵاتیانی هەرێمەکان، گەرنتی کردنی شێوەی کۆماری کانتۆنەکان و تایبەت کاری ( اختصاص) هەرێمەکان کە بەپێی دەستوور پێیان دراوە. دەوڵەتی فیدراڵی بۆی هەیە دەستێوەردانی کاروباری کانتۆنەکان بکات ( تەنانەت ئەگەر ئەو هەرێمانە داوایان لێ نەکردبێ )، لە حاڵەتێکدا ئەگەر مەترسییەك هەبێ لەسەر دەستوورو سەروەری دەوڵەتی فیدراڵی. هەروەها لە سەر کانتۆنەکانە بەپێی ماددەی ( ٦ ) داوا لە دەسەڵاتی فیدراڵی بکەن گەرەنتی دەستوورییان بکات.* هەروەها دەبێ ئەنجومەنی فیدراڵی ڕازی بێت لە سەر هەندێ لە یاساو ڕێورەسمەکانی (مەرسومەکانی ) کانتۆنەکان ، بەبێ ڕەزامەندی دەوڵەتی فیدراڵی ئەو یاساو ڕێ و

---

*گەرەنتی دەستووری کانتۆن کاتێ دەکرێ پەیرەوی ئەم مەرجانە بکرێ : ـ

١ـ نابێ دەستووری کانتۆن شتێکی تێدابێ بەپێچەوانەی دەستووری فیدراڵی بێ.

٢ـ دەبێ دەستووری کانتۆن گەرەنتی مافی ڕامیاری هاووڵاتیان بکات.

٣ـ دەبێ هاووڵاتیان ئەم دەستوورەیان قەبوڵ کردبێ ولە بارێت بۆ هەموارکردنەوە (تعدیل ) ئەگەر هاتوو زۆرینەی ڕەهای هاووڵاتیان داوای هەموارکردنەوەی دەستووریان کرد ئەگەرهاتوودەسەڵاتی فیدراڵی گەرەنتی دەستووری لە یەکێ لە کانتۆنەکان نەکرد ، دەبێ ئەو کانتۆنە دەستوورەکەی هەموار بکاتەوە تا دەسەڵاتی فیدراڵی گەرەنتی بکات .

ڕەسمانە نابێ پەیڕەو بکرێن ( م ١٠٢ ف ١٣ ). کۆمەڵەی فیدرالی بۆی هەیە ململانێی کانتۆنەکان بکات لە دەسەڵاتی یاسادانانیاندا بێ ئەوەی کانتۆنەکان بتوانن کارێکی پراکتیکی و کاریگەر بکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵەی فیدرالی، لە بەرئەوەی ماددەی ( ١٧٨ ف ١ ) لە یاسایی ڕیکخستنی دادوەری ( قانون التنظیم القضائي ) دەڵێ:- بڕیارەکانی کۆمەڵەی فیدرالی

تانە ناکرێن، تانە( طعن ) تەنیا بڕیارەکانی کانتۆنەکان دەگرێتەوە ، ئەوەی بۆ کانتۆنەکان دەمێنێتەوە پەنا بردنە بۆ ئەنجومەنی فیدرالی کە ئێشکگرو چاودێری پەیڕەوکردنی دەستووری فیدەرالییە. بەڵام ئەنجومەنی فیدرالی تەنیا دەتوانێ کۆمەڵەی فیدرالی ئاگادار بکاتەوە لەو یاساییەی دەیەوێ دایبنی و لەوەیە ببێتە دژایەتی کردنی تایبەتکاری (اختصاص ) کانتۆنەکان.

# بـــەشـــی ســـێیـــەم
# پـــێبـــەنـــدی دەوڵـــەت
## ( تــقــيـيــد الــدولــة )

**- پێ بەندی دەوڵەت بەیاساوە -**

پێبەندی دەوڵەت بەیاساوە، واتا ملکەچی دەســەلاّت بــە دەســت لــەکارو کردوەکـانیدا بۆ ئەو ڕیاساو یاسایانەی کە لەئارادان.[١]

وەکو لە پێشدا ئاماژەمان پێکرد. دەوڵــەت لــە هــەرێم ، گــەل ، دەســەلاّت پێـك دێـت. ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە دەسەلاّت و گەلە ، واتا دەسەلاّتداران ، یـان حوکمڕانـان و حوکم کراوەکان، ئەوانەی کە دەسەلاّت حوکمیان دەکات.

پێبەندی دەسەلاّت بەو یاساو ڕیاسایانەوە کە لەئارادان و پێ بەندیان بە ئـەو مافـە ڕامیـاری و ئـابووریو کۆمەلاّیـەتیو ئایینییانــەی کـە بەدەســەلاّت بەســەران دراوە بــە گوێرەی یاساکانی دەوڵەت .

لەبەرئەوەی بەچڕو پڕی باسی ئـەم مەسـەلەیە بکـەین پێویسـت دەکـات ئـەم بەشـە بکەین بەدوو باس :

ـ لەباسی یەکەمدا ، باسی بنچینەی پێ بەندی دەکـەین و لەباسـی دووەمـدا ، باسـی ئامرازەکانی پێ بەندبوونی دەوڵەت دەکەین.

---

(١) بڕوانە : د. سمير خيري توفيق ـ مبدأ سيادة القانون ، ص١١٨.

## باسی یەکەم
## بنچینەی پێ بەندی
### ( مبدأ التقييد )

ئەم باسەمان دەکەین بە دوو بەستەوە ، لەبەستی یەکەمدا باسی بناغەی بنچینەی پێبەندی ( ڕێچکەی لیبرالی ) دەکەین و لەبەستی دووەمدا باسی ئەنجامی بنچینەی پێبەندبوون دەکەین .

## بەستی یەکەم :
## بناغەی بنچینەی پێ بەندی : ڕێچکەی لیبرالی [1]

کۆمەڵ لەتاك پێك هاتووە ، بەبوونی تاك کۆمەڵ دروست دەبێت ، لەئایینی کریستینیدا تاك بەوێنەی خودا دادەنرێت لەسەر زەمیندا، واتا دەبێ هەموو کارێك بکرێت بۆ ڕزگارکردنی تاك .[2] مرۆڤ کاتێ هاتە کایەوە یاسای نەدەزانی ، دەوڵەتیش نەبوو ، واتا بە سەربەستی دەژیا و بەسەربەستی ژیانی بەسەر دەبرد ، ئازاد بوو لە هاتووچۆکردن و نیشتەجێ بوون و کارکردنیدا. کاتێ تاك پێویستی بەدەوڵەت بوو ، ئەوە لەڕێگای گرێ بەستێ کۆمەڵایەتیەوە ( العقد الاجتماعی) .تاکەکان دەوڵەتیان پێکەوە نا بۆ بەدیهێنانی پاراستنی ئازادی تاکەکەسی . هەرئەم بۆچوونەش بانگەشەی بۆ دەکرا لەسەدەکانی (١٧ ، ١٨ ز ) لەلایەن چینی بۆرژواوە کەتازە هاتبووە کایەوە و مەرکەزو ڕۆڵی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی نەدەگونجا لەگەڵ مەرکەزی ئابوورییدا، کەزۆر باش بوو، بۆ ئەوەی سنووری بۆ دەسەڵاتی میرنشینی دابنات و بگاتە مەرکەزێکی

---

(١) بڕوانە: د. منذر الشاوي ـ نظرية الدولة ، ص٣٠٩

(٢) بڕوانە: د. طعيمة الجرف ـ نظرية الدولة والأسس العامة للتنظيم السياسي، ص١٥٦

کۆمەلأیەتیو ڕامیاری گونجاو لەگەڵ مەرکەزی ئابووریدا. هەر ئەوەش بووە هۆی ڕاگەیاندنی مافەکان لە فەرەنسا لەساڵی (١٧٨٩ز)، واتا بۆ چاك کردنی باری ڕامیاری و کۆمەلأیەتی چینی بورژوای تازە هەڵساو بەرامبەر بەدەسەلأتی ڕەهای میرنیشینی ئەوکاتە. هەروەها بۆچوونەکانی (ئادەم سمیس) دەربارەی ئابووری ئازادو دەسپێشخەری تاکەکەسی ( المبادرة الفر دية )، کە ئەو پێی وابوو تەدەخولی دەوڵەت کارێکی خراپە لە بوواری ئابووریدا، دەستپێشخەری دەبێت بە دەستی تاکەوەبێ بۆجموجۆڵی ئابووری . واتا ئابووری ئازاد لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە دەستپێشخەری تاکە کەسی بکەوێتە سەرەوەی دەستپێشخەری کۆمەڵەوە (الجماعة) . ئەمەو پەیڕەوکردنی ڕێچکەی لیبرالی لە سەر بنەمای تیۆری گرێبەستی کۆمەلأیەتی (العقد الاجتماعی)[1] بوو بە سەرچاوەی هەندێ بڕوانامەی دەستووری لە هەندێ وولأتدا ، وەکو بڕوانامەی جاڕدانی سەربەخۆیی ئەمریکا لە ساڵی ( ١٧٧٦ز ) کە بەم دەستەواژەیە دەست پێ دەکات (( خەڵکی لەو کاتەوە لە دایك دەبن یەکسانن بە یەك و خاوەن مافی ئەزەلین کە لێیان دانابچڕێت ، حکومەتەکانیش بۆپاراستنی ئەم مافانە دروست بوون )).هەروەها ماددەی یەك لەدستووری فەرەنسا ساڵی ( ١٧٩١ز) دەڵێ (( خەڵکی بە سەربەستی لە دایك دەبن و لە بەردەم یاسادا یەکسانن بەیەك )).هەروەها ماددەی دوو لە هەمان دەستوور دەڵێ ((ئامانجی هەموو کۆمەڵێکی سیاسی، بریتییە لە پاراستنی مافە سروشتییە ئەزەلییەکانی مرۆڤ کە ئەمانەن، ئازادی، موڵکداری ، ئاسایش و هەڵسانەوە دژی زۆرداری )). هەروەها ماددەی چواریش دەڵێ : ((سەربەستی بریتییە لە توانای کردنی هەموو کردارێك کە زیان بە خەڵك نەگەیێنێ و هیچ سنوورێك بۆ بەکارهێنانی مافە سروشتییەکانی مرۆڤ نییە، تەنها ئەوە نەبێ تەگەرە نەخاتە ڕێی ماف بەکارهێنانی کەسانی ترەوە )). ماددەی (١٢) یش دەڵێ ((پاراستنی مافیمرۆڤ وهاوولأتی پێویستی بەهەبوونی دەسەلأتێکی گشتی هەیە، کە ئەو دەسەلأتە دەبێ بۆ بەرژەوەندی هەمووان بەکار بهێنرێت نەك بۆ بەرژەوەندی خاوەن دەسەلأتەکە)).

---

[1] بڕوانە : د. سەعدی بەرزنجی ـ تیۆری گشتی یاسا ل٩٦–٩٧

## یەکەم : ناوەڕۆکی ڕێچکەی لیبرالی
**( مضمون المذهب الليبرالي ) .**

سەربەستی ئابووری ، سەربەستی فیکری ، سەربەستی کەسێتی . . . ڕێچکەی لیبرالی جیاوازی دەکات لە نێوان دوو جۆرە کەرتدا ( قطاع )، یەکێ لەو کەرتانە پەیوەندی هەیە بە تاکەکانەوە ( الافراد )، واتا تاکەکان سەربەستن لەو کەرتەدا و دەوڵەت بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە دەستێوەردانی ئەو کەرتە بکات ، ئەمەش پێی دەوترێت سەربەستییە بەربەستەکان (الحريات ا لمانعة)، واتا ئەم سەربەستییانە ڕێگا لە دەوڵەت دەگرن کە بە هیچ شێوەیەك دەستێوەردانی ئەم جموجۆڵانەی تاکەکان نەکات . ئەوی تریان کەرتی کاروباری دەوڵەتە ، واتا ئەو کەرتەیە کە دەوڵەت جموجۆڵی، بزاڤی تێدا ئەنجام دەدات. لێرەدا تاکەکان بۆیان هەیە سەربەستی خۆیان بەکار بێنن بۆ بەرهەڵستکاری کردن و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بزاڤانەی دەوڵەت ، ئەم سەربەستیەش پێی دەوترێ ، سەربەستی ڕووبەڕووبوونەوە ، (الحريات ا لصادة) . سەربەستییە بەربەستەکان: سەربەستی ئابووری ، سەربەستی کەسێتی ، سەربەستی فیکری دەگرێتەوە. سەربەستی ئابووری یەکێکە لەبناغە سەرەکییەکانی ڕێچکەی لیبرالی کە پێك هاتووە لە : سەربەستی موڵکدارێتی ( حرية التملك ) و سەربەستی پێکوەنانی پرۆژە ، بەڕێوەبردن و سەربەستی بازرگانی و پیشەسازی .

### سەربەستییە ڕووبەڕووبوونەوەکان (( ا لحر يات الصادة )):ـ

ئەم سەربەستییانە بوار دەدەن بە هاوولاتیان بۆ بەرهەڵستکاری دەسەلات لەو بوارانەدا کە بۆیان هەیە دەستێوەردانی بکەن، واتا ڕووبەڕووی دەوڵەت دەبنەوە لەو چوارچێوەیەی کە دەوڵەت جموجوڵی خۆی تێدا ئەنجام دەدات ، ئەم سەربەستییانە پێکهاتوون لە : سەربەستی بلاوکردنەوە ، خۆپیشاندان ، دروستکردنی کۆمەڵە و گروپی جۆراو جۆر. ئەم جۆرە سەربەستییانە مەرج نییە هەموو کاتێك ببنە ئامرازێك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەلات ، لە

بەر ئەوەی هەندێ لەو سەربەستییانە پەیوەندییان بەکاروباری ڕامیاریـەوە نییـە ، بۆ نموونـە دەرهێنانی گۆڤارو ڕۆژنامە وەرزشیەکان ، یان ئـەو کۆمـەڵ و گروپانـەی کە شێوازێکی ڕامیـاری ناگرنە خۆ ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم شتانە هەموو ڕادەیین (نسبي ) ، چونکە دەتوانـرێ هـەموو شتێك لە پێناو سیاسەتدا بەکار بهێنرێ ، تەنانـەت ئـەو ڕۆژنامـەو گۆڤـارو کۆڕو کۆمەڵانـەی ، کە بۆ کاری ڕامیاری بەکار دەهێنـرێن یان پێکەوە دەنرێن. لەبـەر ئـەم هۆیانـەی کە لـە سـەرەوە باسمـان کـرد دەسـەڵات بەهەستیارییەوە مامەڵە لەگەڵ ئـەم سەربەستییانە دەکات ، جیـاوازی دەکات لە نێوان ئـەو گـرۆپ و ڕۆژنامـەو گۆڤارانـەی کە پـەیوەندییان بـە سیاسـەتەوە هەیـە لـە گەڵ ئەوانەی ، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بـە سیاسـەتەوە نیـە ، وەکو ڕۆژنامـەو گۆڤـارە ئـەدەبی و وەرزشـی و کۆمەڵایەتییـەکان، کاتێ بـە ئاسانی مۆڵەت بـە جۆری دووەمیـان دەدات، دەبینین تەگەرە دەخاتە بەردەم جۆری یەکەمیان و بـەو ئاسانیە مۆڵـەتیان پـێ نـادات . هەروەها چاو پۆشـی لـەو گۆڤـارو ڕۆژنامانـە زیـاتر دەکات کە ساڵانە و وەرزیـن تـا ئـەو گۆڤـارو ڕۆژنامانـەی کە ڕۆژانـەن یـان هەفتانـەن ، لـە بـەر ئـەوەی ئەمانـەی دوواییـان زیـاتر ڕووداوی ڕۆژانە و کاتی لە خۆ دەگرن.

## دووەم : چارەنووسی ڕێچکەی لیبرالی (( مصير المذهب الليبرا لي )):

ڕێچکەی لیبرالی وەکو باسمان کرد جەخت لە سەر سەربەستی تاکەکان دەکات ، لـە ڕووی ئابووری و کەسێتیەوە ، ئەوە دیار دەخات کە تاك و دەسەڵات دوو شتی جیـاوازن و سـەربەستی تاکەکەسـی بـە ئـامرازێك دانـاوە بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی دەسـەڵات. بـەڵام ئـەم بۆچوونانــە ڕووبـەڕووی ڕەخنــە بوونەتــەوە لــە بەرانبـەر ئــەوەی ، کـە سەربەسـتی ئـامرازێك بێـت بـۆ ڕووبوونەوەی دەسەڵات ، بۆچوون هەیە دەڵێت: سەربەستی بەشداریە ، واتا تـاك بەشـداری دەکات لـە پێکـەوەنانی دەسـەڵات ، واتـا دەسـەڵات وەکـو خانوویـەك وایـە تاکـەکانیش وەکـو بەردەکانین ، واتا هەر بەردێك بەشێکە لـەو خـانووە ، ئەو خـانووە لـەو بەردانـە پێـك هاتووە ، هەر بەردێك بەشێکە لە پێکەوە نانی ئەو خـانووە. دەسـەڵات لـە چـەند بەشـێك پێـك هـاتووە ، هەر بەشێك لە پێـك هاتـەی دەسەڵات تاکێکە یـان کەسێکە . سـەرچاوەی ئـەم بۆچوونـەش لـە (جان جاك ڕۆسۆ)وە وەرگیراوە کە لـە کتێبـی ( گرێبەسـتی کۆمەڵایـەتی ) دا باسـی لێوە دەکات هەر چەنـدە باسەکانیشی بەم جۆرە ڕوون نین ، بەڵام وەکو ئـەنجام لـەو چوارچێوەیە دەرنـاچن.

رەخنەگران زیاتر مارکسییەکان دەڵێن : رێچکەی لیبرالی باس لە سەربەستی نیشتەجێ بوون و سەربەستی فیکری و هونەری وسەربەستی هاتووچۆ دەکات . بەڵام ئەو سەربەستییانە هەموو پابەندن بە بوونی مایەو سەرمایەوە.

- ئایا دەبێ کەسێکی نەدار ، بێ پارەو پوڵ چی سەربەستیەکی هەبێ لە سەربەستی نیشتەجێبوون لە کاتێکدا لەچەرداخێکدا یان دەوارێك نیشتەجێ بووبێت یان توانای دارایی هەر ئەوەندە بێت لە ناوچەیەکی دوورە دەست نیشتەجێ بێت؟.

- ئایا ئەو کەسانە دەتوانن و سەربەستی ئەوەیان هەیە لە هەر شوێن و جێگایەك بێت نیشتەجێ بن ، یان نیشتەجێ بوونیان بەرەوشی ژیان و باری دارایی خۆیانەوە پێ بەندە؟.

ئەو سەربەستییە بۆ ئەوکەسانەیە کە خاوەن سەرمایەن ، کە بە توانای داراییان دەتوانن ، ئەو سەربەستییە بۆ خۆیان دابین بکەن . هەمان شت بە نسبەت رۆژنامەگەریەوە.

- ئایا رۆژنامەکان بەدەست خاوەن سەرمایەوە نیین ، رۆژنامەیەك ئەگەر بەدەستی سەرمایەدارانەوە بێت ، چینی پرۆلیتاریا چۆن دەتوانێت سوودی لێ وەربگرێت ؟.

ئەو کەسانەش کەتواناییان دەخەنە گڕ بۆ رۆژنامەگەری ، دەبێ مێشکی خۆیان لە قاڵب بدەن و بەعەقڵی سەرمایەداران بنووسن و بدوێن .

## بەستی دووەم :

## ئەنجامی بنچینەی پێ بەندبوون

## - ملکەچی دەوڵەت بۆ یاسا -

لەپێشدا باسی سەربەستی تاکەکانمان کردو ووتمان: سەربەستی تاکەکان کە ناوەرۆکی رێچکەی لیبرالیە، سەرچاوەی پێبەندبوونی دەوڵەتە . لە راستیدا ئەو سەربەستییانە دەبێ یاسا دانی پێیاندا نابێ ، واتا مافێکی یاسایی تاکەکان بن. لێرەدا ئێمە کاتێ باسی پێبەندبوونی دەوڵەت دەکەین ، دەبێ باسی ملکەچی دەوڵەت بۆ یاسا بکەین، لە بەر ئەوەی ئەو سەربەستییانە یاسا باسیانی کردووە و دانی پێیاندا ناوە، سەربەستییەك

ئەگەر ڕێزی لێ نەگیرێت و پێشێل بکرێت، ئەوە چۆن سەربەستییەکە!. ڕێزگرتن لەو سەربەستییانە لەلایەن دەسەڵاتەوە یان دەوڵەتەوە ، جێبەجێ کردن و پەیڕەو کردنی ئەو یاسایانەیە کە ئەو سەربەستییانەی گرتووەتەخۆ،واتا وەکو دەرئەنجامێکی دەستپێکی پێبەندبوون ، ملکەچی دەوڵەتە بۆیاسا ، جا لێرەدا دوو جۆرە یاسا هەیە ، ئەو یاسایانەی کەدەوڵەت خۆی دایان دەنات و پێیان دەڵێن یاسای دانراو ( ا لقانون الوضعي )و ئەو یاسایانەی کە لە سەرەوەی دەوڵەتن و لە دەوڵەت بەرزترن، پێیان دەوترێت یاسای سروشتی ( ا لقانون الطبيعي ). بۆیە پێویست دەکات باسی هەردوو یاسای دانراوو یاسای سروشتی بکەین و ملکەچی دەوڵەت بۆ هەر یەکێ لەوانە .

## یەکەم : ملکەچی دەوڵەت بۆ یاسای دانراو، بەرکار

### ( خضوع الدولة للقانون الوضعي ):

وەك دەزانین دەسەڵات یاسای دانراو دەردەکات ، واتا یاسای دانراو لە دایك بووی دەسەڵاتە . لێرەدا دەوڵەت دەبێت ملکەچی ئەو یاسایانە بێ کەخۆی دەریان دەکات . بەڵام چۆن دەبێت دروستکراو دروستکەر پێبەند بکات ، چۆن دەبێت یاسای دانراو ئەو دەسەڵاتە پێ بەند بکات کە خۆی دای ناوە؟.

هەردوو یاساناسی ئەڵمانی ( ئهرنگ و جلنگ ) . وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە ودەڵێن :

- دەسەڵات بەئیرادەی خۆی پێبەندی یاسای دانراو دەبێت . بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش کەدەڵێ : ئایا بۆچی دەسەڵات بە ئارەزووی خۆی ملکەچی یاسای دانراو دەبێت ؟.

- ئهرنگ وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوەو دەڵێت: بەرژەوەندی دەسەڵات لەوەدایە ملکەچی یاسا بێت ، لە بەر ئەوەی ئەو دەسەڵاتە تا زیاتر ملکەچی یاسا بێت ، زیاتر بەهێز دەبێت و ڕەوایی زیاتر دەبێت ، لەبەر ئەوەی هاووڵاتیان کاتێ دەبینن دەسەڵات بەو جۆرە ملکەچی یاسایە ، وایان لێ دەکات ئەوانیش ملکەچی یاسا بن، لە بەر ئەوەی هەست دەکەن ئەو دەسەڵاتە ڕەوایە ( شرعی )ە. هۆی دووەمی ملکەچی دەسەڵات بۆ

یاسا ، بە بۆچوونی جیلنك ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەوڵەت پێویستی بە یاسا هەیە ئەو یاسایانەی کە جێبەجێ بکرێن لە سەر دەسەڵات و فەرمانبەرو بریکارو تاکەکان. هەروەها یەکگرتووی ئاوەڵناوی یاسایی ( وحدة الصفة القانونية) ، وا پێویست دەکات یاسا جێبەجێ بکرێت لە سەر هەمووان و نابێت و شتێکی ڕەوا نییە و یەکگرتوویی ئاوەڵناوی یاسایش ئەوە پەسەند ناکات ، یاسا جێبەجێ بکرێت لەسەر بریکارو فەرمانبەرو تاکەکان و جێبەجی نەکرێت لەسەر گەورە بەرپرسانی دەسەڵات. لە حاڵەتێکی وادا ئەو دەسەڵاتە ڕەوایی خۆی لەدەست دەدات ، بە دەسەڵاتێکی ڕەوا نابینرێ بەدیدو بۆچوونی تاکەکان. لە پێناوی ئەوەی ئەو دەسەڵاتە ڕەوا بێت و ڕێزی لێ بگیرێت ، پێویستە یاسا لەسەر هەمووان جێبەجی بکرێت تا دەسەڵات و دەوڵەت بە هێزبن و پشتگیریان لێ بکرێ لە لایەن هاوولاتیانەوە، بەلاَم (دیگی) بەتووندی ڕەخنە لەم تێورە دەگرێت و دەڵێ: دەوڵەت کاتێ بە ئارەزووی خۆی ملکەچی یاسا بێ و هەر کاتێ بیەوێ ملکەچ نەبێ و بەو شێوەیە ملکەچ بێ کەخۆی دەیەوێ ، ئەوە لەڕاستیدا ملکەچی نییە و قسەکردن لەسەر ملکەچی دەوڵەت بۆیاسا لەو چوارچێوەیەدا شتێکی بەتاڵە. ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی بەجێیە ، لەبەر ئەوەی هەر ملکەچییەك بکەوێتە ژێر ئیرادەو ئارەزووی خوودەوە ، ملکەچییەکی پتەو نابێت ، لەبارە لە هەر حاڵ و کاتێکدا دەسەڵات یان دەوڵەت ملکەچی ئەو یاسا دانراوانە نەبن کەلەئارادان ، ئەمە بە تەواوەتی حوکمی ڕەوانبێژییە(المنطق)، بەلاَم حوکمی دیڤاکتۆی شتەکان (واقع الامور)لەسەر ئەم تێوەرە چییە؟، لەڕاستیدا لێرەدا دەبێت جیاوازی لەنێوان دوو سیستەمدا بکرێت ، سیستەمێك کەتیایدا دەسەڵات کۆکراوە ( مرکز ) بێ وەکو سیستەمە دکتاتۆریەکان وهاوشێوەکانی ، کە لەم جۆرە سیستەمانەدا تاکی دەسەڵاتدار یان دکتاتۆر لەوانەیە ملکەچ نەبێ بەو یاسا دانراوانەی کە لە ئارادان و ئەمە ڕەوشی زۆربەی زۆری سیستەمە دکتاتۆریەکان و هاوشێوەکانێتی. کە دەسەڵاتی پراکتیکییان لەسەر ڕەوشی دەوڵەت هەیە. بەلاَم ئەمە بۆچوونێکی ڕەها نییە، لەبەر ئەوەی دەسەڵات لەوەیە بەدەست لیژنەیەك بێت ، هەر ئەندامێکی لیژنەکە لە ژێر گوشاری ئەوانی تردا ملکەچی یاسا دانراوەکان دەبێت بەئارەزووی خۆی ، هەندێ جار تاکی

دەسەڵاتدار یان دکتاتۆر ملکەچی یاساو ڕیاساکان دەبێت بەتایبەت لەکاتێکدا ئەو یاساو ڕیاسایانە زۆربەی داب ونەریتەکان لە خۆ بگرن و پەیڕەوی بکەن ئەمەش لەکاتێکدا دەبێ، کە هەستی ئایینی یان هەر وزمیەکی تری گیانی زاڵبێت بە سەر کۆمەڵگە و دەوڵەتدا ، ئەم بارودۆخە یان ئەم ڕەوشە زەمینەیەکی وا دروست دەکات کە تاکی دەسەڵاتدار ملکەچی یاسا دانراوەکان بێت . بەڵام ئەگەر هاتوو سیستەمی دەوڵەت بەجۆرێك بوو جیاوازی لەنێوان دەسەڵاتەکاندا هەبوو ، یان دەسەڵاتەکان بە سەر چەند جەمسەرێکدا ، دابەش کرا بوون ، ئەوە هەر دەسەڵاتێ دەسەڵاتەکەی تر ڕادەگرێت وەکو مۆنتسکیۆ باسی لێوە دەکات ، واتا هەر دەسەڵاتێك سنوور بۆ دەسەڵاتەکانی تر دادەنێت . بەڵام لە ڕاستیدا ملکەچی هەر دەسەڵاتێك لێرەدا ملکەچییەکی بابەتییە زیاتر لەوەی خودیبێ، دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە ملکەچبوونە بابەتییە، واتا ڕەوش و بارودۆخی گشتی دەوڵەت دەیسەپێنێت ، بەهەر حال هەر هەڵسەنگاندنێکی ملکەچی دەسەڵات بەئارەزووی خۆی بۆ یاسا ، دەبێت لە چوارچێوەی ڕەوشی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی هەر دەوڵەتێکدا بە جیا بکرێ و ناتوانرێ بە یەکجاری ڕەت بکرێتەوە و پەسەند نەکرێت ، بێ ئەوەی ڕەچاوی دیڤاکتۆی شتەکان بکرێت.

## دووەم : ملکەچی دەوڵەت بۆ یاسای سروشتی

**( خضوع الدولة للقانون الطبيعي ) :**

وەکو باسمان کرد ملکەچی دەوڵەت بۆ یاسی دانراو ، ملکەچییەکی ئارەزوومەندانەیە ، واتا دەسەڵات خۆی یاسا دادەنات و بە ئیرادەو ئارەزووی خۆیشی ملکەچی ئەو یاسایانە دەبێت. لە بەر ئەو ڕەخنانەی ڕووبەڕووی ئەم تیۆرە بونەتەوە و لە هەل و مەرجێکی مێژووی و بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دەسەڵات ، تیۆری یاسای سروشتی هاتە کایەوە.

ئەمەو دوو تیۆر هەن دەربارەی یاسای سروشتی ، یەکێ لەوانە تیۆری یاسای سروشتی کلاسیکییە، ئەوی تریانیش، تیۆری یاسای سروشتی کۆمەڵایەتییە:

### ١- تیۆری یاسای سروشتی کلاسیکی :

یاسای سروشتی و ڕیاساکانی یاسای سروشتی لەئایین و موراڵ و بنچینەکانی ڕاستی خوازییەوە سەرچاوەیان گرتووە( ئەمە وەکو بناغەیەکیئایینی )، لە پێداویستی مرۆڤو بەرژەوەندی تاکەکان بە حوکمی ڕەوانبێژی مێشك (ئەمە وەکو بناغەیەکی زانستییانە) ، واتا ڕێاساکانی یاسای سروشتی لەبناغەیەکی ئایینی، یان زانستییانەوە سەرچاوەیان گرتووە. لێرەدا دەسەلات بە گوێرەی ئەم تیۆرە دەبێت ئەو یاسایانەی دایان دەنات (یاسا دانراوەکان ) ، بە پێی یاسای سروشتی بن، واتا دەبێت پەیڕەوی موراڵ و ئایین و پێداویستییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بکات. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ملکەچی دەسەلات بۆ یاسای سروشتی ، لە ڕێگای ئەو یاسایانەوە دەبێت کەدەسەلات خۆی دایان دەنێت و تیایاندا پەیڕەوی یاسای سروشتی دەکات ، واتا دەسەلات لێرەدا ملکەچ بوونەکەی ، ملکەچ بوونێکی موراڵ ئامێزە (اخلاقی ). لەم باسەی سەرەوەماندا بۆمان دەردەکەوێت ، کەئەم تیۆرە چەکێکە بۆ دوو شت بەکاردێت ، لە لایەکەوە دەسەلات دەبێت بەگێورەی یاسای سروشتی یاسا دانراوەکان دابنات ، واتا یاسای سروشتی دەسەلات ملکەچ دەکات و سەرفراز نییە لەدانانی ئەو یاسایانەی کە دایان دەنات، بەڵکو دەبێت پەیڕەوی یاسای سروشتی بکات. لەلایەکی ترەوە هۆکارێکە بۆ بەهێز بوونی دەسەلات، چونکە ئەگەر دەسەلات پەیڕەوی یاسا سروشتییەکانی کرد و یاسا دانراوەکانی لە ڕۆشنایی ئەو یاسایانەدا دانا ، ئەوە دەسەلات بە هێز دەبێت.

ئەمەو ڕۆڵی یاسای سروشتی بۆ پێ بەند کردنی دەسەلات ڕۆڵێکی لاوازەلەبەرئەوەی ئەم یاسایە پرانسیپەکانی دیاری کراو نیین و لە بار و گونجاوون بۆ لێکدانەوەی جۆراوجۆر ، لە بەر ئەوەی دەسەلات دەتوانێت بەشێوەیەك لێکیان بداتەوە کەبەرژەوەندی خودی خۆی بپارێزێت ، ئەم کارەی دەوڵەت لە یاسا دانراوەکاندا ڕەنگ دەداتەوەو ملکەچی دەسەلات بۆیاسای سروشتی پەیوەستە بەڕادەی بڕوای دەسەلات بە موراڵ و ئایین و پرانسیپەکانی ئەو یاسایەوە. ئەگەر ئەو دەسەلاتە بڕوای بەهێز بێت بەو پرانسیپانە ئەوە یاسای سروشتی لە یاسا دانراوەکاندا پەیڕەو دەکرێت، واتا پەیڕەوکردن و پەیڕەونەکردنی یاسای سروشتی لە لایەن دەسەلاتەوە لە سەرئیرادەی ئەو دەسەلاتە وەستاوە .

## ٢ ـ تیۆری یاسای سروشتی کۆمەلاّیەتی : ـ

وەکو لە تیۆری یاسای سروشتیدا باسمان کرد دەولّەت ملکەچی یاسای سروشتی دەبێت ، ئەو یاسایەی کە لە دەرەوەو لەسەرەوەی دەولّەتەو هەلّقولاّوی مورالّ و حوکمی مێشك و ڕەوانبێژییە. هەروەها باسی پێبەندی دەولّەتمان کرد بەیاسای دانراوەوە و ووتمان : دەولّەت ملکەچی ئەو یاسایانە دەبێت کەخۆی دایان دەنات . بەلاّم دیگی ڕخنە لە هەردوو تیۆرەکە دەگرێ و دەلّێ : یاسای سروشتی بیرۆکەیەکی میتافیزیقییە، واتا بیرۆکەیەکە لەپشت بابەت و دیڤاکتۆوەیە ( وراء الموضوع والواقع ) . هەروەها دیگی بەرپەرچی ئەوەش دەداتەوە ، کە یاسا دەستکردی دەولّەت بێت و دەلّێت: دەولّەت تەنها وەکو تاکێکە لە تاکەکانی کۆمەلّ و خاوەنی سەروەری نییەو یاسایش دەرناکات ، بەلّکو فەرمانبەرێکەو هەبوونی لە پێداویستییەکانی کۆمەلّ و دابەشکردنی کار لە یەك کۆمەلّگەدا هاتووە . پەیوەندی دەولّەت بەیاساوە هەر ئەوەیە ، دەولّەت یاساکان بەشێوە و شێوازێکی تەکنیکی دادەڕێژێت ، ئەگینا یاسا خۆی هەر هەیەو بناغەی یاساش دەگەڕێتەوە بۆ هەماهەنگی کۆمەلاّیەتی و هەستکردن بەڕاستیخوازی . هەماهەنگی کۆمەلاّیەتی ڕەنگدانەوەی دیڤاکتۆی هەماهەنگی نێوان تاکەکان و هەروەها نێوان توێژە جیاجیاکانی کۆمەلّە. ئەو هەماهەنگییە پێداویستییەکانی کۆمەلّگە سەپاندوویەتی. دیگی دەلّێ : هەر ڕیاسایەکی ( کۆمەلاّیەتی – ئابووری ) کۆمەلّگە هەستی کرد کە پێویستەو داوای سزای کرد بەرامبەر هەرکەسێك سەرپێچی بکات ، ئەو کاتە ڕیاسایەکی یاسایی دێتە کایەوە. واتا یاسا بە بۆچوونی دیگی لەکۆمەلّگەوە سەرچاوە دەگرێ و پێداویستی کۆمەلّگە ڕیاسایەکی ئابووری ـ کۆمەلاّیەتی دێنێتە کایەوەو ئەو ڕیاسا ئابووری –کۆمەلاّیەتیە دەبێتە یاسا . هەر کۆمەلّگەیەك تایبەتمەندی خۆی هەیە ، کۆمەلّ بەهۆی جموجۆلّی ڕۆژانەی تاکەکانیەوە و مامەلّەی تاکەکان لەگەلّ یەکتردا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا : ئابووری ، کۆمەلاّیەتی ، کەلتوریو ڕامیاری ، پێویستی بەڕێکخستن و یاسایەك هەیە کە مافی هەمووکەسێك دیاری بکات . هەر تاکێك دەبێ بزانێت مافی چییەو ئەرکی چییە. واتا مافی بەرامبەر کۆمەلّگە چییەو ئەرکی بەرانبەر ئەو کۆمەلّگەیە چییە . واتا کۆمەلّ لەگەلّ مامەلّەو جموجۆلّی بزافی

ڕۆژانەدا هەست دەکات کەڕیاسایەك هاتۆتە کایەوە بۆ ڕێکخستنی بوارێکی دیاری کراو لەکۆمەڵگەدا . بەڵام ئایا هەبوونی ڕیاسایەك بەسە بۆ ئەوەی بوارێکی دیاری کراوی ژیانی کۆمەڵگە ڕێك بخات؟. لێرەدا دیگی دەڵێ : دەبێ کۆمەڵگە، یان تاکەکانی کۆمەڵگە هەست بکەن کەدەبێ سزا بسەپێنرێتە سەر ئەو کەسانەی کە سەرپێچی ئەو ڕیاسایە دەکەن ، واتا هەبوونی یاسا پەیوەستە بە دوو شتەوە ، هەبوونی ڕیاسایەکی ، کۆمەڵایەتی –ئابووری و سزا .

## ـ ڕەخنە لەسەر بۆچوونەکانی دیگی ـ

وەکو دەزانین یاسا کاتێ دەردەچێت لە دەزگای یاسادانانەوە لە دەوڵەتدا ، لەو کاتەوە پەیڕەو دەکرێت ، کە لە ڕۆژنامە ڕەسمییەکاندا بلاودەکرێتەوە . واتا جێبەجێ کردنی ئەو یاساییە لە ڕووی کاتیەوە دیاری کراوە . هەروەها ناوەڕۆکی ئەو یاسایە ڕوون و ڕۆشن ودیاری کراوە . بەڵام بەگوێرەی بۆچوونی دیگی سەبارەت بەهاتنە کایەوەی یاسا ، کە دەڵێ: یاسا لە ڕیاسایەکی ( کۆمەڵایەتی ـ ئابووری ) و هەست کردنی هاووڵاتیان بە پێویستی سەپاندنی سزا بە سەر سەرپێچی کەران هاتووەتە کایەوە . لێرەدا چەند پرسیارێك دێتە کایەوە :

ـ ئایا ئەو ڕیاسایەی کە دیگی باسی لێوە دەکات چۆن دەبێتە یاسا لە ڕووی چەندێتیەوە ، واتا دەبێ چەند لە هاووڵاتیان هەست بەپێویستی ئەو ڕیاسایە بکەن ؟ .

دەبێت چەند لەهاووڵاتیان هەست بە پێویستی سەپاندنی سزا بکەن لەسەر سەرپێچی کەران ، بۆ ئەوەی ئەو ڕیاسایە ببێتە یاسا ؟

ـ ئەو کاتە ، یان ئەو ماوە کاتییە کەیە، کە ئەو ڕیاسا کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییە دەبێتە یاساو جێبەجێ دەکرێ ؟.

ـ ئایا ناوەڕۆکی ئەو یاسایە چیە، کە هەست و وێژدانی تاکەکانی کۆمەڵ لە ڕیاسایەکی کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەوە دەیکەن بە ڕیاسایەکی یاسایی ؟ .

ـ کێ ئەو ناوەڕۆکە دیاری دەکات ؟ .

لێرەدا ناتوانرێ ئەو دیاری کردنە بخرێتە ئەستۆی تاکەکانی کۆمەڵگە ، چونکە ئەو شتە لە ڕووی پراکتیکەوە مەحاڵە . ئەگەر بڵێین دەسەڵات دیاری دەکات ، ئەوە لەومیە دەسەڵات ئەو ناوەڕۆکە بە پێی بەرژەوەندی خۆی دیاری بکات ، یان هەر ئەو ڕیاسا کۆمەڵایەتی ـ ئابووریە هەر پەسەند نەکات. لێرەدا دەسەڵات ملکەچی یاسا نابێت ، واتا لەهەست و ویژدانی تاکەکانی کۆمەڵ دوور دەکەوێتەوە ، ئەو کاتە دەسەڵات ، دەسەڵاتێکی ڕەوا نابێ و گەل ڕووبەڕووی دەبێتەوە . ئەم ڕووبەڕووبوونەوەش ، لە چوارچێوەی ڕەوشی ڕامیاریدا لەقەڵەم دەدرێت و پەیوەندی بە جیهانی یاساوە نیە. ئەمەو وەکو لە سەرەوە باسمان کرد ، دیگی بناغەی ئەو ڕیاسا کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەی کە دەبێتە یاسا ، دەگێرێتەوە بۆ هەست کردن بە هەماهەنگی کۆمەڵایەتی و ڕاستی خوازی .

ـ دیگی تیۆری یاسای سروشتی بەرپەرچدایەوە کە بیرۆکەیەکی بابەتی نیە و میتافیزیقییە، بەڵام لێرەدا ئەگەر هەماهەنگی کۆمەڵایەتی بگەڕێتەوە بۆ دیڤاکتۆیەکی بابەتی ، کە ئەوەش هەبوونی پراکتیکی و کرداری هەماهەنگی کۆمەڵایەتییە .

ـ بەڵام ئایا ڕاستی خوازی کە دیگی بە یەکێ لە بناغەکانی ڕیاسای یاسایی‌دا دەنێت دەگەڕێتەوە بۆچی دیڤاکتۆیەك ؟

ـ ئایا ڕاستی خوازی شتێکە لە دیڤاکتۆدا وەکو بابەت هەبێت ؟

ـ ڕاستی خوازی شتێکە پەیوەندی بە بیرکردنەوەی مرۆڤەوە هەیە ، واتا حاڵەتێکە لە مێشکی مرۆڤدا دروست بووەو دەگۆڕێ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لە کۆمەڵیەکەوە بۆ کۆمەڵێکی ترو لە کاتێکەوە بۆ کاتێك و وەختێکی تر ، واتا شتێکی میتافیزیقییە هەر وەکو یاسای سروشتی ، کەئەویش هەر ئەومیە مرۆڤ بیری لێ کردوەتەوە . واتا دیگی لە کاتێکدا ، کە یاسای سروشتی و بیرۆکە میتافیزیقییەکانی پەسەند نەکرد ، خۆی لە تیۆرکەیدا پشتی بە هەماهەنگی کۆمەڵایەتی و ڕاستی خوازی بەست ، ڕاستی خوازیش بیرۆکەیەکی میتافیزیقیە هەر وەکو یاسای سروشتی . لێرەدا دیگی ملکەچی دەوڵەت دەگێڕێتەوە بۆ یاسای بابەتی ، کە لە هەماهەنگی کۆمەڵایەتیەوە سەرچاوەی گرتووەو دەڵێ :

پێ بەند بوون و ملکەچی هاووڵاتیان بۆ بڕیارەکانی هەر دەسەڵاتێك هۆکەی ئەوە نییە کە ئەو دەسەڵاتە گەورەترین توانای ماددی و زەبرو زەنگی هەبێ ، ئەو ملکەچییە لەوەوە دێت ، کە ئەو بڕیارانە لەچوار چێوەی یاسای بابەتیدان ؛ واتا دەوڵەت ملکەچ دەبێت بۆ یاسای بابەتی ، هەر ئەو ملکەچبوونەش ڕەوایی بە دەسەڵات دەدات و والەتاکەکان دەکات ملکەچی دەسەڵات ببن . بەڵام لێرەدا دیسان دەوڵەت بە ئارەزووی خۆی ملکەچی ئەو یاسایانە دەبێت یان نابێت. ئەگەر ملکەچ نەبوو ئەوە لە بەرژەوەندی گشتی و لە هەست و نەستی ئەو کۆمەڵە لای داوەو ئەو دەسەڵاتە ڕەوایی نامێنێت و هاووڵاتیان هەست دەکەن کە ڕەوا نییە، ڕووبەڕووبونەوەی ئەو دەسەڵاتە لە لایەن هاووڵاتیانەوە بە شۆڕش و یاخی بوون دەست پێ دەکات، بەڵام ئەم حاڵەتەی کە باسی دەکەین لە ڕاستیدا لە جیهانی سیاسەتدا خول دەخواتەوەو دوورە لە جیهانی یاسا ، ئەو یاسایەی کەدیگی ویستی دەوڵەتی پێ ملکەچ بکات . واتا ملکەچ نەبوونی دەوڵەت بە یاسایی بابەتیەوەو ناڕەوایی دەسەڵات و ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵات لەلایەن هاووڵاتیانەوە ، ئەمانە هەموویان پەیوەندییان بە سیاسەتەوە هەیە زیاتر لەوەی کە پەیوەندییان بە یاساوە هەبێت ، هەروەها ڕەخنە لەسەر دیگی دەگیرێت کە لە نێوان هەموو دیفاکتۆکاندا ، ئەو دیفاکتۆیانەی کە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا هەن وەکو مانەوەی بەهێز (البقاو للاصلح) و ئینتقاو ...

تەنها دیفاکتۆی هەماهەنگی کۆمەڵایەتی هەڵبژاردو کردیە بنچینەیەك بۆ ئەو ڕیاسا ( ئابووری ـ کۆمەڵایەتیانەی ) کە دەبنە یاسا.

واتا دیگی لێرەدا دیفاکتۆی هەماهەنگی کۆمەڵایەتی هەڵبژارد لە نیوان چەند دیفاکتۆیەکی تردا ، واتا پەیڕەوی پرانسیپێکی میتافیزیقی کرد. ئەویش هەڵبژاردنی دیفاکتۆیەکە لەسەر بنەمای ئارەزووی خۆی ، هەروەها دیگی دەڵێ : لەبەر ئەوەی هەماهەنگی کۆمەڵایەتی شتێکی پێویستە بۆ ژیانی کۆمەڵ ، دەبێ تاکەکانی کۆمەڵ پەیڕەوی پرانسیپەکانی بکەن و ڕێڕەوی هەماهەنگی کۆمەڵایەتی بکەن ، لێرەدا دیگی بەهایەکی مۆراڵ ئامێزی دا بە هەماهەنگی کۆمەڵایەتی ، کە ئەو بەها مۆراڵ ئامێزە

یەکێکە لە پرانسیپە میتافیزیقییەکان ، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا پرانسیپێکە لە پرانسیپەکانی یاسای سروشتی . ئەمەو لەسەر بۆچوونەکانی دیکی دەڵێین:

وەکو هەموومان دەزانین سروشت پێش مرۆڤ دروست بووە بە پێی یاساو ڕیاسایەکی زۆر ڕێك و پێك ، بە گیوەرەی موعادەلەیەکی سروشتیی مرۆڤ هاتووەتەکایەوە ، واتا مرۆڤ هیچ دەسەڵاتێکی نەبووە نە لەهاتنەکایەوەی سروشت و نە لە هاتنەکایەوەی خودی خۆی ، جا بۆیە مرۆڤ ئەنجامی چەند یاساو ڕیاسایەکی سروشتییە، کە هێڵە سەرەکییەکانی جموجۆڵی دیاری دەکەن . پێویستی مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ژیانی خۆی لەگەڵ سروشت ، پەنای بردوتە بەر چەند ڕیاسا و پرانسیپێك چ لە ڕووی ماددی وچ لە ڕووی مەعنەوییەوە بێت . بۆ نموونە مرۆڤ پەنای بردوەتە بەر هێزێکی نادیار بۆ پاراستنی خودی خۆی لەو مەترسییانەی، کە لە توانای خۆیدا نەبووە خۆی لێ بپارێزێت، لێرەدا باوەڕبوون بەو هێزە نادیارانە متمانەیەکی دەروونی بۆ مرۆڤ دابین کردووە ، بۆیە مرۆڤ پێویستی بەو جۆرە باوەڕانە هەبووەو دەبێت ، هەڵبەتە سروشت و سەختی سروشت ئەو حاڵەتەی سەپاندووە ، جا لە هەر کۆمەڵێك لە پاڵ چەند هۆیەکی تردا دەبینین ئایینێك ، یان چەند پرانسیپێکی مۆراڵ ئامیز دەبنە ڕیاسای کۆمەڵ، کە لە ڕاستیدا بە یاسای سروشتی دەژمێردرێن. ئەمەو دیکی چاوی لە ئەمەی سەرەوە پۆشیوەو هاتنەکایەوەی یاسای بەوە زانیوە کە ڕیاسایەکی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری هەبێت و کۆمەڵ هەست بە سەپاندنی سزا بکات لە سەر سەرپێچی کەرانی ئەو ڕیاسا، کۆمەڵایەتی ـ ئابووریە .

بەڵام ئەمەی دیکی باسی دەکات قۆناغێکە لەو قۆناغانەی یاسای سروشتی کە باسمان کرد ، واتا دیکی چاوی لە چەند قۆناغێکی دروست بوونی یاسا پۆشیوە ولە قۆناغێکی پاشترەوە دەستی پێ کردووە، بەڵام وەك و ئەنجام هەر بەقۆناغێکی یاسای سروشتی لەقەڵەم دەدرێ. بۆچوونەکانی دیکی لەناوەوەی کۆمەڵەوە سەرهەڵئەدەن ، بۆیە هەندێ لەنووسەران ناوی تیۆری یاسای سروشتی کۆمەڵایەتییان لەبۆچوونەکانی دیکی ناوە .

ئەمەو وەکو دەزانین یاسای دانراو ئەو یاسایانەیە، کە لە لایەن دەزگای دەسەڵاتی یاسادانانەوە دادەنرێن و لەو ڕۆژەوە پەیڕەو دەکرێن کەلەڕۆژنامە گشتیە ڕەسمییەکاندا

بلاّودەکرێنەوە ، هەڵبەتە بەگرێ بوون و فراوان بوون و تێکەڵ بەیەك بوونی ژیانی کۆمەڵگەی ئەمرۆ ئەم دیڤاکتۆیە دەسەپێنێ . کۆمەڵگەی ئەمرۆ ، کۆمەڵگەیەکی فراوان و تێکەڵ و پێکەڵە لەهەموو بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەکاندا. بەجۆرێك پێویستی بە ڕێکخستنی وورد و موورد هەیە بۆدیاری کردنی ماف و ئەرکی هەرتاکێك لە کۆمەڵگە بەشێوەیەك هەموو تاکێکی کۆمەڵ بزانێت ، چ لەسەرەو وچ دەکەوێتە ئەستۆی .

ئەمەو لەبەر لاواز بوونی پێبەندبوونی خوودی تاکەکان و لاوازبوونی مۆراڵ و پەیوەندی کۆمەڵایەتی ، پێویست دەکات کۆمەڵگە ڕێك بخرێت لەلایەن دەزگایەکی تایبەت بە دەسەلاّتی یاسادانانەوە.

شتێکی سروشتییە ئەگەر بڵێین ، ئەویاسایانەی کە لەدەزگای یاسادانانەوە دادەنرێن لە ئەو یاسایانە پێك دێن ، کە هەر کۆمەڵگەیەك هەست بە پێویست بوونیان دەکات ، کە گونجاون لەگەڵ داب ونەریت وپێویستییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە. واتا بنچینەیان دەگەڕێتەوە بۆیاسای سروشتی . ئەمەو لەڕاستیدا ملکەچ بوون ، یان ملکەچ نەبوونی دەوڵەت چ بەیاسای دانراوەوە بێت چ بەیاسای سروشتییەوە، بابەتێکە پەیوەندی بە سیستەمی پەیڕەوکراوەوە هەیە لە دەوڵەت دا .

لەسیستەمی دکتاتۆریدا ، دکتاتۆر بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی ئامادە نییە هەر یاسایە پەیڕەو بکات کە دژ بە بەرژەوەندییەکانی بێت، زاڵبوونی گیانی پیاو گەورەی ، پەیوەندیە کەسینەیی‌یەکان، نەبوونی پارت و لایەنی بەرهەڵستکار، ڕاوەستانی حوکمی دکتاتۆر لەسەر بناغەی زەبر و زەنگ و هاتنی لە ڕێگای کودەتای سەربازی و لەو جۆرانەوە، نەبوونی پرۆسەی هەڵبژاردن و پێویست نەبوون بەدەنگی خەڵکی و هەوڵدان بۆ بەردەوام بوونی حوکمی دکتاتۆر بۆ درێژترین ماوە بە هەر شێوەیەك بێت، دەبێتە هۆی ملکەچ نەبوونی دەزگاکانی دەسەلاّت بەیاساوە و پەیڕەوکردنی بەپێی ئارەزووی کەسێتی. لەڕاستیدا دەسەلاّت لێرەدا ملکەچی ئەو یاساو ڕیاسایانە نابێت کە پەیڕەوکردنی لەبەرژەوەندی خۆیدا نەبێ، لەبەر ئەوەی هۆکاری بابەتی‌نیە بۆ

سەپاندنی ئەو یاسایانە بەسەر دەسەلاتدا، بۆ نموونە ئەمڕۆ لەزۆربەی دەوڵەتە دکتاتۆرییەکاندا یاساکانی پارتایەتی (احزاب)ڕۆژنامەگەری ، پەرلەمان هەن .

بەلام هیچی پەیڕەو ناکرێ و کاری پراکتیکی پێناکرێ ، چونکە لەبەرژەوەندی کەسی دەسەلاتداردا نییە .

بەلام لە دەوڵەتی دیموکراسیدا بەتایبەت ئەو دەوڵەتانەی کە بەشێوەیەکی باش دیموکراسیان تێدا جێ بەجێ دەکرێت ، دەبینین دەزگای جۆراوجۆر هەن ، دەزگای یاسادانان کەلەلایەن خەلکەوە هەلدەبژێردرێت . دەسەلاتی ڕاپەڕاندن کەلە هەندێ سیستەمدا ، دەبێ هەرلەلایەن خەلکەوە هەلبژێردرێت ، یا هەلقولاوی ئەو پەرلەمانە بێ کە خەلك هەلیبژاردووە، هەبوونی دەسەلاتی دادوەری سەربەخۆ . واتا هەبوونی چەند جەمسەرێکی جیاواز ، یان هەبوونی چەند دەسەلاتێکی جیاواز کەدەبێتە هۆی ئەوەی هەر دەسەلاتێك ئەوانی تر پێ بەندبکات یان وەکو ـ مۆنتیسکیۆ ـ دەلێ : هەر دەسەلاتێك ئەوانی تر ڕادەوەستێنێت (( السلطة توقف السلطة )) . لەڕاستیدا تەنانەت بەنەبوونی ئەم دەسەلاتە جیاوازانەش دیسانەوە دەلێین: ملکەچی هەر دەسەلاتێك پەیوەستە بە ڕەوشی گشتی دەوڵەتەوە و باری بابەتی و هەبوونی لایەنی گوشار . بۆ نموونە هەبوونی پارتی بەرهەلست کار ، دەبێتە هۆی بەستنەوەی پارتی دەسەلاتدار ، لەبەرئەوەی هەر هەلەیەك یان پێشێل کردنێکی یاسایی لەلایەن پارتی دەسەلاتدارەوە دەبێتە هۆی ڕەخنە کردن و لەسەر نووسینی لەلایەن ڕۆژنامەکان و ئامرازەکانی دیکەی ڕاگەیاندن و بەهەل گواستنەوەی لەلایەن پارتی بەرهەلستکارەوە بۆ لاواز کردنی دەسەلات دار ، بۆیە هەبوونی ململانێ و خۆ دەرخستنی هەر لایەنێك کەئەو باشترەلەلایەنەکانی دیکە، پارتی دەسەلاتدار ناچاردەکات نەك هەر یاسا پەیڕەو بکات بەلکو شتی باشتریش بکات بۆ ڕازی کردنی خەلکی و لاوازکردنی لایەنی ڕامیاری بەرانبەری . وەکو لێرەدا دەردەکەوێت ملکەچ بوونی دەسەلات ملکەچبوونێکی خوودییە، واتا دەسەلات خۆی ملکەچ دەبێت ، بەلام بە ناچاری لە ژێر کاریگەری گوشارو هۆکاری بابەتی و ڕەوشی گشتی لەباری دەوڵەت .

## باسی دووەم

## ـ ئامرازەکانی پێ بەندکردنی دەوڵەت ـ

وەکو ئاماژەمان پێکرد و لەپێناو پاراستنی سەربەستی تاکەکان ، دەوڵەت دەبێ پێبەند بێت بەیاساوە ، بەڵام لە پێناو پێبەندکردنی دەوڵەت بەشێوەیەکی ئاکتیف و پراکتیکی ، دەبێت ئامراز هەبێت بۆ ئەنجام دانی ئەو پێبەندیە ، ئەو ئامرازانەش هەندێکی کاریگەری هەیە بۆپێبەندکردنی دەوڵەت و پێبەندی دەکات بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ.ئەو ئامرازانەش ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕامیارین .

هەروەها ئامرازی دیکەش هەیە دەوڵەت پێبەند دەکات بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ، ئەو ئامرازانەش لەچاودێری لە سەر بڕیارەکانی دەسەڵات و بەشداری کردن لە بڕیارەکانی دەسەڵات پێك دێن .

بۆیە پێویست دەکات باسی هەردوو ئامرازە ناراستەوخۆ و ئامرازە ڕاستەوخۆکانی پێبەندکردنی دەوڵەت بکەین و باسەکەمان دەکەین بە دوو بەستەوە لە بەستی یەکەمدا باسی ئامرازە ناڕاستەوخۆکانی پێبەندکردنی دەوڵەت دەکەین و لە بەستی دووەمدا باسی ئامرازە ڕاستەوخۆکانی پێبەندکردنی دەوڵەت دەکەین : ـ

### بەستی یەکەم :

### ـ ئامرازە ناڕاستەوخۆکانی پێبەنکردنی دەوڵەت ـ

وەکو ئاماژەمان پێ کرد ، ئەم ئامرازانە پەیوەندیان بە ڕەوشی ئابووریو کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەوە هەیە، بۆیە پێویست دەکات بە جیا باسی هەر حاڵەتێك بکەین:

یەکەم : سیستەمی ئابووری و پێبەند بوونی دەوڵەت:

یەکێ لەئامرازە ناڕاستەوخۆکانی پێبەند بوونی دەوڵەت سیستەمی ئابووری پەیڕەو کراوە ، لەسیستەمی سەرمایەداری دا (النظام الرأسمالي) سەرمایەدارەکان

خاوەن پرۆژە ئابوورییەکانن و جموجوڵی ئابوورییان بەدەستە ، واتا جموجوڵی ئابووری لە دەوڵەتدا سەرمایەداران دەیبەن بەڕێوە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەسەڵاتی ئابووری بە دەستی سەرمایەدارانەوەیە ، ئەوان خاوەن بڕیار و حوکمڕانن لە بواری ئابووریدا ، ئەمەش خۆی لە خۆی دا دەسەڵاتی ئابووری لە دەسەڵاتی ڕامیاری جیا دەکاتەوە و دەبێتە هۆی جیاکاری دەسەڵاتی ئابووری لە دەسەڵاتی ڕامیاری ، ئەم حاڵەتەش وەکو ئەنجام دەبێتە هۆی پێ بەند بوونی هەر دەسەڵاتێك بەوی دیکەوە ، لە ڕاستیدا ڕەخنە لەسەرئەم بۆچوونانە دەگیرێت لە لایەن سۆشیالیستەکانەوە ، دەڵێن:

جیاکاری نێوان دەسەڵاتی ڕامیاری و دەسەڵاتی ئابووری لەسیستەمی سەرمایەداریدا شتێکی هەڵبەستەیە ، لە بەرئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت چ ئابووری بێت یان ڕامیاری بە دەستی سەرمایەدارەکانەوەیە، ئەوان خاوەن بڕیارن وحوکم ڕانی ڕاستەقینەن . بەڵام لە سیستەمی سۆشیالیستیدا ، دەوڵەت جموجووڵی ئابووری بەڕێوە دەبات ، واتا خۆی خاوەنی دەسەڵاتی ئابوورییە لە پاڵ دەسەڵاتی ڕامیاریدا، واتا هەردوو دەسەڵاتی ئابووری و ڕامیاری لە دەستی دەوڵەتدا کۆ دەبنەوە.

بە بۆچوونی لایەنگرانی سیستەمی سۆشیالیستی ، بە چاککردنی ژیانی ئابووری گشتی وتاکەکانی کۆمەڵ وفراوانکردن و دابین کردنی ئامرازی ماددی ، تاکەکانی کۆمەڵ دەتوانن سوود لەو سەربەستییانە وەربگرن کە لە یاساکاندا هاتووە، لێرەدا دەوڵەت نەك دەبێ پێ بەند بێت ، بەڵکو دەبێت توانای بخاتە گڕ بۆ دابین کردنی هەموو ئامرازێکی پێویست بۆ ئازادی وسەرفرازی تاکەکانی کۆمەڵ.

لێرەدا شتەکان بەشێوەیەکی ڕەها وەرناگیرێن ، نە لە سیستەمی سەرمایەداری دا و نە لە سیستەمی سۆشیالیستیدا .

لە سیستەمی سەرمایەداریدا ، ئەگەر هاتوو سەرمایەداران خاوەن هەردوو دەسەڵاتی ئابووری و دەسەڵاتی ڕامیاری بوون، ئەوە هیچ هەبوونێك بۆ سەربەستی تاکەکەس نامێنێت ، سەرمایەداران دەبنە خاوەن دەسەڵاتی پراکتیکی و فیعلی ، سەرمایەداران بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان پێبەند نابن بەهەر ڕیاساو یاسایەکەوە کەدژ بەو بەرژەوەندییە بێت. بەڵام کاتێ لە دەوڵەتدا لە پاڵ هەبوونی دەسەڵات ونفوزی

سەرمایەداران ، نفوز و گوشاری دیکە هەبن. وەکو کۆمەڵەو دامەزراوە کرێکارییەکان و نوێنەرانی چین و توێژەکانی تر، بەشێوەیەك پێکهاتەی دەوڵەت ڕەنگ و دەنگی ئەو هەموو توێژ و کۆمەڵ و دامەزراوە جیاجیایانە بداتەوە، ئەو کاتە هاوکێشی بەرژەوەندییە جیاجیاکان و گوشاری هەر گروپێك دەبنە زەمانەتی پاراستنی سەربەستییەکانی تاکەکانی کۆمەڵ و نەك تەنها پێ بەندبوونی دەوڵەت ، بەڵکو دەستێوەردانی دەوڵەتیش لەپێناو سنوور دانان بۆ سەرمایەداران و نەهێشتنی چەوساندنەوە مۆنۆپۆل کردن ، هەروەها دابین کردنی ئامرازی سوود وەرگرتنی تاکەکانی کۆمەڵگە لەو سەربەستی و ئەو ئازادییانەی کە لە یاساکاندا هاتوون .

هەروەها لە سیستەمی سۆشیالیستیدا ، ئەگەر هاتوو سیستەمێکی دکتاتۆری یەك لایەنە بوو ، ناوەند هەموو بڕیارێکی بەدەست بوو ، ئەو کاتە بە بۆچوونی من تاکەکانی کۆمەڵ نە ئامرازی ماددی ونە هیچ جۆرە بوارێکیان پێ دەدرێت بە ئازادی بژین ، دەوڵەت یان با بڵێین دکتاتۆری سۆشیالیزم هیچ پێ بەند نابێ بە هەر یاساو ڕیاسایەك کە دژی بەرژەوەندییەکانی بێت ، بەڵام سیستەمێکی سۆشیالیستی لەچوارچێوەی دیموکراسیدا باشترین نموونەی دەسەڵاتداریەتیە، لەو سیستەمەدا دەوڵەت هەم خۆی ئامرازی ماددی دابین دەکات ، هەم دەبێتە زامنی سوود وەرگرتنی تاکەکانی کۆمەڵ لەئازادی و سەربەستییەکانیان .

## دووەم :سیستەمی کۆمەڵایەتی وپێ بەندبوونی دەوڵەت : ـ

دەوڵەت لەبەشێکیدا پەیوەندییەکە لەنێوان حوکم ڕانەکان و حوکم کراوەکان. پێبەندبوون و پێبەندنەبوونی دەسەڵات پەیوەندییەکی زۆری بەحوکمکراوەکانەوە هەیە، واتا ئاستی کۆمەڵایەتی حوکم کراوەکان

چوارچێوەی شێوازی حوکم ڕانی لە دەوڵەتدا دیاری دەکات .

لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا دەبینین ئاستی هۆشیاری و زانیاری کۆمەڵانی خەڵك لاوازە و کەم ئاستە، لە تایبەتمەندییەکانی ئەو کۆمەڵگەیانە باوەڕ بوونی تاکەکان بە قەدەرو کەسیەتی پەرستن و بە پیرۆز دانانی چەند کەسانێکی ناو کۆمەڵ و بە گەورە

زانین و شانازی کردن بە خەڵکی بە هێزو توندو تیژەوە ، ئەم تایبەتمەندیانەش هەڵبەتە هەڵقوڵاوی پێویستیەکانی ئەو کۆمەڵگەیانەن ، بۆ نموونە لە وولاتێکی کشتوکاڵی دوا کەوتوودا لەو ناوچانەی کەدووره دەستن . خەڵکی بۆ دروێنەی دانەوێڵە داست بەکار دێنن ، واتا بە بازوی خۆیان بست بە بست لە گەڵ ئەو دروێنەیەدا لە کاردان ، ئەوەش ماندووبوونێك و توانایەکی باشی دەوێت ، پاشان بە تایەکردنی دروێنەو بەخەرمانکردنی و کووتانی خەرمان لە ڕێگای بەکار هێنانی ئاژەڵەوە و پاشان شەن و کەوکردنی خەرمانە کووتراوەکە، ئەوەش دەبێت چاوەڕوانی بای شەماڵ بکرێت و یان هاتنی با لە یەك لاوە بە شێوەیەکی بەردەوام بۆ ئەوەی دانەوێڵەکە لە کاکە جیابکرێتەوە، تەنیا لەو پرۆسەیەدا ، کە پرۆسەی دروێنەیە ، ئەگەر باری دەرونی ئەو خەڵکە شیبکەینەوە دەبینین دوو شتی سەرەکی خۆی بەسەریدا سەپاندووە ، یەکەم باوەڕبوون بەهێزو تواناو بازوو ، دووەم باوەڕبوون بەقەدەر. جا بۆیە هەر دەسەڵاتێك هەبێت لە گۆڕەپاندا بە مەرجێك لەگەڵ پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی ئەو خەڵکەدا بگونجێ ، ئەوە ئەو خەڵکە قبووڵی ئەو حوکمە دەکەن و هەندێ جار دەسەڵاتی بەهێزو توندوتیژیان خۆش دەوێت ، هەر تەنگ و چەڵەمەیەك تووشیان ببێت تەنانەت ئەوەش لە لایەن دەسەڵاتەوە بێ ، بە قەدەر لە قەڵەمی دەدەن و باری ماندووی جەستەیی و گرانی گوزەرانیان بواریان پێ نادات بایەخێکی ئەوتۆ بەسەربەستییەکان بدەن، وەکو ئاماژەمان بۆ کرد پێ شێل کردنی ئەو سەربەستییانەش لەلایەن دەسەڵاتەوە بە شتێکی لە چارەنووسراو لە قەڵەم دەدەن .

ئەمە لە لایەك ، لەلایەکی دیکەشەوە، کۆمەڵگە دواکەوتووەکان یان با بڵێین دەوڵەتە دواکوتووەکان، ئامرازی گواستنەوەو گەیاندن تیایاندا لاوازە لە نێوان ناوەندو زۆربەی ناوچە دووره دەستەکان، کە پەیوەندییەکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نییە بەهۆی نەبوونی ئامرازەکانی گواستنەوەو گەیاندن، بۆیە دابڕانێکی جێگەیی (مکانی) هەیە لەئارادا . لە حاڵەتێکی وادا دەوڵەت ناتوانێ دەستێوەردانی کاروباری ئەم ناوچانە بکات، بۆیە پێبەند بوونێکی جێگەیی (تقید مکانی) دروست دەبێت . واتا دەوڵەت بە حوکمی دابڕانی ئەو ناوچانە پێبەند دەبێت و دەست ناخاتە کاروباری ئەو ناوچانەوە.

ئەمەو پەیوەندییەکی پتەو هەیە لە نێوان باری هۆشیاری کۆمەڵایەتی و دیموکراسییەتی لیبرالیدا. لە توانادا هەیە دیموکراسی لیبرالی پەیڕەو بکرێت لە کۆمەڵگەیەکی هۆشیارو شارەزادا لە بووارەکانی ئابووری و ڕامیاری و کەلتوریدا .

بەڵام لەکۆمەڵگەیەکی دواکەوتوودا پەیڕەوکردنی شتێکی ئاسان نییە، سەرکەوتنی پرۆژەیەکی لەو جۆرە زۆرمەحاڵە .

جا بۆیە هەندێ جار لەو کۆمەڵگەیانەدا دەسەڵاتێکی بە هێز دێتە کایەوەو سۆشیالیزم دەکاتە بەرنامەو بوارێکی ئەوتۆ ناداتە سەربەستییە تاکە کەسیەکان، ئەو سەربەستییانە نابنە کۆسب لە ڕێگای دەسەڵاتدا لە پێناو پێشخستنی دواکەوتووی کۆمەڵکە لە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو تر و هۆشیارتر ، واتا دەسەڵاتی سۆشیالیزم بایەخێکی ئەوتۆ ناداتە سەربەستیە تاکەکەسیەکان وپێ بەندیش نابێت بەو سەربەستییانەوە لەپێناو گۆڕانی ئەو کۆمەڵگەیەو دروست کردنی شۆڕشێکی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی ، بەڵام لە حاڵەتێکی وادا ئەو دەسەڵاتە دەبێت بەهۆشیارییەکی زۆرەوە کار بکات ، ئەگینا هەموو ئەنجامەکانی بەپێچەوانەوە دەگەڕێتەوە ، پێشکەوتنێکی لەو جۆرە پێویستی بەبڕینی چەند قۆناغێکی یەك لەدوای یەك هەیە و بەشێوەیەکی لەسەرخۆ پلە بە پلە .

## سێیەم : ڕەوشی ڕامیاری و پێبەند بوونی دەوڵەت .

لە بابەتەکانی ڕابردوومانَدا باسی ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتیمان کرد و ڕادەی کارتێکردنیان لە سەر دەسەڵات و پێبەند کردنیان بۆ دەسەڵات .

لێرەدا دەبێت ئەوە ڕوون بکەینەوە کەباری ڕامیاری پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بەباری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، تا باری ئابووری وکۆمەڵایەتی لە ڕەوشێکی باشدا نەبێت ، ئەوە سیستەمێکی ڕامیاری پێشکەوتوو مەحاڵە بێتە کایەوە، ئەو سیستەمەی کە ببێتە هۆی پێبەند کردنی دەوڵەت بەئەو ڕیاساو یاسایانەی کە لە ئارادان. بە هەر حاڵ سیستەمێکی ڕامیاری پێشکەوتوو کە لەسەر بناغەی دیموکراسیو هەڵبژاردن بنیاد نرابێ، ئەوە بێ گومان دەوڵەت و دەسەڵاتداران دەخاتە چوارچێوەیەکی یاساییەوە، کە تیایدا پێبەند دەبن بە

یاساکانەوە. هەبوونی هەڵبژاردن و جەمسەری جیاجیای دەسەڵات و دابەش بوونی دەسەڵات بە سەر چەند جەمسەرێکداو پێکهاتەی دەوڵەت بە شێوەیەکی فیدرالی یان نانـاوەندی ( لامرکزی ) ، ئەمانە هەمووی زامنی پێبەند بوونی دەوڵەتن بە یاساوە ، هەڵبژاردن وا لە هەر کەس و پارتێك دەکات هەوڵ بدات کە ڕەزامەندی خەڵك بە دەست بێنێت ، ئەوەش بێ گومان لە ڕێگای بەدیهێنانی پێویستییەکانی ئەو خەڵکەوە دەبێت . هەروەها هەڵبژاردن ، واتای هەڵبژاردنی پارتێك یان کەسێك لە نێوان چەند پارتێکدا یان چەند کەسێکدا، لەو حاڵەتەدا ئەو پارتانە یان ئەو کەسایەتیانە ، دەکەونە ململانێیەکی پۆزەتیڤانەوە ، بۆ بەدی هێنانی ڕەزامەندی خەڵکی لە ڕێگای خزمەت کردنیانەوە . ئەمەش خۆی لەخۆیدا پرۆسەیەکە کە دەسەڵاتدار ناچار دەکات پێبەند بێت بە یاساوە . ئەمەو ئەگەر دەسەڵاتدار کاتێك بوواری ئەوەی هەبێ بۆ جارێکی دیکە هەڵبژێردرێتەوە، ئەوە لەکاتی حوکم کردنندا هەموو توانا و ووزەیەکی دەخاتە گڕ بۆ پێشخستنی دەوڵەت و هەوڵ دەدات کارێکی وا نەکات ڕەخنەی بێتە سەرو بیتە هەرا لە سەری لە لایەن پارتە نەیارەکانەوە . واتا پێشێلی یاسا ناکاو پێبەند دەبێت پێیەوە ، بۆ ئەوەی لەلایەکەوە ڕەزامەندی خەڵکی بەدەست بێنێت و لەلایەکی ترەوە ڕەخنە نەخاتە بەر دەستی پارتە نەیارەکانی سەر گۆڕەپانی ڕامیاری . بەڵام بۆچوون هەیە دەڵێت : چاودێری هاووڵاتیان بۆ دەسەڵات لاوازە و هاووڵاتیان ئەوەندە گرنگی بە بەڕێوەبردنی دەسەڵات نادەن تەنیا لە ماوەیەکی کورتدا نەبێ ، کە ئەویش نزیکەی شەش مانگێکە لە نزیك بوونەوەی هەڵبژاردن ، تەنها لە پێنج ـ شەش مانگێکدا هاووڵاتیان بایەخ بە دەسەڵات دەدەن و گفتوگۆی لە سەر دەکەن ، ئەو دوایی وەختەکانی دیکە دەسەڵات بێ چاودێرییەکی ئەوتۆ دەمێنێتەوە، بۆنموونە ئەگەر هەڵبژاردن (٤) ساڵ جارێك بێت ، ئەوە لە ماوەی سێ ساڵ و شتێکدا دەسەڵات بێ چاودێری دەمێنێتەوە، لەو ماوە کورتەی کە (٦،٥) مانگێکە ، دەسەڵاتداران هەوڵ وکۆششی خۆیان دەخەنە گڕ بۆ کارکردن لە ڕای گشتی و ڕازی کردنی خەڵکی و متمانە پێدانیان کە ئەوان بەرژەوەندییەکانی ئەو خەڵکە دابین دەکەن ، دیسانەوە کارێکی وا دەکەن خەڵك دەنگیان پێ بدات. بە هەر حاڵ لە گەڵ ئەم بۆچوونەشدا هەڵبژاردن باشترین زەمانەتە بۆ کۆسپ دانان لە بەردەم دەسەڵات و پێ بەندکردنی بە یاساوە. هەروەها دابەش بوونی دەسەڵات بە سەر چەند جەمسەرێکدا دەبێتە هۆی پێبەندبوونی هەر لایەنێك

لە ژێر گوشاری ئەوانی تردا ، بۆ نموونە هەبوونی دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادوەری ، دەبێتە هۆی پێبەند بوونی هەر دەسەڵاتێك لە بەر ئەوەی کارەکان دیاری کراوون و هیچ دەسەڵاتێك لەو دەسەڵاتانە ناتوانێ لە کاری خۆی لابدات ، واتا پێبەندە بە سنووری دەسەڵاتی خۆیەوە. ئەمەو لە کاتێکدا باسی جیاکاری نێوان ئەم سێ دەسەڵاتە دەکەین ، دەبێ ئەوە لە بەر چاو بگیرێت ، کە ئێمە باسی هەبوونی ئەم سێ دەسەڵاتە لە وڵاتێکی دیموکراسی ڕاستەقینەدا دەکەین ، کە دەسەڵات وگواستنەوەی دەسەڵات بەپێی پرۆسیسێکی دیموکراسیانەی پاك و خاوێن بەڕێوە بچێت، هەروەها پێکهاتەی دەوڵەت بە تایبەتی دەوڵەتی فیدرالی و ناناوەندی ، خۆی لە خۆیدا پێبەندی دەسەپێنێت بە سەر ناوەندا ، چونکە لە زۆر حاڵەتدا ، دەستوور کاروبارەکانی ناوەند دیاری دەکات بە شێوەیەکی سنوور دیاری کراو ، بەڵام هەموو ئەو کاروبارانەی کە دەمێننەوە هەمووی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی هەرێمە ناناوەندییەکان یان هەرێمە فیدرالییەکان. بە مەرجێك ئەو هەرێمانە هیچ یاسایەك دانانێن بە پێچەوانەی ئەو دەستوورەوە بێت. واتا لێرەدا هەم دەوڵەتی ناوەندی پێبەند دەبێت بە یاساوە و نابێ دەستێوەردانی کاروباری هەرێمەکان بکات ، زیاتر لەو سنوورەی بۆی دانراوە. هەروەها ، هەرێمەکان ناتوانن بڕیارێك ، یان یاسایەك دەربکەن ، کە بە پێچەوانەی دەستووری دەوڵەتەوە بێت. ئەمە خۆی لە خۆیدا پێبەندییەکی دوو لایەنە دێنێتە کایەوە، هەم لە لایەن ناوەندەوە، هەم لە لایەن ئەو هەرێمانەی کە دەوڵەتیان لێ پێك هاتووە.

## بەستی دووەم :

## ئامرازە ڕاستەوخۆکانی پێبەند کردنی دەوڵەت :

### یەکەم : چاودێری لە سەر بڕیارەکانی دەسەڵات: ـ

هەر دەسەڵاتێك بە یاسا و بڕیار دەسەڵاتی خۆی بەڕێوە دەبات ، جا بۆ پێبەند کردنی هەر دەسەڵاتێك دەبێ ئەو دەسەڵاتە بخرێتە ژێر چاودێرییەوە، لە پێناو زیاتر ڕوون کردنەوەی چاودێری پێویستە باسی ئەوە بکەین، کە یاساکانی دەوڵەت هەموویان یەك بەها و یەك کێشیان نییە، بەڵکو پلە بە پلەن (تدرج)، یاسای بناغەیی ، بنەڕەتی(دەستوور) لە سەرەوەی هەموو یاساکانەوەیە، پاش دەستوور یاسای ئاسایی

دێت کە لە دەزگای یاسادانانەوە دەردەچێت ، پاشان ئەو یاساو بڕیارانە دێن کە لە سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران و بریکارەکانەوە دەردەچن. بە پێی پلە بە پلە (تدرج)، بڕیارەکانی سەرۆك کۆمار ، سەرۆك وەزیران ، وەزیرەکان و بریکارەکان نابێت بە پێچەوانەی یاسا ئاساییەکانەوە بن ، بەڵکو دەبێت گونجاو بن لە گەڵیاندا ، یاسا ئاساییەکان دەبێ گونجاو بن لە گەڵ دەستووردا ، ئەو یاسایانە نابێ بە هیچ شێوەیەك بە پێچەوانەی دەستوورەوە بن.

لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە، ئایا ئەو چاودێریە چی لایەنێك دەیکات؟.چاودێری لەسەر گونجاوی بڕیار و یاساکان لە گەڵ یاسای پلە سەرەوەدا تایبەتە بە دەزگای یان دەسەڵاتی دادوەرییەوە، بەڵام لێرەدا دوو جۆرە دادگا هەیە بۆ چاودێری.

یەکێ لەوانە دادگای ئاساییە کە تەماشای ململانێ و کێشەکان دەکات چ لە نێوان هاووڵاتیاندا بێت ، چ لە نێوان دەزگا کارگێڕییەکان و هاووڵاتیاندا بێت، ئەمە لە بەریتانیا پەیڕەو دەکرێت.

ئەوەی تریانیش دادگای تایبەتە، کە تایبەت دەبێت بەو کێشەو ململانێیانەی کە پەیوەندییان بە کاری بەڕێوەبردنەوە هەیە، بۆ نموونە لە فەرەنسا دەزگایەکی دادوەری هەیە کە پێی دەڵێن ئەنجومەنی دەوڵەت ، کە تایبەتە بە چاودێری دەزگاکانی بەڕێوەبردنەوە. لێرەدا دادگا چ ئاسایی بێت یان تایبەت هەڵدەستێت بە بەتاڵ کردن و پەکخستنی ئەو بڕیار و یاسایانەی کە بە پێچەوانەی ئەو یاسایانانەن کە لە پلەیەکی بەرزتردان بە گوێرەی ئەو پلە بە پلەیەی کە لە نێوان یاساکاندا هەیە. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە هەر پێبەندییەکی دەوڵەت بە هەر ئامراز و شێوەیەك بێت بە چاودێری لەسەر بڕیارەکانی دەسەڵاتیشەوە، پێویستی بە کەش و هەوایەکی دیموکراسی لیبرالی ڕاستەقینە هەیە، کە تیایدا هەر دەسەڵاتێك کێشی خۆی هەبێت ، یەکێ لەوانەش دەسەڵاتی دادوەرییە کە دەبێت دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ هەبێت ، کە هیچ گوشارێکی لە سەر نەبێت لە لایەن دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنەوە، یان هەر دەسەڵاتێکی تری دەوڵەت.

**دووەم: بەشداری لە بڕیارەکانی دەسەڵات: -**

وەکو دەزانین سێ جۆر دیموکراسی هەیە. دیموکراسی نوێنەرایەتی ، دیموکراسی ڕاستەوخۆ ، دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ.

دیموکراسی نوێنەرایەتی ئەو دیموکراسیەیە کە گەل نوێنەرەکانی هەڵدەبژێرێت بۆ ماوەیەکی دیاری کراو ، تیایدا ئەو نوێنەرانە هەڵدەستن بە کاری یاسادانان و بەڕێوەبردنی دەسەڵات. شتێکی سروشتییە ئەگەر بڵێین گەل ئازادە لە هەڵبژاردنەوەیان پاش کۆتایی هاتنی ماوەی هەڵبژاردنیان. دیموکراسی ڕاستەوخۆ ، واتا گەل خۆی حوکمی خۆی دەکات بێ ئەوەی کەسانێکی تر بکاتە نوێنەری خۆی و هیچ ئەنجومەنێك یان پەرلەمانێك هەبێت.

بەڵام دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ کە لێرەدا مەبستمانە ئەو دیموکراسیەیە کە گەل نوێنەرەکانی خۆی هەڵدەبژێرێ. بەڵام ئەم نوینەرانە سەرفرازو ئازاد نین لە هەموو شتێکدا . بەڵکو گەل چاودێرییان دەکات بە شێوەیەکی ورد و مورد ، هەروەها هەندێ لەو بڕیارانەی کە نوێنەرەکان دەریان دەکەن دەبێ بخرێنە بەردەستی گەلەوە بۆ پەسەندکردنیان یان ڕەتکردنەوەیان، هەروەها گەل مافی هەیە بڕیار بسەپێنێتە سەر نوێنەرەکانیدا لە ڕێکای پێشنیاری گەلییەوە،میللیەوە (الاقتراح الشعبی). هەروەها گەل مافی لادانی نوێنەرەکانی هەیە، لە کاتێکدا ئەگەر کێشە بکەوێتە نێوان گەل و ئەو نوێنەرانەوە. بە هەر حاڵ پەیوەندی دیموکراسی نیمچەڕاستەوخۆ بە پێبەندکردنی دەسەڵاتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ دوو ئامرازی سەرەکی کە ئەوانەش ڕاستگۆکردنی گەلی (المصادقة الشعبیة) و دستپێشخەری گەلین (المبادرة الشعبیة).

**١-ڕاستگۆکردنی گەلی،میللی(المصادقة الشعبیة) : -**

بۆ جێبەجێ کردنی هەندێ لەو بڕیارانەی کە لەدەزگای یاسادانانەوە دەردەچن پێویست دەکات ئەو بڕیارانەبخرێنە بەردەستی گەل وڕیفراندۆمیان لە سەر بکرێت بۆ ئەوەی گەل بڕیاریان لەسەر بدات، ئەگەر هاتوو بڕیارێك خرایە بەردەم گەلەوەو گەل بەئەو مەرجانەی یاسا دیاریانی کردوە قایل بوو، ئەوە ئەو بڕیارە دەبێتە یاسا، یان

بڕیارێکی یاسایی و جێبەجێ دەکرێت بەڵام ئەگەر لە لایەن گەلەوە ڕەت کرایەوە، ئەوە ئەو بڕیارە بەتاڵ دەبێتەوە و هەر وەکو ئەوەیە کە هەر نەبووبێت. لێرەدا ئەو بڕیارە لەوەیە تەنها بڕیارێك بێت، یان چەند بڕیارێك، واتا دەزگای یاسادانان چەند بڕیارێکی یاسایی دەخاتە بەردەستی گەل بۆ هەڵبژاردنی یەکێ لەو بڕیارانە، ئەمە پێی دەڵێن هەڵچنین (أختیار ـ Lopition). بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٥١ ز)، سێ پرۆژەی دەستووری خرانە بەردەستی گەلەوە لە فەرەنسا ، کە پێك هاتبوون لە: دەستووری ساڵی (١٨٧٢ز).

پێشنیاری هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی دامەزرێنەری خاوەن دەسەڵاتێکی ڕەها بۆ دانانی دەستوورێکی تازە.

هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی دامەزرێنەری خاوەن دەسەڵاتێکی سنووردار بۆ دانانی دەستوورێکی تازە.

ئەمەو هەندێ جار بۆ جێبەجێکردنی هەندێ بڕیار بە گوێرەی دەستوور پێویست دەکات ، ماوەیەك تێپەڕ بێت ، ئەگەر لەو ماوەیەدا بەرهەڵستکاری نەبوو بۆ بڕیارە یاساییەکە بە پێی ئەو مەرجانەی کە دەستوور داینـاون، ئەوە ئەو بڕیارە جێبەجێ دەکرێت ، بەڵام ئەگەر لەو ماوەیەدا بەرهەڵستکاری لە لایەن گەلەوە هەبوو ، ئەوە ئەو بڕیارە دەخرێتە ڕیفراندۆمەوە، بۆ ئەوەی گەل بڕیاری کۆتایی لە سەر بدات ، ئەگەر گەل قایل بوو پێی ئەوە ئەو بڕیارە جێبەجێ دەکرێت ، بەڵام ئەگەر گەل قایل نەبوو پێی ئەوە ئەو بڕیارە پوچەڵ دەبێتەوە. لە ڕاستیدا لەو حاڵەتانەی کە بڕیارەکان لە سەر بەرهەڵستکاری گەل دەمێننەوە لەو حاڵەتانەدا ، ڕیفراندۆم کردنی ئەو بڕیارانە سەپێنراو نییە، بەڵکو لە سەر بەرهەڵستکاری گەل دەمێنێتەوە. واتا دەزگای یاسادانان ئەو بڕیارانە ناخاتە ڕیفراندۆمەوە، تەنها لە کاتێکدا نەبێ کە گەل بەرهەڵستکاری ئەو بڕیارانە بکات، پاش بەرهەڵستکاری گەل، ئەوە ئەو کاتە لە سەر دەزگای یاسادانانە و سەپێنراوە بەسەریا کە ئەو بڕیارانە بخاتە ڕیفراندۆمەوە. واتا دەزگای یاسادانان ، لە سەرەتاوە پێش بەرهەڵستکاری بڕیارەکان لەلایەن گەلەوە، ناچار نییە ئەو بڕیارانە بخاتە ڕیفراندۆمەوە، بەڵام پاش بەرهەڵستکاری گەل بە شێوەیەکی سەپێنراو ناچار دەبێ ئەو بڕیارانە بخاتە ڕیفراندۆمەوە. بەڵام هەندێك بۆچوونیان

وایە کە ڕێفراندۆم ڕۆڵێکی سنووردار دەبینێت لە پێبەندکردنی دەسەڵات. لەبەر ئەوەی گەل بەشداری لە دانانی ناوەڕۆکی بڕیارەکان ناکات بەڵکو ئەو بڕیارانە بە ئامادەکراوی دەخرێنە بەردەستی گەلەوە. لێرەدا ڕۆڵی گەل ڕۆڵێکی کاکڵەییە، تەنیا مۆڵەت بە بڕیارەکان دەدات وەکو خۆیان جێبەجێ بکرێن، پاش ئەوەی گەل بە ڕیفراندۆم ئەو بڕیارانە پەسەند بکات. ئەمەو ئەو بڕیارانە کەدەخرێنە بەردەستی گەلەوە بۆ ڕیفراندۆم لەوەیە شتێکی کەم و سنووردار بن ، ئەگەر لە چوارچێوەی دەسەڵاتێکی پان و فراواندا تەماشا بکرێن، هەروەها ڕیفراندۆم لەوەیە ببێتە هۆیەك بۆ بە هیزکردنی دەسەڵات نەك پێبەندکردنی ، چونکە دەسەڵات پەیوەندیەکە لە نێوان دەسەڵات بە دەست و دەسەڵات بەسەردا ، بڕیار یان دەق ئامرازێکی ئەو پەیوەندییەیە، واتا دەسەڵاتدار و دەسەڵات بەسەر لە ڕێگای بڕیار یان دەقەوە بە یەك دەگەن . جا بۆیە قایل بوونی گەل بە هەر بڕیارێك لە ڕێگای ڕیفراندۆمەوە، واتا متمانەدان بەو کەسایەتی و گرووپەی کە ئەو بڕیارەیان دەرکردووە.

## ٢. دەستپێشخەری گەلی، میللی (المبادرة الشعبية)

دەستپێشخەری گەلی بریتییە لە ئامادەکردنی بڕیار لە لایەن گەلەوە، واتا گەل پرۆسەیەکی یاسایی دیاری دەکات وەدەیخاتە بەردەم دەزگای یاسادانانەوە، دەزگای یاسادانان دەبێت ئەو پرۆژەیە بخاتە ڕیفراندۆمەوە، ئەگەر ئەنجامی ڕیفراندۆم لە قازانجی پرۆژەکەدا بوو ، ئەوە جێبەجێ دەکرێت ، ئەگەر ئەنجامی ڕیفراندۆم لە قازانجی پرۆژەکەدا نەبوو ئەوا بەتاڵ دەبێتەوە، لەم حاڵەتەی دواییدا دەزگای یاسادانان دەتوانێت ڕۆڵی خۆی ببینێت (ڕۆڵی بەرهەڵستکاری ببینێت).بە داواکردنی لە هاووڵاتیان کە ئەو پرۆژەیە ڕەت بکەنەوە، یان دەتوانێت دژە پرۆژەیەکی ئەو پرۆژەیە ئامادە بکات و بیخاتە ڕیفراندۆمەوە، بەو جۆرە ئەگەر ئەو پرۆژەیە پەسەندکرا ئەوا ئەو دەستپێشخەرییەی کە لەلایەن گەلەوە پێشکەش کراوە بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەمەو دوو جۆر دەستپێشخەری گەلی هەیە، دەستپێشخەری نادارێژراو ، ئەم دەستپێشخەرییە بریتییە لە پرۆژەیەکی یاسایی ناتەواو، یان پرۆژەی بڕیارێکی ناتەواو

کە تەنها هێڵە سەرەکییەکانی دیاری کراوە، واتا پرۆژەی بڕیارێکی ناتەواوە، کە هێڵە سەرەکییەکانی دیاری کراوە و دەخرێتە بەردەستی دەزگای یاسادانانەوە بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی ئەو پرۆژەیەدا بڕیارێکی یاسایی ڕێك و پێك دەربکات.

جۆری دووەمی دەستپێشخەری گەلی ، دەستپێشخەری داڕێژراوە، ئەم جۆرە دەستپێشخەرییە گەل تیایدا پرۆژەیەکی یاسایی تەواو ئامادە دەکات و بە مادده و بڕگەو بێ کەم و کورتییەوە ئاراستەی پەرلەمانی دەکات.

وەکو لە باسەکەماندا بۆمان دەردەکەوێت دەستپێشخەری گەلی هەرچەندە بە دەزگای یاسادانانندا تێدەپەڕێت بەڵام بیرۆکەی بڕیارێکە لە گەلەوە سەرهەڵدەدات و گەل چارەنووسی دیاری دەکات. بەڵام دەستپێشخەری گەلی ڕۆڵێکی لاواز دەبینێت لە پێبەندکردنی دەوڵەت ، لە بەر ئەوەی زۆرجار بەکار دەهێنرێ بۆ هەموارکردنەوەی دەستوور و بەکار ناهێنرێ و پەیڕەو ناکرێ بۆ دانان و هەموارکردنەوەی یاسا ئاساییەکان (القوانين العاديه). کە لە ڕاستیدا دەسەڵات لە ڕێگای ئەو یاسایانەوە ڕۆژانە ڕاڤەی دەسەڵات دەکات و هەر ئەو یاسایانەش پەیوەندیان بە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی یەوە هەیە.

ئەمەی کە لە سەرەوە باسمان کرد لە دەوڵەتی فیدرالی سویسرادا بەدی دەکرێت ، بەڵام لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستپێشخەری گەلی نە بۆ هەموارکردنەوەی دەستوور و نە لە بواری یاسا ئاساییەکاندا پەیڕەو دەکرێت. هەروەها ئەو دەستپێشخەرییە گەلیانەش کە بۆ هەموارکردنەوەیدەستوور دەخرێنە ڕوو کەمن و بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن ، بۆ نموونە لە سویسرا و لەسەر ئاستی دەوڵەتی فیدرالی لە (٥)ی تەمووزەوە لەساڵی (١٨٩١ز)ی تا کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٠ ز) هەفتا دەستپێشخەری گەلی خرایە ڕوو، لە ئەو هەفتا دەستپێشخەرییە گەل تەنها بە (٨/١)ی قایل بوو ، ئەو دوایەکەشی تووشی شکست بوون هاتن. هەروەها کۆنسە نوێنەرایەتیەکان (المجالس التمثيلية) ڕۆڵێکی باڵا دەبینن لە دیاری کردنی چارەنووسی دەستپێشخەرییە گەلییەکان، چونکە دەتوانن داوا لە گەل بکەن ، ئەو دەستپێشخەریانە ڕەت بکاتەوە کاتێ ڕیفراندۆمیان لە سەر دەکرێت. هەروەها دەتوانن بەرامبەر هەر

دەستپێشخەرییەکی گەلی دژە پرۆژەیەك ئامادە بکەن و بیخەنە بەردەم گەلەوە بۆ ڕیفراندۆم. بە تەجروبەش ئەوە دەرکەوتووە، کە ئەو دەستپێشخەرییانەی لە لایەن ئەنجومەنە نوێنەرایەتییەکانەوە پێشکەش دەکرێن و پەیوەندییان بە هەموارکردنەوەی دەستوورەوە هەیە، زۆر جار لە لایەن گەلەوە پەسەند دەکرێن ، بەلام دەستپێشخەرییە گەلییەکان کە پەیوەندیان بە هەمان بابەتەوە هەیە، زۆر جار لە لایەن گەلەوە ڕەت دەکرێنەوە، نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە : لە ساڵی (١٨٩٢ز) تا ساڵی (١٩٣١ز)، سی‌ویەك دەستپێشخەری گەلی بۆ هەموار کردنەوەی دەستوور پێشکەش کراوە، گەل (٢٥)یانی ڕەت کردووەتەوە، تەنها شەشیانی پەسەند کردووە. ئەمەی لە سەرەوە باسمان کرد هەندێ ڕەخنەیە کە لە سەر دەستپێشخەری گەلی وتراوە، بەلام بە هەر حاڵ دەبێت دەسەلات پێبەند بکرێت و لە سنووری خۆیدا ڕابگیرێت ، لەوەیە دەستپێشخەری گەلی ڕۆڵێکی زۆر گرنگ نەبینێ ، بەلام هەبوونی لە گەڵ ئامرازەکانی تردا و لە گەڵ باری گونجاوو لە باری دەوڵەتدا کاریگەری خۆی هەر دەبێت ، هەر چەندە کەم بێت.

**لەم بەرگەدا**

**بەشی یەکەم : پێناسەکردنی سیستەمە ڕامیارییەکان و کارکردن لە سەر سیستەمە ڕامیارییەکان.**

**بەشی دووەم : سیستەمە ڕامیارییەکان لە ڕووی ڕاڤەکردنی دەسەڵاتەوە .**

**بەشی سێ یەم : بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان وئەو سیستەمانەی کە لەسەر بناغەی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دامەزراوون.**

## پێشەکی بەرگی دووەم :

سیستەمی رامیاری داینەمۆی دەوڵەت و ژیانی کۆمەڵگەیە، بێگومان هەرکۆمەڵگەیەك تایبەتمەندی خۆی هەیە ، بیرو بۆچوونی هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی دەربارەی دەسەڵات و سیستەمی رامیاری لە گەڵ ئەوی تردا دەگۆڕێ بە پێی رەوشی تایبەتی هەر کۆمەڵگەیەك لە رووی مێژووی و ئابووری و جیۆپۆلیتیکیەوە کە بە هەموویانەوە باری دەروونی مرۆڤ و هۆشیاری رامیاری تاکەکانی کۆمەڵگە دیاری دەکەن . واتا سیستەمی رامیاری پەیرەوکراو لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆڕێو سیستەمی رامیاری لە هەر دەوڵەتێکدا چوارچێوەی رەوشی ئابووری و بیروبۆچوونی هاووڵاتیان دەربارەی دەسەڵات و رادەی هۆشیاری رامیاری هاووڵاتیان و قۆناغە مێژوویە جیاجیاکان وەردەگرێ کە دەوڵەتی پێدارۆیشتووە. لەو کۆمەڵگەیانەی کە هۆشیاری رامیاری لەلای هاووڵاتیان کزو لاوازەو رەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی تیایاندا لاوازە ، ئەوە سیستەمی رامیاری پەیرەو کراوو لە دەوڵەتدا، سیستەمێك دەبێت کە لە سەر زەبرو زەنگ و خۆسەپاندن بنیاد نرابێت، پێشێلکردنی مافی تاکەکانی کۆمەڵ و سەربەستیەکانیان و بوارنەدان بە گروپی رامیاری جۆراوجۆر لە دەوڵەتدا شتێکی ئاسایی دەبێت .

واتا سیستەمی دکتاتۆری لە دەوڵەتدا پەیرەو دەکرێت ، چ ئەو سیستەمە دکتاتۆرییە، سیستەمی دکتاتۆری تاکە کەسی بێت ، یان سیستەمی دکتاتۆری رێچکەیی بێت ، لە راستیدا سیستەمی دکتاتۆری لەو کۆمەڵگەیانەدا پەیرەو دەکرێ کە هۆشیاری رامیاری لە لای هاووڵاتیان کزو لاواز بێت و پەیوەست بوون بە ئایین و تایفە گەری و پشێوی رەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە ئارادا بێت .

ئەمەو هەرچەندە جیاوازی هەیە لە نێوان دکتاتۆری تاکە کەسی و دکتاتۆری رێچکەیی بەڵام وەك و ئەنجام لە خۆسەپاندن و پێشێل کردنی سەربەستییەکانی هاووڵاتیاندا یەك دەگرنەوە. بەڵام ئەو کۆمەڵگە مرۆڤایەتییانەی کە قۆناغێکی باشیان

لە پێشکەوتن بڕیووە و هۆشیاری ڕامیاری لە لای هاوولاتیانی دەوڵەت بەهێزەو پێشکەوتن لە بوارە جیاجیاکاندا هەیە، بواری ئابووری ، کۆمەلایەتی ... ئەوە سیستەمی ڕامیاری پەیڕەوکراو لە دەوڵەتدا لەسەر بناغەی بەرژەوەندییە جیاجیاکان و بەرژەوەندی هەموو چین و توێژە جیاجیاکان دادەمەزرێ ، هەڵبژاردنی دەسەلات جێگەی خۆسەپاندن دەگرێتەوە ، گەل ئەو کەسانە هەڵدەبژێرێ ودەیانکاتە دەسەلات کە هەست دەکات پاڵپشتی لە بەرژەوەندییەکانی دەکەن و خزمەتی ئەو بەرژەوەندییانە دەکەن .

کاتێ هەڵبژاردنیش لە ئارادابێت و دەسەلات لە ڕێگای دەنگدانی خەلکیەوە بێتەکایەوە ، ئەوکاتە دەسەلات خۆی لە خەلکی بەنامۆ نازانێت و هەموو هەوڵ و کۆششێك دەخرێتە گڕ بۆ ڕازی کردنی خەلکی لە دابین کردنی بژێوییانەوە بۆ خۆشگوزەرانییان بۆ پاراستنی ئاسایش وسەربەستییەکانیان : سەربەستی هاتوو چۆکردن، سەربەستی نیشتەجێ بوون ، سەربەستی فیکری و بیروڕا دەربڕین. ئەمەو تەنانەت لە چوارچێوەی سیستەمی دیموکراسیدا ، جیاوازی هەیە لە نێوان دەوڵەتەکاندا ، لە سیستەمی پەیڕەوکراو لە دەوڵەتدا ، لە هەندێ دەوڵەتدا سیستەمی سەرۆکایەتی پەیڕەو دەکرێت ، دەوڵەتی دیکەش هەیە سیستەمی پەرلەمانی پەیڕەو دەکات . سیستەمی کۆمەڵەو تێکەلاو هەن لە هەندێ لە دەوڵەتە دیموکراسیەکاندا پەیڕەو دەکرێت .

بەهەرحاڵ من ئەم بەرگەم کردووە بەسێ بەشەوە

ـ لە بەشی یەکەمدا باسی پێناسەکردنی سیستەمە ڕامیارییەکان و ئەو کارتێکەرانە دەکەم کە کار دەکەنە سەر سیستەمە ڕامیارییەکان .

ـ لە بەشی دووەم دا باسی سیستەمە ڕامیارییەکان دەکەم لەڕووی ڕاڤەکردنی دەسەلاتەوە .

ـ لە بەشی سێیەمدا باسی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکان دەکەم و ئەو سیستەمانەی کە لەسەر بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکان دامەزراوون .

# بەشی یەکەم

بەشی یەکەمی بەرگی دووەمم کردووە بەدوو باسەوە ، لە باسی یەکەمدا باسی پێناسەکردنی سیستەمە ڕامیارییەکان دەکەم و لە باسی دووەمدا باسی کارکردن لە سەر سیستەمە ڕامیارییەکان دەکەم .

## باسی یەکەم
## پێناسەکردنی سیستەمە ڕامیارییەکان

پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکانی سیستەمە ڕامیارییەکانەوە بە پێویستی دەزانین بۆچوونی هەندێ لە زاناکان لە بواری ڕامیاریدا بخەینە ڕوو دەربارەی سیستەمی ڕامیاری [1]:

- دیڤید ئۆستن David Easton دەڵێ :

سیستەمی ڕامیاری ئەو دیاردانەیە کە بە هەموویانەوە ، سیستەمێك پێك دێنن ، ئەو سیستەمەش بەشێکە لە کۆی سیستەمی کۆمەڵایەتی ، بەڵام بووەتە لقێك لە سیستەمی کۆمەڵایەتی بەمەبەستی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە . هەروەها ڕاستییە پەتییەکان ئەوەمان پێ دەڵێن کە هەموو شتێ لە واقیعی ژیاندا پەیوەست نییە بە چالاکی ڕامیارییەوە. دەتوانین تەنها بەشێك لە چالاکییەکانی ژیانی کۆمەڵگە بەچالاکی ڕامیاری دابنەین و بە سیستەمی ڕامیاری لە قەڵەم بدەین ، ئەوەش ئەو ریشاڵانەن کە پەیوەستن بە کۆمەڵە ڕامیارییەکان و نەریتی ڕامیاری و حوکمڕان و ڕێکخستنەکانی حکومڕانییەوە. هەروەها هەندێ ریشاڵی کۆمەڵایەتی کە پەیوەستە بە چالاکی ڕامیارییەوە وەکو سیستەمی چینایەتی و گروپ و کۆمەڵە هەرێمایەتییەکان، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە دێنەکایەوە بە تێکەڵ بوونی ئەوانە لە کردارە ڕامیارییەکاندائەمانە دەتوانرێ بە سیستەمی ڕامیاری لە قەڵم بدرێن .

---

(١) بڕوانە : د. أبراهيم الدرويش ـ النظام السياسي، ص٢٢ـ٢٣

هەروەها ئۆستن لە بابەتێکی تردا سنووری سیستەمی رامیاری دیاری دەکات لە رێگای کۆمەڵێ کردارەوە کە پەیوەستن بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ بە دروست کردنی بڕیارە سەپێنراوەکانەوە لە سەر کۆمەڵگە . لەو روانگەیەوە هەر کردارێکی کۆمەڵایەتی ئەو تەبەتکارییانەی تێدا نەبێ ، ناتوانرێ بە پێکهاتەی سیستەمی رامیاری بژمێردرێ .

ئەو کردارانەی کە پیوەستن بە سیستەمی رامیارییەوە دیاری دەکات و دەڵێ ((خەڵکی بەشداری لە ژیانی گشتیدا دەکات کاتێ چالاکییەکانیان پەیوەست بن بە کرداری رامیاری و جێبەجێ کردنی کرداری رامیاریەوە لە کۆمەڵگەدا ))

- رۆبرت داهڵ ( Robert Dahl ) دەڵێ :

سیستەمی رامیاری پێکهاتەی هەمیشەیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، کە هێزو حوکم و دەسەڵات لە خۆدەگرێ .

- هارۆڵد لاسویڵ ( harold laswell ) دەڵێ :

((سیستەمی رامیاری نفوزو خاوەن نفوزە لە سەر بناغەی هێزو سەپاندنی سزا بنیاد نراوە)) .

- جۆرج کاتلن ( g . catlin )

-((سیستەمی رامیاری کۆمەڵێ کردارە بەهۆی زاڵ بوونی پەیوەندییەکانەوە ، بالا دەستی و بنیاد نانی لێ دەبێتەوە)) .

- لاماکسووبر ( max weber ):

((سیستەمی رامیاری ئەو سیستەمەیە کە زامنی جێ بەجێ کردنی بڕیارەکان دەکات لەناوچەیەکی سنوور دیاری کراودا بە شێوەیەکی هەمیشەیی بە هۆی دەسەڵاتێکی فیعلیەوە لە رێگای دەزگایەکی بەرێوە بردنی هەمیشەییەوە)) .

ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە بەم شێوەیە سیستەمی رامیاری پێناسە دەکەین:

سسیستەمی ڕامیاری چەندەد دام و دەزگایەکە لـە کۆمەڵگەیـەکی دیـاری کـراودا ، کـە کاروباری بەڕێوەبردن دەگرنـە ئەستۆ لـە ڕێگای ئـەو یاساو ڕیاسا مولزیمانـەی کـە لـە ئارادان یان دانـراوون لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیایەکی ڕامیاری پەیڕەو کراودا .

## باسی دووەم

## کارکردن لەسەر سیستەمە ڕامیارییەکان (١)

بۆ شـی کردنـەوەی کـارکردن لەسـەر سیسـتەمە ڕامیارییـەکان پێویسـتە دوو بابەت شی بکەینەوە .

بەستی یەکەم : ئەو کارتێکەرانەی کە کار دەکەنە سەر سیستەمە ڕامیارییەکان .

بەستی دووەم :پارتەکان و سیستەمە ڕامیارییەکان .

### بەستی یەکەم :

### ئەو کارتێکەرانەی کە کار دەکەنە سەر سیستەمە ڕامیارییەکان

لە ڕاستیدا سیستەمی ڕامیـاری لـە هـەر وڵاتێـك ڕەنگدانـەوەی بـارودۆخی تایبـەتی ئـەو وڵاتەیـە ، ئـەو سیستـەمەی کـە بـۆ وڵاتێـك گونجاوە ، لەومیـە بـۆ وڵاتێکی تـر گونجاوو نەبێت ، هەر وڵاتێك بارودۆخی تایبـەتی خـۆی هەیـە ، پێکهاتـەی ڕەگـەزی و ئایینی و کەلتوری هەر وڵاتێـك کاردانـەوەی تایبـەتی خـۆی دەبێت لەسـەر سیستـەمی پـەیڕەوکراوو لـە دەوڵـەتدا ، هـەروەها کـەش و هـەوای دەوڵـەت لـە ڕووی سـاردی و گەرمییـەوە، هـەبوونی زەوی گونجـاو بـۆ کشـتوکاڵو ڕادەی بـە پیتـی زەوی دەوڵـەت ، سەختی هەرێمەکانی دەوڵەت و هەبوونی چیاو هەورازو دارستان ، یان ڕووبارو دەریـاو بیابـان و لـەو جۆرانـە یـان نـەبوونی، کاریگـەری بنـەڕەتییان هەیـە لەسـەر پێکهاتـەی فیکریو دەروونی خەڵکی ئەو وڵاتانە، لەم ڕوانگەیەوە ڕادەی ڕەزامـەندی ئـەو خەڵکە

---

(١) بڕوانە : د. شمران حمداي ـ النظم السیاسیة .

لەسەر ئەم شێوەیەی سیستەمی دەسەڵات یان بۆ ئەوی دیکە پەیوەندی بە باری دەروونی و فیکری دانیشتوانی هەر دەوڵەتێکەوە هەیە ، پەیڕەوکردنی هەر شێوەیەك لە سیستەمی دەسەڵات لە دەوڵەتدا شتێك نییە بەزۆر بسەپێنرێ ، بەڵکو دەبێت سیستەمی پەیڕەوکراو لە دەوڵەتدا گونجاوترین و لەبارترین و نزیکترین سیستەم بێ لە داب و نەریت و کەلتورو ڕادەی هۆشیاری خەڵکی ئەو دەوڵەتەوە .

ئەگەر سیستەمی ڕامیاری پەیڕەوکراو لە دەوڵەتدا گونجاو نەبوو لەگەڵ باری دەروونیو فیکری دانیشتوانی دەوڵەت . ئەوە ئەو سیستەمە ئەگەر بۆ ماوەیەکیش پەیڕەو بکرێت ، وەکو ئەنجام هەر هەرەس دێنیو ئامانجی ڕێکخستنی دەوڵەت ناپێکێ کە پێویستە لە بناغەدا بۆ خۆش گوزەرانی دانیشتوانی دەوڵەت و سەقامگیری ڕەوشی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی هاتبێتەکایەوە .

ئەمەو بە پێویستی دەزانین باسی ئەو کارتێکەرانە بکەین کە کار دەکەنە سەر سیستەمی ڕامیاری پەیڕەوکراو لە دەوڵەتدا .

**١. کارتێکەرە مێژووییەکان :-**

وەکو لە سەرەتادا باسمان کردو دووپاتی دەکەینەوە ، شتەکان تەعبیر لە خۆیان دەکەن ، واتا هەر دەوڵەتێك تەعبیر لە خۆی دەکات و تایبەتمەندی هەر دەوڵەتێکیش لە شتە بنەڕەتییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە وەکو جێگای جوگرافی دەوڵەت و کەش و هەواو پلەی گەرمی و ساردی و هەبوونی دەریاو ڕووبارو چیاو بیابان و زەوی کشتوکاڵ و دارستان ، یان نەبوونی ، ئەمانە هەمووی ئاستی دەروونی و فیکری خەڵکی هەر وڵاتێك دیاری دەکەن و بناغەن بۆ بیرو بۆچوون و ئایین و بنەما فیکری و دەرونیەکانی ئەو خەڵکە . ئەمەش خۆی لە خۆیدا مێژوو وکەلتوری هەر وڵاتێك پێك دێنێ .

ئایینی پەیڕەوکراوو و داب و نەریتەکان ، کە لە گەڵ ڕۆژدا چەسپاوون و تەعبیر لە مێژووی هەر وڵاتێك دەکەن بناغەی فیکری و دەروونی ئێستا پێك دێنن .

ڕوودانی شەڕوو وێرانکاری و داگیرکاری لە وولاتدا کە بەشێك لە مێژوو پێك دێنن ، ئەمانە هەمووی هەریەکەو ڕەنگدانەوەی خۆی هەیە لەسەر پێکهاتەی فیکری و دەروونی خەلکی وولات و قبولْ کردنیان بۆ ئەم سیستەمی ڕامیاری یان ئەوەی دیکە .

## ٢- باری ڕۆشنبیری و فیکری هاوولاتیان[1]

کاتێ لە دەوڵەتدا مافی هاوولاتیان دیاری دەکرێ ، چوارچێوەی ئاستی ڕۆشنبیری و فیکری خەلکی ئەو وولاتە وەردەگرێ .

ئەگەر ئێمە تەماشای هەر تاکە کەسێك بکەین لە کاتی منداڵییەوە تا گەورە دەبێت ، بۆمان دەردەکەوێ کە منداڵ ، لەبەر ئەوەی بە دوای ئارەزوو دەکەوێت و بەرژەوەندی خۆی نازانێ ، مافەکانی دیاری کراوو دەبن و هەموو مافێکی پێنادرێ . کاتێ گەیشتە تەمەنی لاوی هەندێ مافی زیاتری دەدرێتێ کە گونجاو بێ لەگەڵ بیرو هۆش و ڕادەی پێگەیشتووی تا دەگاتە قۆناغیك یان تەمەنێك کە ئیتر بیرو هۆشی پڕ دەبێتەوەو شتەکان لەیەك جیا دەکاتەوە و بەرژەوەندییەکانی خۆی دەزانێت ، ئەو کاتە هەموو ئەو مافانەی پێ دەدرێ کە بۆ کەسێکی پێگەیشتووی عاقڵ دابین کراوە . گەلی دەوڵەتیش هەمان شتی لەسەر دەووترێ ، کاتێ گەل لە دەوڵەتدا ئاستی ڕۆشنبیری کزو لاواز بێ و لە بنەما نوێیەکان و ژیانی شارستانی تێ نەگەیشتبێ. ئەگەر هەموو مافە دیموکراتییەکانی بدرێتێ و سەربەستی تەواو وەرگرێ ، ئەوە لەوەیە ئەو مافانەو ئەو سەربەستییانە دژ بە بەرژەوەندی گشتی بە کاربێنێ لە جێگای ئەوەی بیخاتە خزمەت بەرژەوەندی گشتی یەوە . بۆیە دەبێ تاکە کەس ئەوەندە مافی بدرێتێ ، کە ئەگەر نەیخاتە خزمەت بەرژەوەندی گشتی‌یەوە نەتوانێ بە کاری بهێنێ دژی بەرژەوەندییە گشتییەکان و بەرژەوەندی دەوڵەت .

لە هەندێ دەوڵەتدا خەلکی لە جێگای ئەوەی فرە پارتایەتی بە دیاردەیەکی دیموکراسی بزانن ، بە شتێکی نامۆو نالەبار لە قەڵەمی دەدەن، شتێکی سروشتیە ، لەو وولاتانەدا ململانێی نێوان پارتەکان بگاتە حاڵەتی شەڕوو یەك پەکتاوکردن .

---

[1] بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو . .

جا لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی باڵای دەوڵەت وەکو لە دیفاکتۆیشدا خۆی لەگەڵ ڕۆژدا دەسەپێنێ ، دەبێ ئەو مافانەی کە دەدرێتە هاووڵاتیان یان ئەو سەربەستییە گشتیانەی بۆ هاووڵاتیان دابین دەکرێن، دەبێ گەنجاوبن لەگەڵ ڕەوشی فیکری و ڕۆشنبیری هاووڵاتیان لە وڵاتداو سنوور بۆ هەر زیادڕەوییەك و شێواندنێکی باری گشتی دابنرێت . بۆ نموونە سنوور دانان بۆ ڕۆژنامە بۆ ئەوەی خەڵك هان نەدات دژ بە بەرژەوەندییە گشتییەکان . یان سنوودانان بۆ خۆپیشاندان وگێرانی ئەو کۆڕو کۆمەڵانەی کە لە دژ بەرژەوەندی گشتیین . ئێمە کاتێ باسی ئەم شتانە دەکەین کاتێ باسی ئەوە دەکەین کە دەبێ مافی تاکەکان و سەربەستییەکانیان سنوو دار بکرێت. بێگومان ئەو سنوور دارکردنە مەهانەی خۆی هەیە ، لە بەرژەوەندی ئەوەیە کە ڕۆژێ بێ بتوانرێ لە دەوڵەتدا باشترین سیستەمی ڕامیاری پەیرەو بکرێت. لە هەندێ وڵاتدا لە کاتێکدا نیمچە دیموکراسییەتێك هەبێ ، ئەوە هەندێ گروپ سەر هەڵدەدەن و بیرو باوەڕی دژ بە سیستەمی دیموکراسی و خودی سیستەمە پێشکەوتوەکانیش بڵاو دەکەنەوە . ڕۆژنامەو ئامرازەکانی دیکەی ڕاگەیاندنیان وەکو لە هەندێ وڵاتدا ڕووی داوە لەوەیە بگاتە ئاستێك هەر سیستەمێکی نوێ و پێشکەوتووخواز ڕەت بکەنەوەو تەنانەت بەکوفریشی لە قەڵەم بدەن . ئایا لە کاتێکی وادا سانسۆر خستنەسەر ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە پێویست نیە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی باڵای دەوڵەت ؟. بەڵام کاتێ باسی سنووردارکردنی مافی تاکەکان و سەربەستییەکانیان دەکرێت لە کاتێکدا ئاستی ڕۆشنبیری و هۆشیاری لە دەوڵەتدا کزو لاواز بێ ، دەبێ ئەوەش بزانین نابێ ئەو سنوور دارکردنە ببێتە ئامرازێك بۆ دەسەڵات بۆ کپ کردنەوەی دەنگی نەیارەکانی دەسەڵات و خنکاندنی هەر بیروبۆچوونێك لە بەرژەوەندی دەسەڵاتدا نەبێ، لە پێناو ئەوەی ئەو حاڵەتە ڕوونەدات پێویست دەکات هەر بڕیارێك دەربچێ لەو بارەوە بەرامبەر هەر کەسێك یان ڕۆژنامەیەك ، دەبێ ئەو کەسە یان ئەو ڕۆژنامەیە بتوانێ داوا لە بەردەم دادگایەکی تایبەتیدا تۆمار بکات بەرامبەر ئەو بڕیارە ، ئەمەش لە ڕاستیدا زەمینەی لە باری دەوێ لە دەوڵەتداو ئەو زەمینەیەش پەیوەندی بە ڕەوشی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هەیە لە

دەوڵەتدا . لە کاتێکدا باسی بارودۆخی فیکری و ڕەوشی هۆشیاری خەڵکی هەر وولاتێـك دەکەین مەرج نییە هەموو هاوولاتیان ڕۆشنبیربن ، بەڵام دەبێ ئەو ڕادەیە ڕۆشنبیری و هۆشیاری هەبێ لە وولاتدا کە بتوانێ کار لە ئارەزووی گشتی و ڕای گشتی بکات . بـەڵام کاتێ ڕای گشتی لـە وولاتـدا بـێ سـەروبەرو شێواو بـوو ، یـان لـە بـەرژەوەندی گشتی دا نـەبوو ، ئـەوە ئـەو کاتـە دەتوانـین ئاسـتی گشـتی هۆشـیاری ڕۆشـنبیری و فیکـری لـە دەوڵەتدا گـزو لاواز لـە قەڵـەم بدەیـن . ئەمـەو دەبـێ هـەوڵی بـەردەوام هـەبێ بـۆ پێشخسـتنی ئاستی ڕۆشنبیری و فیکـری خـەڵکی بـە ئاسـان کـردن و یارمـەتی دانـی دەرچوونی ئەو کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامانـەی کـە دەتوانـن ئاسـتی ڕۆشـنبیری هاوولاتیـان بەرز بکەنەوە.

هەروەها کار ئاسانی و هاندانی بەستنی کۆڕو کۆبوونەوە لە بوواره جیاجیاکاندا بۆ هەمان مەبەست .

هـەروەها هـاندان و یارمـەتی دانـی هـەر دام و دەزگایـەك کـە چاوەڕوانی ئـەوەی لێ دەکـرێ کاربکاتـە سـەر ڕای گشـتی و لـە بـەرژەوەندی بـاڵای دەوڵـەت ئاراسـتەی بکـات . ئەوەی ماوە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە هەر بۆچوونی فەیلەسوفەکان و نووسـەران و زانایان بوو لە ئەوروپا بوونە هۆی گۆڕانی کۆمەڵگەو داهێنـانی سیستـەمی دیموکراسـی بە هەموو جۆرەکانیەوە .

## ٣- ڕەوشی ئابووری و سیستەمە ڕامیارییەکان :-

ڕەوشی ئابووری لە هەموو وەخت و کاتێکدا ڕۆڵێکی هەرە گرنگی بینیوە لە

دیاری کردنی سیستەمی پەیڕەو کراو لە دەوڵەتدا، ئەگـەر تەماشـای مێـژوو بکـەین دەبینین زۆر جار ئەوانەی کە ڕەوشی ئابووریان بە دەست بووە دەسەڵاتیانیش گرتوەتە دەسـت و بـە پێـی سیسـتـەمێکی ڕامیـاری وا وولاتیـان بـە ڕێـوە بـردووە کـە بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان بپـارێزێ . لـە چوارچێـوەی ئـەو بەرژەوەندیەشـدا مـافی تاکەکان و سەربەستی گشتییان بۆ هاوولاتیان دابین کردووە .

کاتێ ڕەوشی ئـابووری بـە دەسـتی خـاوەن زەوییـەکان و فیوداڵەکانـەوە بـوو، دەسـەڵات بەدەستی چینی ئورۆستۆکراسیەوە بـوو ، ئەگـەر بەڕووکەشیش دەسـەڵاتدار نـەبوو بێـت

ئەوە بەکردەوە و پراکتیك دەسەڵاتدار بوونە، یاساو ڕێساکانی سیستەمی ڕامیاری لە دەوڵەتدا بە شێوەیە دادەڕێژرا، کە بەرژەوەندی چینی ئۆرۆستۆکراسی بپارێزێ و تەنانەت لە هەندێ قۆناغیشدا ، نەك تەنها هاووڵاتیان مافیان نەبووە و خاوەن سەربەستی نەبوون ، بەڵکو موڵك و ماڵی خاوەن زەوییەکان بوون ، خاوەن زەوی تا ئەو ڕادەیە دەسەڵاتی بە سەریاندا هەبوو کە بیانکوژێ یان بیانفرۆشێ. بە هاتنە کایەوەی پیشەسازی و شۆڕشی پیشەسازی، ڕەوشەکە هەندێ پێشکەوتنی بە خۆوە بینی و ململانێ کەوتە نێوان ئەو دوو چینەوە ، تا گەیشتە ڕادەیەك ، چینی بورژوازی پەنا بەرێتە بەر بیری دیموکراسی و هەڵبژاردن ، بەڵام بە شێوەیەك بە دەسەڵات بوونی خۆی مسۆگەر بکات ، ئەمەو شتێکی سروشتییە ئەگەر بڵێین هەبوونی سەرمایەو پرۆژە ئابوورییەکان و کارگەکان بە دوو لایەن بەڕێوە دەچن ، لایەنێکی خاوەن سەرمایەو کارگەو کۆمپانیاکانن، لایەنەکەی دیکەش کرێکارەکانن . هەڵبەتە لە ڕەوشێکی وادا دوو بۆچوونی دژ بەیەك دێنە کایەوە ، دەبێ پارتێکی ڕامیاری هەبێ پاڵپشتی لە بەرژەوەندی سەرمایەداران و خاوەن کۆمپانیاو کرێکارەکان بکات ، دەبێ پارتێکی ڕامیاری دیکەش هەبێ ، سەندیکا کرێکاریەکان و کریکارەکان و خاوەن پیشەکان لە خۆ بگرێت بۆ ئەوەی پاڵپشتییان لێ بکات، حاڵەتێکی لەم جۆرەش خۆی لە خۆیدا سیستەمێکی دیموکراتی دێنێتە کایەوە ، هەروەك و ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا وەکو دیفاکتۆ لە ئارادایە. ئەگەر باسی وڵاتانی جیهانی سێیەم بکەین دەبینین هەندێکی زۆر دەوڵەمەندن ، بەڵام کۆنترین سیستەمی ڕامیارییان تێدا پەیڕەو دەکرێ ، کە هەندێکی میرنشینییەو هەندێکی دیکەشی دکتاتۆرییە. لە ڕاستیدا ڕەوشی ئابووری لەم وڵاتانە ڕێڕەوی سروشتی خۆی وەرنەگرتووە، زیاتر ئەو دەوڵەمەندییە دەگەڕێتەوە بۆ نەوت و هەندێ شتی کانزایتر کە ئەو دەوڵەتانە توانویانە سودی باشی لێ وەربگرن و ئاستی بژێوی خەڵکی وڵاتیش باش بکەن ، بەڵام ڕادەی ڕۆشنبیری خەڵکی ئەو وڵاتانە بەتایبەت لە ڕووی ڕمیارییەوە لەگەڵ ڕەوشی ئابوورییاندا یەك ناگرێتەوە، لەبەر ئەوەی وەکو وتمان دەوڵەمەندی و باری ئابووری باشی ئەو وڵاتانە بە ڕێڕەوی سروشتی خۆیدا نەڕۆیشتوە ، بەڵکو کوت و پڕ ئامێز بووە. دەتوانین نموونەی وڵاتانی لەو جۆرەی باسمان کرد وەکو کەسێکی

نەخوێندەوارو نەزان و دوور لە شارستانی بێنینەوە، کە لە کوت و پڕیکدا گەنجینەیەك بدۆزێتەوە، بە دۆزینەوەی گەنجینەکە نەفێر خوێندەواری دەبێ و نە بیرو هۆشیشی کوت و پڕ دەگۆڕێ ، بەڵام بێگومان وەکو مەودایەکی دوو کاریگەری خۆی هەردەبێ، واتە ڕەوشی ئابووری ئەو دەوڵەتانەش وەکو مەودایەکی دوور کاریگەری خۆی هەردەبێ .
ئەمەو لە هەندێ لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا سیستەمی دەسەڵاتی پەیڕەو کراو زیاتر ئەو سیستەمانەیە کە بواری دەستێوەردانی دەوڵەت زیاد دەکەن لە کاروباری ئابووری و سەرجەم بوارەکانی تردا ، دەوڵەت کاروبارە ئابوورییەکانی ڕێك دەخات لە پێناو چارەسەرکردنی دواکەوتوویی‌و هەژاری لە ڕێگای زیادکردنی بەرهەم هێنان و بەدی هێنانی ئیکتفای زاتییەوە .

## بەستی دووەم :

## پارتەکان و سیستەمە ڕامیارییەکان

پێش ئەوەی باسی کارتێکردنی پارت بکەین لە سەر سیستەمە ڕامیارییەکان پێویست دەکات باسی سیستەمەکانی پارتایەتی و جۆرەکانی ئەو سیستەمە بکەین کە ئەمانەن :

**– سیستەمی دوو پارت ( نظام الحزبين ):**

سیستەمی دوو پارت ئەوە دەگەیەنێ کە لە دەوڵەتدا دوو پارتی سەرەکی هەبن زۆر جاریش لە ڕووی جەماوەرییەوە فرە جیاوازییان نەبێ ، ئەو دوو پارتە ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە کارکردن لە ڕای گشتی و زیاترین بنکەی جەماوەرییان دەبێ لە دەوڵەتدا ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە لە دەوڵەتدا پارتی تر نەبێت و هیچ ڕۆڵێکی نەبێت ، لەوەیە لە پاڵ ئەو دوو پارتە سەرەکییەدا هەندێ پارتی تریش هەبن بەڵام بنکەی جەماوەری بەربڵاویان نەبێ‌و نەتوانن کاریگەر بن لە سەر ڕای گشتی. بۆ نموونە لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا جگە لە پارتی کۆماری و پارتی دیموکراتی ، پارتی جوتیاران هەیە کە هەندێ جار لە وویلایەتی میتیسۆتا لە پارتی دیموکراسی زیاتر دەنگی هێناوە .

هەروەها پارتی پێشکەوتن هەیە ، کە زۆر جار زۆرینەی هێناوە لە ئەنجومەنی ولایەتی ویسکانسدا . هەروەها پارتی کرێکاران هەیە کە لە ساڵی( ١٩٣٧ز )لە ولایەتی نیویۆرک پێنج کورسی بەدەست هێنا لە ئەنجومەنی ئەو ولایەتەدا .

لە ڕاستیدا هەبوونی سیستەمی دوو پارت لە دەوڵەتدا دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی دیرۆکی دەوڵەت و داب و نەرێت و پێکهاتەی ئایینی و نەتەوەی دەوڵەت و پەیڕەو کردنی سیستەمی هەڵبژاردنی زۆرینە . بۆ نموونە هەبوونی سیستەمی دوو پارت لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ دابەش بوونی هاووڵاتیان لە ئەو ووڵاتە لە نێوان لایەنگرانی ناوەندیەت و نا ناوەندیەتدا ، واتا پەیڕەو کردنی یەکێ لەو دوو سیستەمە .

هەروەها هەبوونی دوو پارت لە بەلجیکا دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ڕەگەزی لە نێوان فلامان و فالۆفان . سیستەمی دوو پارت جگە لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا(پارتی دیموکراسیو پارتی کۆماری) و بەریتانیا ( پارتی پارێزگاران و پارتی کرێکاران ) و کەنەدا (پارتی لیبرالی و پارتی پارێزگارانی پێشکەوتنخواز ) لە ووڵاتانی ئەمریکای لاتین و هەندێ ووڵاتانی دیکە پەیڕەو دەکرێ .

**ـ سیستەمی فرەپارتایەتی ( نظام تعدد الاحزاب ) :**

سیستەمی فرە پارتایەتی واتا هەبوونی لە دوو پارت زیاتر لە دەوڵەتدا ئیتر ئەو پارتانە سێ پارت بن یا چوار بن ...

ئەو پارتانە هەریەکەو بنکەی جەماوەری خۆیان هەیە، کەم یان زۆر کاردەکەنە سەر ڕای گشتی ، لە هەمان کاتدا لە یەکەوە زۆر دوورنین لە ڕووی بنکەی جەماوەریەوە. سیستەمی فرە پارتایەتی لە هەر دەوڵەتێك تایبەتمەندی خۆی هەیە و دەگۆڕێ لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکیتر بە پێی بارودۆخی دیرۆکی و پێکهاتەی نەتەوەیی و ڕەگەزی و ڕێچکەی و ئایینی لە هەردەوڵەتێك. بۆ نموونە سیستەمی فرە پارتایەتی لە فەرەنسا پێش ساڵی (١٩٤٥ز) سیستەمی سێ پارت بوو ، کە جێواز بوو لە سیستەمی سێ پارتی پەیڕەو کراو لە بەلجیکا .

پەیڕەو کردنی سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی ( نظام التمثیل النسبي ) لە دەوڵەتدا دەبێتە هۆی هەبوونی سیستەمی فرە پارتایەتی و بەردەوام دروست بوونی پارتی تازە لە بەر ئەوەی هەر پارتێك هەرچەندە بچووك بێت هیوای ئەوەی دەبێت چەند کورسییەکی لە ئەنجومەنە نوێنەرایەتییەکاندا بەدەست بکەوێت .

دروست بوونی پارتی تازەش چەند شێوەیەك لە خۆ دەگرێ: یان پارتێکی نوێ دادەمەزرێ و دێتە کایەوە ، یان یەکێ لە پارتەکان هەڵدەوەشێتەوەو دوو پارت یان زیاتری لێ دەبێتەوە ، یان گروپێك لە پارتێ جیادەبێتەوەو پارتێکی تازە پێکەوە دەنات.

## ـ سیستەمی یەك پارت ( نظام الحزب الواحد ) :

سیستەمی یەك پارت وەکو لە ناوەکەی دیارە ، واتا هەبوونی یەك پارت لە دەوڵەتدا، کە دەسەڵاتی بە دەستەو دەسەڵات لە دەوڵەتدا بەڕێوە دەبات. دەسەڵاتی تاکە پارت ، یان هەبوونی یەك پارت لە دەوڵەتدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیست ، هەرچەندە لە ڕاستیدا درێژە پێدەری دەسەڵاتە میرنشینییەکان و دەسەڵاتە تاك ڕەوەکانە ، بەڵام لە چوارچێوەو لە شێوەیەکی تازەدا کە سیستەمی پارتایەتییە. لە ڕاستیدا پارتە تاك ڕەوەکان وەکو پرۆگرام جیاوازیەکی ئەوتۆیان نییە لەگەڵ هاوشێوەوەکانیاندا، بۆ نموونە پارتی شیوعی فەرەنسا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ پارتی شیوعی کوبادا، بگرە نزیکی لە پارتی شیوعی کوباوە زیاترە لە پارتی ڕادیکاڵی فەرەنسا، هەرچەندە ئەو دوو پارتە لەیەك دەوڵەتدان. واتا پارتی شیوعی کوبا ، کە پارتی تاك ڕەوە لە کوبا هەمان بەرنامەو پرۆگرامی پارتی شیوعی فەرەنسا هەیە، بەڵام ئەم پارتی تاك ڕەوەو تاکە پارتە ، ئەویش یەکێکە لە پارتەکانی سەر گۆڕەپانی ڕامیاری لە فەرەنسا. سیستەمی یەك پارت یان تاکە پارت لایەنگری هەیەو نەیارانیشی هەن، ئەوانەی لایەنگری و پاڵپشتی لێ دەکەن ئەم بۆچوونانەیان هەیە :ـ

ـ سیستەمی یەك پارت دەتوانێت دەستەیەك ڕۆشنبیرو هۆشیارو لێ هاتوو بێنێتەکایەوە، کەلە وڵاتدا جڵەوی دەسەڵات بگرنە دەست ، لەبەر ئەوەی خەڵکی بەگشتی ناتوانن حوکمی خۆیان بە خۆیان بکەن ، بۆیە ڕێکخستنەکانی پارتی تاکڕەو لە

ڕێگای ڕێکخستنەکانیەوە لە هەموو ناوچەکانی وولاتدا، کە پەرش و بلاو بوونەتەوە تیایدا ، لە هەر جێگایەك خەلکێك پەروەردە دەکەن بۆ بەڕێوەبردنی کاری دەولەت، کە ئەو کەسانەش دەبێ خەلکی هۆشیارو لێ هاتوو بن و لە باشترین و دلسۆزترین ئەندامانی پارت بن، هەروەها لە بەرئەوەی هەموو وەزیفە ڕامیاری و کارگێڕیەکان بەدەستی پارتی تاك ڕەوەوەیە لە بەرزترین پلەی ڕامیاری و کارگێڕی لە دەولەتدا تا دەگاتە ئاستە نزمەکان و تەنانەت بەڕێوەبردنی سەندیکاکان و کۆڕو کۆمەلە جۆراوجۆرەکان ، لەو کاتەدا ڕۆلی پارتی تاك ڕەو هەر ئەوە نابێ کادری چاك و هۆشیارو لێ هاتوو پەروەردەبکات و بەرهەم بێنێ ، بەلکو بەهۆی هەبوونی کارمەندی سەر بە پارت لە هەموو دام و دەزگاکاندا ، ئەم دام و دەزگایانە باشترو چالاك تر کارەکانی خۆیان بە ئەنجام دەگەیەنن.

هەروەها پارتی تاك ڕەو بە بۆچوونی ئەوانەی کە پالپشتی لێ دەکەن ، دەتوانێ تێکەلی جەماوەر ببێت و گۆشەگیر نەبێت لە جەماوەر ، لە بەر ئەوەی ڕێکخستنی پەرش و بلاوی هەیە لە سەرجەم ناوچەکانی دەولەتدا . ئەوانە لەناو خەلکدا دەژین و بیرو بۆچوونەکانیان دەزانن، ئەو کادرانە دەتوانن بیرو بۆچوونی ئەو خەلکە بگەیەننە سەرکردایەتی دەولەت و سەرکردایەتی دەولەتیش دەتوانێ لە ڕۆشنایی ڕای گشتی خەلکیدا سیاسەتی دەولەت بەڕێوە بەرێت و لەگەل بۆچوونەکانیاندا بیگونجێنێ ، لە هەمان کاتدا ئەو کادرانە دەتوانن بیروبۆچوون و ڕێنماییەکانی سەرکردایەتی وەرگرن و بیگەیەننە جەماوەر ، واتا گواستنەوەی زانیاری و ڕێنمایی لە سەرەوە بۆ خوارەوەو بەپێچەوانەوە، بەو جۆرە سەرکردەو پارت لەگەل جەماوەردا تێکەل دەبن و لەیەك نزیك دبنەوە .

بەلام ڕەخنەگرانی سیستەمی یەك پارت دەلێن :

لە دەوروبەری سەرۆکی پارتی دەسەلاتدارو سەرکردایەتی ئەو پارتە خەلکی هەلبژاردەو دلسۆزو چالاك کۆنابنەوە لە دلسۆزی و لایەنگرییان بۆ وولات و پرانسیپەکانی پارتی تاك ڕەو ، بەلکو ئەوانەی لە دەوروبەری کەسی دەسەلاتدار کۆدەبنەوە ، زۆر جار خەلکی هەلپەرست و ماستاوچی و خۆپەرستن ، کە بە هەر

شێوەیەك بێت کەسی دەسەڵاتدار یان سەرکردایەتی پارتی تاك ڕەو ڕازی دەکەن و خۆیان دەخەنە خزمەتیانەوە ،لە پێناو پەیداکردنی پول و پارەو بەدەست هێنانی پلەوپایەی جۆراوجۆر لە دەوڵەتدا ، کەسی دەسەلاتداریش ئەو کەسانە دەگرێتە خۆی ، کە لە لایەکەوە سەربازێکی ملکەچی بیروباوەڕو ڕێنماییەکانی خودی خۆی بن ، لەلایەکی دیکەشەوە کە سانێك بن مەترسی لە سەریان نەبێت کە جێگەی خۆی بگرنەوە ، واتا نەئەوەندە هۆشیاربن جێگای خۆی بگرنەوە ، نەئەوەندەش هۆشیار نەبن کە نەتوانێ وەکو ئامرازێ بەکاریان بێنێ .

بە نسبەت ڕۆلی ڕێکخستنی پارت و کادرەکانی لە گەیاندنی ڕێنمای و ڕاسپاردەکانی کەسی دەسەلاتدارو سەرکردایەتی پارتی تاك ڕەو ، ئەوە شتێکی سروشتیەو گومانی تێدا نییە، ئەو کادرو ڕێکخستنانە هەڵدەستن بە گەیاندنی ڕێنمایی و ڕاسپاردەکانی پارتی دەسەلاتدارو کەسی دەسەلاتدار بۆ سەرجەم خەلکی وولات، بەلام گەیاندنی ڕای گشتی خەڵك و بۆچوونی ناوچە جیاجیاکان لە لایەن ڕێکخستنەکانی پارتەوەو لە لایەن کادرەکانەوە ، هەمووی لەسەر درۆو چەواشەکاری بەندە ، ئەو کادرو ئەندامانە بۆ ئەوەی خۆیان بەرنە پێشەوە بۆ بەرپرسیارەکانیان هەوڵ دەدەن بە درۆ ڕازیان بکەن و ماستاویان بۆ بکەن ، هەروەها بەشان و باڵیاندا هەڵ دەدەن و وانیشان دەدەن کە خەڵك خۆشیانی دەوێت و دەیان پەرستێ، بەمەبەستی دەسکەوتنی پلەو پایەو پوڵ و پارە لەو بەرپرسیارانە . ئەمەو پلەبەپلە ئەم بابەتە دووبارە دەبێتەوە. بۆ نموونە شانە لەگەڵ کەرتدا وا مامەڵە دەکات ، کەرت لەگەڵ بەرپرسی کۆمیتە هەمان مامەڵە دەکات ، بەرپرسی کۆمیتە بۆ لق و لق بۆ کۆمیتەی باڵاو کۆمیتەی باڵاش بۆ مەکتەبی سیاسی ومەکتەبی سیاسیش بۆ سەرۆکی پارت. هەروەها لە ئاستی بەڕێوە بردنیش، قائمەقام بۆ پارێزگا ، پارێزگا بۆ وەزیر ، وەزیریش بۆ کەسی دەسەلاتدار .

ئەمە هەمووی بەمەبەستی خۆ پێگەیاندن لە لایەن ئەو کەسانەوەو بۆ بەدەست هێنانی پلەو پایەو پوڵ و پارە وەکو لە سەرەوە باسمان کرد. ئەمەو تەنانەت لە گەیاندنی پەیامی سەرکردەی پارت و کەسی دەسەلاتدار ، هەندێ جار خەلکی بەو ڕێنمای و پرۆگرامەی پارتی تاك ڕەو ڕازی نابن و قەناعەتی خەلکی بە پارتی

دەسەلاتدار دەگاتە بن بەست . ئەوەش تاکە پارتی سەر گۆڕەپان ناچار دەکات پەنا بەرێتە بەر بەکارهێنانی هێزو ئامرازی پۆلیسیانە بۆ کپ کردنەوەی نارەزایی خەلکی، بۆ کۆنترۆڵ کردنی رەوشی دەوڵەت پارتی تاك رەو پەنا دەباتە بەر دوو جۆر چاودێری، چاودێری ناوخۆ ، واتا چاودێری کردنی جموجۆڵی خودی ئەندامانی پارتی دەسەلاتداری تاك رەو. چاودێری دەرەکی، واتا چاو دێری کردنی جموجۆڵی هاوولاتیان و خەلکی لەلایەن ئەندامانی پارتی دەسەلات دارەوە. ئەمەو سیستەمی یەك پارت هەمووی وەکو یەك نیین و یەك پاساویان نییە بۆ تاك رەوی. هەندێ لە پارتە تاك رەوەکان مەهانەی ئەوە دێننەوە کە گوایە هەبوونی یەك پارت ، یەکێتی خاکی نیشتمان و بەرژەوەندی بالای دەوڵەت دەپارێزێ . لە کاتێکدا هەبوونی دوو پارت یان فرە پارتایەتی ، لەوەیە ولات دابەش بکات بەسەر چەند گروپ وتاقم و بیرو بۆچونێکدا، کە بەرژەوەندی ولات و یەکێتی خاکی وولات بخاتە مەترسیەوە و لە نێوان ململانێی ئەو لایەنانەدا لەناو بچێ‌و یان شێواو شلەژاو بێ. هەروەها هەندێ پارتی تاك رەوی دیکەش وا پاساوی هەبوونی سیستەمی یەك پارت دەدەنەوە، کە گوایە یەکێتی ئابووری دێنێتە کایەوە، بۆ نموونە پارتە مارکسییەکان وا دەبینن کە زۆربەی خەلکی لە جوتیارو کرێکار پێك هاتوون، بۆیە بە پێویستی دەزانن ، کە دەبێ لە دەوڵەتدا تاکە پارتێك دەسەلات بە دەست بێت ئەو پارتەش نوێنەری راستەقینەی ئەو دوو چینەبێت.

## کارتێکردنی سیستەمەکانی پارتایەتی لەسەر سیستەمە ڕامیارییەکان

### یەکەم :

### پارتەکان و هەڵبژاردنی نوێنەرەکان :

ئەگەر هەڵبژاردن کرا لە جێگایەك بێ هەبوونی پارت ، ئەو کاتە دەنگدەرەکان دەنگ دەدەن بەو کەسانەی کە دەیاناسن و ناسراون بە خەڵکی باش و ڕابردوو پاك و بە ئەمەك و دڵسۆز بۆ وولات و بۆ خزمەتکردنی خەڵکی ، یان دەنگ دەدەن لەسەر بنەمای خزمایەتی و خێڵایەتی . بەڵام کاتێ پارتی ڕامیاری لە گۆڕەپانی مەیدانی ڕامیاری دەوڵەتدا هەبێت ، ئەو کاتە دەنگدەرەکان دەنگ دەدەن بە چەند کەسانێك ، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە لە هەمان پارتن ، هەمان بیرو باوەڕیان هەڵگرتووە کە دەنگدەر خۆی لایەنگری ئەو پارتەیەو هەمان بیرو باوەڕی هەڵگرتووە . واتا دەنگدەر کاتێ دەنگ بە کەسێك دەدات ، لە ڕاستیدا دەنگ بۆ پارتێك و بیرو باوەڕێك دەدات ، نەك بۆ خودی کەسەکە ، شتێکی سروشتییە ئەگەر بڵێین کاتێ دەنگدەر دەنگ بۆ کەسێك دەدات ، کە پارتێك لە پارتەکان دای ناوە وەکو پاڵێوراوێك وا هەست دەکات کە دەسەڵات بە دەستانی ناو پارتەکە بۆیە ئەو کەسەیان داناوە لەوەیە کەسێکی شیاوو ولێ هاتوو بێت ، بێگومان ئەو پارتەش بەشی خۆی زانیاری و ڕاهاتوویی هەیە بۆ دیاری کردنی پاڵێوراوەکانی خۆی ، پاش لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن پاڵێوراوەکان دیاری دەکەن ، کە بێگومان دەبێ ئەو پاڵێوراوانە لەو کەسانە بن کە شارەزان و بە توانان لە ڕیزەکانی پارتدا .

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی دیکەوە ، دەنگدەر ئەگەر تەنانەت خۆی پاڵێوراوێکیش پەسەند نەکات کە ئەو پارتەی دایناوە خۆی لایەنگرێتی ، ئەوە دەنگ هەر دەدا بەو پاڵێوراوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسەکەش پەسەند نەکات ئەوە دەزانێ کە ئەو کەسە ناتوانێ لە ڕێنمایی پارتەکەی لابدات و هەر دەبێ لە چوارچێوەی

سیاسەتی پارتەکەیدا کار بکات. بەلام مەرج نییە پارت ، حزب هەموو پالێوراوەکانی لە خەڵکی شیاوو پێك هاتبێ ، لەوانەیە هەندێ کات دیاری کردنی ئەو پالێوراوانە لەسەر بنەمای پەیوەندی ئەو کەسانە بێت لەگەڵ دەسەلات بە دەستانی ناو پارتداو یان لەسەر بنەمای خزمایەتی یان برادەری بێت. یان هەر بنەمایەکی دیکەی لەو جۆرانە نەك لێ هاتووی و شیاووی خودی کەسەکە خۆی. بەلام لە زۆر حالەتدا پالێوراوەکان لە خەلکانێك پێك دێن کە رووی کۆمەلایەتییان هەیەو ناسراوون بە خەلکی باش لە لایەن خەلکەوە .

لێرەدا دەتوانین بلێین لەوەیە یەکێ لە پارتەکان سەرکەوتن بەدەست بێنێ لە هەلبژاردندا ، لە رێگای چەند کەسێکەوە کە قورسای ولێ هاتووی خۆیان هەیە لە ناو کۆمەلدا . لە کاتێکدا پالێوراوەکان نوێنەری پارتەکان بن ئەوە نوێنەرایەتی پارتەکانیان دەکەن لە ئەنجومەنە نوێنەرایەتییەکاندا جگە لە نوێنەرایەتی کردنی دەنگدەرەکان ، واتا ئەو پالێوراوانە تەنها نوێنەرایەتی دەنگدەرەکان ناکەن کە دەنگیان بۆیان داوە ، بەلکو نوێنەرایەتی ئەو پارتەش دەکەن کە پالاوتویانێتی بۆ هەلبژاردن و رۆلی مەزنیشی بینیوە لە سەرکەوتنیان لە هەلبژاردندا .

ئەمەو رۆلی پارتەکان لە دەرچوونی پالێوراوەکان لە هەلبژاردندا رۆلێکی مەزنە ، چ لە سیستەمی یەك پارتدا بێت و چ لە سیستەمی دوو پارت و فرە پارتایەتیدا بێت. ئەو پالێوراوانەی کە سەربەخۆو بێلایەنن جیاوازیەکی زۆریان هەیە لەگەل ئەو پالێوراوانەی کە پارتێك لە پارتەکان پالپشتییان لێ دەکات ، ئەو جیاوازیەش دەگۆرێ لە دەولەتێکەوە بۆ دەولەتێکی تر بە پێی یاساکانی هەلبژاردن و داب و نەریتە پەیرەوکراوەکان لێرەو لەوێ . بۆ نموونە لە هەندێ لە وولایەتەکانی وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاساکانی هەلبژاردن بۆ خۆ پالاوتنی سەربەخۆکان و بێلایەنەکان مەرجی ئەوەیان داناوە ، کە دەبێ (٢٠٠٠) کەس پالپشتییان لێ بکا بۆ خۆپالاوتن . ئەمەش خۆی لە خۆیدا کۆسپێکە لە بەردەم پالێوراوە سەربەخۆکاندا . هەروەها لە ئنگلتەرا داب و نەریتە پەیرو کراوەکان ئەوە دەسەپێنن کە دەبێ هەر پالێوراوێك پشت بە لیژنەیەك ببەستێ بۆ پروپاگەندە کردن و کارکردن لە جەماوەر

بۆ ئەوەی بتوانێ دەنگی ئەو خەڵکە بەدەست بێنێ. لە کاتێکدا ئەو لیژنانەی لەلایەن پارتەکانەوە دادەمەزرێن بۆ پروپاگەندە کردن بۆ پاڵێوراوەکانی خۆیان، ئەوە شتێکی ئاسان نییە بۆ پاڵێوراوە سەربەخۆکان ، لە بەر ئەوەی پێکەوەنانی لیژنەی هەڵبژاردن ، شتێکی ئاسان نییە بۆ پاڵێوراوە سەربەخۆکان .

ئەگەر پاڵێوراوی سەربەخۆ بتوانێ لیژنەیەکی هەڵبژاردن بۆ خۆی پێك بێنێ ، ئەوە ئەو لیژنەیە ، ناتوانێ لە ئاستی لیژنەیەکدا بێ ، کە یەکێ لە پارتەکان دایمەزراندبێ ، لەبەر ئەوەی ئەو لیژنەیەی کە یەکێ لە پارتەکان دایدەمەزرێنێ هەموو ئامرازێکی ماددی و مەعنەوی دەخرێتە خزمەتیەوە . لە هەمان کاتدا تەجرەبەی ڕامیاری و ڕاڤەکردنی سیاسەت لەلایەن پارتەکانەوە بە شێوەیەکی بەردەوام ڕەنگ دانەوەی خۆیان دەبێت لەسەر جەماوەری دەنگدەر .

دووەم :

## پارتەکان و چۆنێتی ڕاڤەکردنی دەسەڵات لە دەوڵەتدا

سیستەمەکانی پارتایەتی لە دەوڵەتدا ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لەسەر بەڕێوەچوون و ڕاڤەکردنی دەسەڵات لە دەوڵەتدا ، بۆ نموونە سیستەمی پەرلەمانی لەسەر بناغەی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دامەزراوەو بەپێی دەستوور دەبێ دەزگای یاسادانان بە جیا کاری خۆی بکات لە دەزگای ڕاپەڕاندن ( وەزارەت ) ، هەروەها وەزارەت بۆی هەیە متمانە لە پەرلەمان بسێنێتەوە و پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە ، هەروەها پەرلەمان دەتوانێ متمانە لە وەزارەت بسێنێتەوە و وەزارەت دەست لەکار بکێشێتەوە ، ئەمە لە ڕووی تیۆرییەوە، بەڵام لە ڕووی پراکتیکییەوە، لە هەندێ سیستەمی حزبایەتیدا، ئەم پێوەرانە دەگۆڕێن . بۆ نموونە پەیڕەو کردنی سیستەمی دوو پارت ( نظام الحزبين ). دەبێتە هۆی ئەوەی یەکێ لەو پارتانە زۆرینەی هەبێ لە پەرلەماندا ، لەبەر ئەوەی وەزارەت لە پەرلەمانەوە هەڵدەقوڵێ و هەر لەو پارتە پێك دێ کە زۆرینەی هەیە لە پەرلەماندا ، واتا ئەو پارتەی زۆرینەی هەبێ لە پەرلەماندا ،

وەزارەت پێك دێنێ . جا بۆیە بەکردارو پراکتیك جیاکاری نامێنێ لە نێوان دەزگای یاسادانان و وەزارەتدا . هەردوو دەزگا لە پارتێکدا کۆ دەبنەوە ، یان با بڵێین پارتێك پێکەوە کۆیان دەکاتەوە، کۆبونەوەی ئەو دوو دەزگایەش لە ژێر چەتری پارتێکداو ئاراستەکردنیان لە رێگای ئەو پارتەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو دوو دەزگایە هەماهەنگیو هاوکاری یەکتر بکەن، ئەو چاودێرییە ئاڵوگۆڕکێیەی

نێوانیان کە دەستوور باسی دەکات ، یان متمانە لێ سەندنەوەو هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان لەلایەن وەزارەتەوە ، یان متمانە لە وەزارەت سەندنەوە و دەست لەکار کێشانەوەی ، ئەمانە هەموو مەرەکەبی سەر کاغەزن و لە دەستووردا هەن، بەڵام لە رووی پراکتیکییەوە جێبەجێو پەیڕەو ناکرێن .

بۆنموونە لە ئنگلتەرا کە لەسەر سیستەمی پەرلەمانی بەڕێوە دەڕوات دوو پارتی سەرەکی هەیە ، کرێکاران و پارێزگاران ، کە لە هەڵبژاردنەکاندا یەکێ لەو دوو پارتە زۆرینە بەدەست دەهێنێ ئەوکاتە ئەو پارتە زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمانی بەدەست دەکەوێت. هەر لە پارتی زۆرینەی پەرلەمانیش وەزارەت پێکەوە دەنرێ . جا بۆیە ئەو دوو دەزگایە لە جێگای چاودێری و بەکارهێنانی ئەو گوشارانەی کە لە دەستووردا هەن و لەسەرەوە باسمان کرد لە نێوانیاندا هەماهەنگیو هاوکاری هەیە ، پەرلەمان لە لایەن وەزارەتەوە هەڵناوەشێتەوە تا ئەو ماوەیەی کە یاسا دایناوە بۆ نوێنەرەکانی پەرلەمان ، کاتێ ئەو ماوەیە تەواوو بوو، ئەوە ماوەی یاسایی نوێنەرایەتی خۆیان تەواو دەکەن و هەڵبژاردنی تازە دەکرێ.

هەروەها وەزارەت متمانەی لێ ناسەنرێتەوەو دەستی لە کار ناکێشرێتەوە ، لە بەر ئەوەی ئەو پارتەی زۆرینەی لە پەرلەماندا هەیە ، خۆی وەزارەت پێکەوە دەنا . ئەگەر ئەو پارتەش خۆی وەزارەت پێکەوە بنات ، ئەوە چۆن ئیتر دەستی لە کار دەکێشێتەوە .

ئەمەو لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا کە ئەو سیستەمەش وەکو سیستەمی پەرلەمانی لەسەر بناغەی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دامەزراوە، کاتێ دوو پارتی سەرەکی هەبن لە دەوڵەتدا ، ئەوە لە زۆر حاڵەتدا سەرۆك کۆمار، کە سەرۆکی دەزگای راپەڕاندنە ئەندامی هەمان پارت دەبێت کە زۆرینەی هەیە لە پەرلەماندا. واتا

زۆرینەی پەرلەمانی و سەرۆك کۆمار یەك پارت کۆیان دەکاتەوە، بۆیە ئەو کاتە ، جیاکاری نێوان ئەو دوو دەزگایە ، ڕاپەڕاندن و یاسادانان، هەرچەندە لە ڕووی تیۆرییەوە لە دەستووردا هەبێ ، بەڵام بە کردەوەو پراکتیك ئەو جیاکارییە مەحاڵەو بە ڕێنمای پارتی زۆرینە هەماهەنگی و هاوکاری لە نێوانیاندا جێگای جیاکاری نێوانیان دەگرێتەوە ، بەڵام سیستەمی سەرۆکایەتی جیاوازە لە سیستەمی پەرلەمانی ، لەوەیە هەندێ جار سەرۆکی هەڵبژێردراو کە سەرۆکی دەزگای ڕاپەڕاندنە لە پارتێك بێت، زۆرینەی پەرلەمانیش لە پارتێکی دیکە پێك هاتبێت. واتا سەرۆکی هەڵبژێردراو لە پارتێکی ڕامیاری و زۆرینەی پەرلەمانیش لە پارتێکی دیکە ، هەروەکو ئێستا (٢٠٠١ز) لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبینرێت ، زۆرینەی پەرلەمانی لە پارتی دیموکراسییەو سەرۆك کۆماریش لە پارتی کۆمارییە. ئەمەو پەیڕەو کردنی سیستەمی یەك پارت لە دەوڵەتدا دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو دەزگاکانی دەوڵەت لە یاسادانان و ڕاپەڕاندن و زۆر جاریش تەنانەت دەسەڵاتی دادوەریش لە لایەن پارتی تاك ڕەوەوە بەڕێوە ببرێن، جا بۆیە بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان لە سیستەمی یەك پارتدا لە نێوان دەزگاکانی دەوڵەتدا پەیڕەو ناکرێ .

ئەگەر لە سایەی سیستەمی دوو پارتدا لە پەرلەماندا ، پارتی بەرهەڵستکار هەیە، لەوەیە هەندێ جاریش پارتی بەرهەڵستکار زۆر بە هێزبیت و بتوانێ ڕێگا لە دەزگای ڕاپەڕاندن بگرێ . ئەوە لە سایەی سیستەمی یەك پارتدا ، بەرهەڵستکار، ( ئۆپۆزسیۆن) ئەگەر هەبێتیش ، ئەوە ئەوەندە کزوو لاواز دەبێ کە هەر هیچی پێ نەکرێ ، لەوەیە هەندێ دەوڵەتیش ئۆپۆزسیۆنی هەر تیا نەبێ .

بەڵام کاتێ سیستەمی فرە پارتایەتی پەیڕەو بکرێ ، ئەوە بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان کە لە دەستووردا هەیە ، لە پراکتیکیشدا پەیڕەو دەکرێ. لەبەر ئەوەی هیچ پارتێك لەو پارتانە زۆرینەیان نابێ لە پەرلەماندا ، کاتی واش هەیە چەند پارتێك ڕێژەیان لە پەرلەماندا لە یەکەوە نزیك دەبێ ، بۆیە بە ناچاری وەزارەتێکی هاوبەش پێك دێنن ، ئەو وەزارەتەش سەقامگرتوو نابێت و زۆر جار لە لایەن پەرلەمانەوە متمانەی لێ دەسەنرێتەوە و دەستی لە کار دەکێشرێتەوە . لە بەر ئەوەی پێکەوەنانی ئەو وەزارەتانە لە لایەن پارتە

جیاجیاکانەوە لەسەر بناغەی دابەشکردنی پلەو پایەیە ، هەندێ جار یەکێ یان زیاتر لەو پارتانە ڕازی نابن بەو پایەیەی بەریان دەکەوێت و لە ئیئتلاف دەکشێنەوە. یان ئەو پارتانەی کە لە دەرەوەی وەزارەتەکەن ، کێشە بۆ وەزارەت دروست دەکەن و تەگەرە دەخەنە بەردەمی .

ئەمەی کە لە سەرەوە باسمان کرد پەیوەندی بە سیستەمی پەرلەمانییەوە هەبوو. لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا ، سەرۆکی دەوڵەت دەبێ ئەندامی یەکێ لە پارتەکان بێت ، واتا پاڵێوراوی یەکێ لە پارتەکان دەبێتە سەرۆکی دەوڵەت لە کاتێکدا هیچ پارتێك لەو پارتانە کە لەسەر گۆڕەپانی ڕامیاری دەوڵەتن ، زۆرینە ناهێنن لە پەرلەماندا ، بۆیە دەزگای یاسادانان و دەزگای ڕاپەڕاندن بە کردەوە و بە تیۆر دوو دەزگای جیاوازن و لەبارە بنچینەی جیاکاری نێوانیان وەکو لە دەستووردا هاتووە پەیڕەو بکرێ . هەروەها سیستەمی هەڵبژاردنی پەیڕەوکراو لە وڵاتدا کار دەکاتە سەر ڕۆڵی پارتەکان لە هەڵبژاردنی نوێنەرەکان .

## سێیەم :

## سیستەمی هەڵبژاردن و کارتێکردنی پارتەکان لەسەر هەڵبژاردن :-

سیستەمی هەڵبژاردنی پەیڕەوکراو لە وڵاتدا کار دەکاتە سەر ڕۆڵی پارتەکان لە هەڵبژاردندا . بۆ نموونە پەیڕەوکردنی سیستەمی زۆرینە لە هەڵبژاردندا ڕۆڵی پارتە ڕامیارییەکان کەم دەکاتەوە و کاریگەرییان لاواز دەکات لەسەر بۆچوونی دەنگدەران. بە تایبەت کاتێ دەنگدان بۆ تاکە کەس بێ و ناوچەی هەڵبژاردن بچوك بێت. ئەو کاتە دەنگدەرەکان دەتوانن بە لێزانییەکی تەواوەوە دەربارەی پاڵێوراوەکان دەنگی خۆیان بدەن .

بەڵام ئەگەر هاتوو سیستەمی زۆرینە لەسەر بناغەی لیست بوو، ئەوە ڕۆڵی پارتە ڕامیارییەکان کاریگەر دەبێ لەسەر بیرو بۆچوونی دەنگدەران ، ئەو کاتە دەنگدەرەکان زیاتر دەنگ بۆ پارتە ڕامیارییەکان دەدەن نەك بۆ خودی پاڵێوراوەکان . بەڵام پەیڕەوکردنی سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی لە هەڵبژاردندا ، کە دەنگدان لەسەر بناغەی لیستەوە دەبێ ناوچەی هەڵبژاردن فراوان بێ . لێرەدا دوو حاڵەت هەیە :

یەکێکیان دەنگ دانە بە لسیتی داخراوو ، واتا هەر پارتێك لیستی خۆی دەخاتە دەنگدانەوە، دەبێ دەنگدەر دەنگ بۆ لیستی پارتەکان بدات بێ دەستکاری کردن ،

واتا یان دەبێ دەنگ بە لیستەکە بدات وەکو خۆی کە دابەزیووە، یان ڕەتی بکاتەوە و دەنگی پێ نەدات .

لەبەر ئەوەی دەنگدان بۆ لیستی پارتە ڕامیارییەکانە، پارتە ڕامیارییەکان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە ئاراستەکردنی بیروو بۆچوونی دەنگدەران و ئاراستەکردنی دەنگەکانیان. بەڵام لیستی داخراوو هەموو کاتێ بەو شێوەیە دانابەزێ ، بەڵکو هەندێ لە یاساکانی هەڵبژاردن بوار دەدەنە دەنگدەر لە جێگای ئەوەی دەنگ بۆ هەموو لیستەکە بدات ، دەتوانێ دەنگ بە هەندێ لە پاڵێوراوانی لیستەکە بدات و دەنگ بە هەندێکی تری نەدات .

لەم حاڵەتەشدا ، دەنگدەر دەنگ بە هەندێ لە پاڵێوراوانی هەمان پارت دەدات و دەنگ بە هەندێکی دیکەی نادات . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ، کە ڕۆڵی بەو ڕادەیە نابێ کە لە لیستی داخراودا هەیە ، لە کاتێکدا هەر چەندە پارتە ڕامیارییەکان کاریگەری خۆیان هەر دەبێ ، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕاو و بۆچوونی دەنگدەر لەسەر پاڵێوراوەکانی هەمان پارت کاریگەری خۆی دەبێ و دەنگدەر لە کاتێکدا دەنگ بە هەندێ پاڵێوراوانی هەمان پارت دەدات هەندێکی دیکەشی پەسەند ناکات و ڕەتی دەکاتەوە. حاڵەتی دووەم لیستی کراوەیە: واتا دەنگدەر دەتوانێ لە هەر لیستێك ناوی پاڵێوراوێك یان چەند پاڵێوراوێك بنووسێ و لیستێکی تایبەت بە خۆیەوە دروست بکات، واتا دەنگدەر دەنگ بە پاڵوراوانی چەند پارتێك دەدات لە هەمان کاتدا . لێرەدا ڕوون و ئاشکرایە ڕۆڵی پارتە ڕامیاریەکان کەم دەبێتەوە، بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا لەبەر ئەوەی لە سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەییدا ناوچەی هەڵبژاردن فراوانەو دەنگ دان لە سەر بناغەی لیستە کاریگەری پارتە ڕامیارییەکان ڕۆڵی خۆی دەبینێ و پارتە ڕامیارییەکان دەتوانن ئاراستەی بیرو بۆچوونی دەنگدەران بکەن. ئەمەو بە بۆچوونی من هەرچەندە سیستەمی هەڵبژاردنی پەیڕەوکراوو لەووڵاتدا کاریگەری خۆی هەیە لەسەر کارتێکردنی پارتە ڕامیارییەکان لەسەر بیرو بۆچوونی دەنگدەران ، بەڵام ئەو مەسەلەیە لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆڕێ.

- لە هەندێ جێگا و کاتدا تێکەڵ بوونی پارتە رامیارییەکان لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵییەکی پتەوەو لە سەر بناغەیەکی بەهێز دامەزراوە ، تا ئەو رادەیەی هەندێ جار دەگاتە رادەی توند رەوی، خەڵکی بە ئەو پەری توند رەوییەوە پشتی پارتە رامیارییەکان دەگرن و پەیوەندی لەسەر بناغەی لایەنگری بۆ پارتەکان جێگای پەیوەندییە سروشتییە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە. ئەم حاڵەتەش زیاتر لەو وڵاتانەدا روو دەدات کە پارتێك یان چەند پارتێکی رامیاری بە چالاکی رامیاری و سەربازی وڵاتیان رزگار کردبێ و تێکەڵ بوونی خوێنییان لەگەڵ خەڵك و جەماوەردا هەبێ . هەروەها رۆڵی پارتە رامیارییەکان کاریگەر و بەهێز دەبێ لەو کۆمەڵگەیانەی کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی و داب و نەرێتی کۆمەڵایەتی تیایاندا لاوازە و قۆناغێ پێشتر لە ژیانی شارستانی چوونەتە پێشەوە و کەسایەتی پەرستن و پیاو گەورەی تیایاندا باوی نەماوە. بەڵام لەو کۆمەڵگەیانەی کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەست بوون بە مۆراڵ و ئایینەوە تیایاندا بەهێزن و یان بە شێوەیەکی باش لە ئارادان ، ئەوە کەسایەتییەکان رۆڵی خۆیان دەبینن و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان جێگای لایەنگری بۆ پارتە رامیارییەکان دەگرنەوە. لە حاڵەتێکی وادا پارتە رامیارییەکان زۆر جار قاڵبی ئەو کۆمەڵگەیە وەردەگرن و خۆیان دەدەنە پاڵ کەسایەتییەکانی ناو کۆمەڵگەو رۆڵی خۆیان تا رادەیەك لاواز دەبێت. بە هەر حاڵ بۆ پەیرەوکردنی سیستەمێکی رامیاری دیاریکراو لە هەر وڵاتێك دەبێ رەچاوی رابردووی وڵات و رەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاستی هۆشیاری و پێداویستییەکانی خەڵکی ئەو وڵاتە بکرێت، لە هەمان کاتدا، سوود لە تەجرەبە وسیستەمە پەیرەوکراوەکانی تر بکرێ لە دەوڵەتەکانی دیکەدا .

لەوەیە سیستەمێکی رامیاری دابنرێ بە پێی(١) نوێترین و پێشکەوتوترین ئاست کە عەقڵی مرۆڤ پێی گەیشتبێ، بەڵام شکەست بێنێ لە رووی جێبەجێ کردنەوە بە هۆی نیەت خراپی ئەوانەی جێبەجێی دەکەن، یان سیستەمی پەیرەوکراو لە ئاستێکی بەرزتردابێ لە ئاستی ئەو گەلەی بۆی دانراوە .

---

(١) بڕوانە : د. سلیمان محمد الطماوی ـ مبادیء القانون الدستوری ص١٢.

# بەشی دووەم
# سیستەمە ڕامیارییەکان لە ڕووی ڕاڤەکردنی دەسەڵاتەوە

ئەم بەشەم کردووە بە دوو باسەوە لە باسی یەکەمدا باسی سیستەمی دکتاتۆری دەکەم و لە باسی دووەمدا باسی سیستەمی دیموکراسی دەکەم .

## باسی یەکەم
## سیستەمی دکتاتۆری

لە ڕاستیدا ئەو سیستەمانەی کە تاکە کەسێك بە ڕێوەیان دەبات تەنها سیستەمی دکتاتۆری نییە، بەڵکو چەند سیستەمێکیتر هەن کە دەسەڵات لەو سیستەمانەدابە دەستی تاکە کەسێکەوەیە ، لە بەرچاوترینیان سیستەمی دەسەڵات دارێتی میرنشینی ڕەها (الملكية المطلقة) و ئیستبدادییە.کە بەم سیستەمانە دەوترێ سیستەمە تاکە کەسییەکان .

بەڵام من لە باسەاکانی داهاتوومدا بە درێژی باسی سیستەمی دکتاتۆری دەکەم لەبەر ئەوەی میرنیشنی ڕەها و ئیستبدادی هەمان خەسڵەت و جیاکارییەکانی سیستەمی دکتاتۆرییان هەیە، هەر چەندە لەوەیە هەندێ خەسڵەتی تایبەت بە خۆیانیشیان هەبێت .

سیستەمی دکتاتۆری ئەو سیستەمەیە، کە دەوڵەت هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە ، واتە هیچ شتێك نابێ و نامێنێتەوە لە دەرەوەی چوارچێوەی دەوڵەت بێت. دەسەڵات لە دەوڵەتی دکتاتۆریدا هەموو بوارەکان دەگرێتەوە، سنورێکی دیاریکراوی بۆ نییە و پێبەند نییە بە هیچ یاساو ڕیاسایەکەوە کە بەرژەوەندییەکانی بخەنە مەترسیەوە .

سەربەستی تاکەکان، سەربەستی ئایدیا، سەربەستی ڕۆژنامەگەری ، مافی مرۆڤ و ئەو شتانە، دەبێ لە چوارچێوەی سیستەمی دەسەڵاتی دکتاتۆریدا لە قەڵەم بدرێ و سنووردار بکرێن. هیچ شتێك نییە لە سەرەوەو لە دەرەوەی دەسەڵاتی دکتاتۆری بێت. بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر ئەم بابەتە پێویست دەکات باسەکەمان بکەین بە چوار بەستەوە، لە بەستی یەکەمدا باسی بناغەی فیکری سیستەمی دکتاتۆری دەکەم ، لە بەستی دووەمدا باسی تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دکتاتۆری دەکەم، لە بەستی سێیەمدا باسی جۆرەکانی دکتاتۆریەت دەکەم و بەستی چوارەمم تەرخان کردووە بۆ هەڵسەنگاندنی سیستەمی دکتاتۆری .

## بەستی یەکەم :

## بناغەی فیکری سیستەمی دکتاتۆری[1]

سروشت و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و مرۆڤ و دەسەڵات لە هەر کات و قۆناغێکدا ، ئەو بابەتانە بوونە، کە زۆر توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە ، بێگومان خوودی بابەتەکان ئیلهام بەخش بوونەو ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان لەسەر کراوە.

دەسەڵات و فەلسەفەی دەسەڵاتێش لە چوارچێوەی ئەو بابەتانەدا باسیان لێوە کراوە. ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە، هەندێ لەو بۆچوونانە لایەنی نێگەتیڤانەی شتەکانیان وەرگرتووە، لەوەیە هەندێ لەو بۆچوونانەش لە هەندێ شتدا ئامانجی خۆیان پێکابێ.

- **تۆماس هۆبز**، ژیانی سەرەتایی کۆمەڵگە بەشەڕ و نائارامی و هەڵکوتانە سەر یەکتر و زاڵ بوونی بەهێز بە سەر بێ هێزدا لێك داوەتەوە. بە بۆچوونی ئەو هەر دەسەڵاتێ بێتە کایەوە، دەبێت خاوەن هێز و تواناو زەبرو زەنگ بێت بەرانبەر هاووڵاتیان ، کە

---

(٢) بڕوانە : د .یحیی الجمل ـ الانظمة السیاسیة المعاصرة ص٢٠٢-٢٠٦.

دەبێت هەموو تاکەکانی کۆمەڵ ملکەچی دەسەڵات بن ، ئەو دەسەڵاتەش دەبێ دەسەڵاتێکی ڕەها بێ و بەرپرسیار نەبێ بەرانبەر بە هیچ .

ـ کارل سمس دەڵێ: لە سیاسەتدا، خێر و شەڕ و جوانی و بەدەفە سالی نییە، بەلام لە سیاسەتدا دۆست و دوژمن هەیە ، بۆ دۆست هەموو شتێك هەیە، لەگەڵ دوژمنیشدا هەموو شتێك ڕەوایە، بێ پێ بەند بوون بە مۆراڵەوە

(اخلاق) لەبەر ئەوەی لە سیاسەتدا مۆراڵ نییە .

ـ میکافیلی لە کتێبەکەیدا ( الامیر ) : هەموو ڕێگاو ئامرازێکی شی کردوەتەوە بۆ میرنشین، کە چۆن دەسەڵاتی خۆی بەهێز و پتەو بکات بێ ئەوەی پێ بەند بێ بە مۆراڵەوە ، هەروەها وا دەبینێ ، میر دەتوانێ بۆ پێکهێنانی ئامانجەکان هەر ئامرازێکی ڕەوا و ناڕەوا بە کاربێنێت بێ پێ بەند بوون بە مۆراڵەوە .

ـ مۆسۆلینی دەڵێ: دەوڵەت هەموو شتێکە بەرانبەر تاکەکان ، دەوڵەت تاکەکان ناسڕێتەوە ، بەلام دەیانکاتە سەربازێك و دەیانخاتە خزمەت خۆیەوە ، تاکەکان دەبێ لەو چوارچێوەیەدا سەرفەرازبن کە دەوڵەت دەیەوێت و سنوورەکەی دیاری دەکات .

دەوڵەت گیانی هەمیشە زیندووی نەتەوەیە، کاری تەنها ئەوە نییە ئاسایش و سەلامەتی تاکەکان بپارێزێ و ئاستێکی بژێوی گونجاویان بۆ دابین بکات .

- کرۆمۆیل لە کاتی دەسەڵاتدارێتیدا لە ئنگلتەرا لە ناوەڕاستی سەدەی (١٧) دا ووتویەتی: ((لە دە هاووڵاتیدا نۆیان ڕقیان لێمە، ئەوە گرنگ نییە لە بەر ئەوەی دەیەمیان چەکدارە )) .

- هێگڵ دەڵێ: ((جەنگ باشترین شتە، بەها جوانەکانی مرۆڤایەتی بەدەر دەخات)).

ـ مۆسۆلینی دەڵێ : (( ئاشتی هەمیشەیی نە لە تواناداهەیە و نە سوودیشی هەیە)) .

ـ ئەفلاتۆن دەڵێ : (( سروشت ، نێری دروست کردووە و مێیشی دروست کردووە ، زیرەکی داوەتە هەندێ کەس و بێ بەشی کردووە لە هەندێکی تر ، ئەمەش وای

کردووە خاوەن خێزان هەبێت و دەسەڵاتی بەسەر خێزانەکەی خۆی و کۆیلەکانیدا هەبێ، کە ئەو کۆیلانە زیرەکییان پێ نەبەخشراوە)) .

بە خوێندنەوەی ئەم ڕاو بۆچوونانە بۆمان دەردەکەوێ ، کە بناغەی سیستەمی دکتاتۆری لە دوو فاکتەرەوە سەرچاوەی گرتووە :

یەکێ لەوانە تێڕوانینە بۆ مرۆڤ ، ئەوی تریانیش تێڕوانینە بۆ دەوڵەت .

- تێڕوانینی دکتاتۆرییەکان دەربارەی مرۆڤ لە دوو گۆشە نیگاوە سەرچاوەی گرتووە.

- باوەڕ بوون بە تاکی جیاکار ( الفرد الممتاز )

- باوەڕ بوون بە جیاوازی و نایەکسانی لە نێوان تاکەکاندا .

تاکەکان وەکو یەك نین، بەحوکمی سروشت بە جیاوازی دروست بوون ، جیاوازییان هەیە لە هەموو شتێکدا، ڕەنگ ، دەنگ ، زمان ، هۆشیاری و زیرەکی،...

ئەم جیاوازییانەش چەند شتێکی بنەڕتین و لە بناغەوە مرۆڤ وا دروست بووە. جیاوازییەلێکی کاتی، یان تاك و تەراکارانە نیین (أستثنائی)، هەندێ لە تاکەکان بە حوکمی سروشت باش دروست بوونەو هۆشیار و زیرەکن و هەر بۆ ئەوە دروست بوونە ببنە دەسەڵاتدار ، کەسانی تریش هەن، هەر بۆئەوە هاتوونەتە کایەوە دەسەڵات بەسەر بن .

ئەمەو سەرۆك دەبێت لە هەموو تاکەکانی تر جیاکار بێ، هەموو ئاوات و ئامانجەکانی گەل لە خۆ بگرێ و ئەو پاڵەوانە بێ کە سەربەرزی وولات بپارێزێ و سەرکەشی بۆ گەل بگێڕێتەوە. ئەو تەنها نوێنەرو بریکاری گەل نییە، بەڵکو خۆی گەلەو ویست و ئارەزووی ئەو ویست و ئارەزووی گەلە . گەل کاتێ پیرۆزی بکاو ملکەچی ببێ ، ئەو کاتە پیرۆزی خۆی دەکاو ملکەچی خۆی دەبێ . هەروەها لە بیرۆکەی تاکی جیاکارەوە ، ڕەگەزی جیاکارو نەتەوەی جیاکاریش دێتەکایەوە .

هەر وەکو هتلەر ڕەگەزی ئاری بە ڕەگەزێکی مەزن و جیاکار دادەنا ، مافی ئەوەی پێ دەدا دەست بگرێتە سەر جیهانداو ببێتە دەسەڵاتداری . نەتەوەی یەهودیش لە لایەن هەندێ نوسەران و سیاسەتمەدارانی خۆیانەوە ، بە گەلی هەڵبژێردراو لە لایەن خوداوە ناوزەردی دەکەن .

ئەمەو تێڕوانینی دکتاتۆرییەکان دەربارەی دەوڵەت :

دەوڵەت هەموو شتێکەو دەسەڵاتی دەوڵەت ڕەهاو بێ سنووره ، هیچ شتێك نییە سنوور بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت دابنات و هیچ شتێکیش نییە لە دەرەوەو لە سەرەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بێ. دەوڵەت گیانی هەمیشە زیندوو ئیرادەی خودایە لەسەر زەمین‌و تاکە بەهای ڕەهاو بێ نەزیرە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا. ئەمەو بەپێی سیستەمی دکتاتۆری ، یاسا نابێتە ڕێگر لە دەوڵەت و سنوورداری بکا لە پێناو بەرژەوەندی تاکەکان و پاراستنی سەربەستیەکانییان، بە پێچەوانەوە تاکەکان دەبێ ملکەچی دەوڵەت بن و تا ئەو سنوورە سەربەست بن، زیان بە بەرژەوەندی دەوڵەت نەگەیەنن ، دەبێ سەربازێك بن لە خزمەتی دەوڵەتدا .

## بەستی دووەم
## تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دکتاتۆری

لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دکتاتۆری :-

**- سیستەمی دکتاتۆری، سیستەمێکی تاکە کەسیە:**

سیستەمی دکتاتۆری، سیستەمێکی تاکە کەسییە، پەیوەستە بە کەسی دکتاتۆرەوە ، دکتاتۆر خۆی دەسەڵاتی وولاتی بە دەستەوەیە ، خۆی خاوەن بڕیارەو لەو کارەدا پەنا دەباتە بەر خەڵکی لاوازو بێ توانا لە بەر ئەوەی ئامێری دەستی خۆی بن و لە چوارچێوەی ئەو دەرنەکەون ، هەرچەندە دکتاتۆر سوود لە کەسانی خاوەن ئەزموون و خەڵکی زانا وەردەگرێ، بەڵام ئەو کەسانە بە وونی دەمێننەوەو لە سەر گۆڕەپانی ڕامیاری دەوڵەت دەرناکەوون، لەوەیە دکتاتۆر ئەنجومەن و دەزگای جۆراوجۆر پێك بێنێ‌و وانیشان بدات کە دەوڵەت دەزگای یاسا دانان و دەزگای ڕاپەڕاندی یاسایی هەیە ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە هەموو ئەنجومەن و دەزگای دکتاتۆرین بۆ چەواشە کردن و پەیرەو کردنی سیاسەتی دکتاتۆریانەی خۆی دکتاتۆر بەکاریان دێنێ .

ئەمەو زۆربەی سیستەمە دکتاتۆرییەکان ئەم جۆرە دەزگایانەیان دامەزراندووە، لە ڕووی دەقی دەستوورییەوە هەن ، بەڵام ئەم کارە نابێتە هۆی ئەوەی کە ڕەنگی دکتاتۆری لەسەر ئەو سیستەمە بشۆرێتەوە .

دکتاتۆر لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی، کە بە سەر هەموو بەرژەوەندییەکانی تردا زاڵە، هەموو شێوازەکانی توندو تیژی و زەبروزەنگ بەکار دێنێ بۆ پاکتاو کردنی هەموو نەیارەکانی لە ناوەوەی وڵاتدا. لە پێناو بە ئامانج گەیاندنی ئەو سیاسەتە، هەڵدەستێ بە لە ناو بردنی هەر جۆرە چاودێریەکی ڕامیاری لە وڵاتدا بۆ ئەوەی دکتاتۆر خۆی و پاشکۆکانی سەرفراز بن لە بەڕێوەبردنی سیاسەتدا بە جۆرێك کە بەرژەوەندی تاك ڕەوانەی خۆیان بپارێزن. جا لە حاڵەتێکی وەهادا مافی مرۆڤ و هەر جۆرە سەربەستییەك بوونی بۆ نابێ، خۆ ئەگەر هەبێتیش ئەوە تیرۆر دەکرێ .

دەبێ تاکەکانی کۆمەڵگە لە چوارچێوەی بۆچوونەکان و بیری کەسی دکتاتۆردا بیر بکەنەوە ، ئەو هەست و ئارەزوو ویستانەشیان بخنکێنن کە لەگەڵ ویست و ئارەزووی سەرۆکدا ناگونجێ . سەربەستی تاکەکەسی ، مافی مرۆڤ ، سەربەستی کۆبونەوە ، سەربەستی ڕۆژنامەگەری ، لە دەوڵەتی دکتاتۆریدا هیچ بوونێکی ئاکتیف و پراکتیکی بۆ نییە. سەرۆك ، دکتاتۆر هەموو شتێکە ، بلیمەتە، ئازایە، هۆشمەندە، کەس نییە لە وڵات و بگرە لە هەموو جیهاندا شان لە شانی ئەو بدات. خودا هەڵی بژاردووە بۆ میلەت و پێویستە بۆ وڵات، ئەگەر ئەو نەبێ ئەوە ژیان ڕادەوەستێ .

ئەمە شێوەی پڕوپاگەندە کردنە بۆ سەرۆك، هەڵنان و هەڵدانی سەرۆك لە سیستەمی دکتاتۆریدا ، شتێکی زۆر ئاساییەو، ڕۆژانە ڕاگەیاندن کاری بۆ دەکات. نەك تەنها ئەوەندەش، بەڵکو خەڵك هەردەم لە ترس و دڵە ڕاوکێدا دەژی، ترس لە ئەوەی لە بەر چاوەو، ئەوەش لە بەر چاو نییە، دکتاتۆر هەموو ئامرازێك بەکار دێنێ دژی خەڵکی ، کوشتن، بەندکردن، تۆقاندن، چەندەها دام و دەزگای جۆراوجۆری ئاشکراو نهێنی بەکار دێنێ بۆ تۆقاندنی خەڵکی. دکتاتۆر بۆ چەواشە کردن و فریودانی خەڵکی

هەندێ دروشمی بریق و باق بەرز دەکاتەوە و خۆی لە پاڵدا حەشار دەدات و لە تـەزووە هەستیارەکانی خەڵکی دەدات و هەستیان دەبزوێنێ و بە شتی دروست کـراوو لابەلایـەوە خەریکیان دەکات و لە ژیانی رۆژانەی خۆیان دووریان دەخاتـەوە ... بـۆ نموونـە هتلـەر لە کتێبەکەیـدا ( تێکۆشانم ) دەڵێ :

(( تۆانای جەماوەری بەربڵاو کەمە ، کەم زیرەکن ، شتیان زوو لـە بیر دەچێتـەوە ، بڕوا بە درۆ زلەکان زیاتر دەکەن لەو درۆیانەی کە لەسـەری ڕاهاتوون و بوەتـە شـتێکی ئاسایی لایان )) .

جا بۆیە وا دەبینێ ، کە دەبێ ئاستی پرۆپاگەندە لە ئاستی ئـەو خەڵکانـەدا بـێ کـە لە نزم ترین ئاستدان لە ڕووی رۆشنبیرییەوە، هەر چـەندە جەماوەری پرۆپاگـەندە بـۆ کراو زۆرو فراوان بوون ، دەبێ ڕگـەیاندن و پرۆپاگەندە زیـاتر نـزم بـێ و لـە ئاستێکی نزم تـردا بێ . هـەروەها پـەنا بردنـە بـەر شـەڕو خولقـاندنی ئـاڵۆزی و کـەش و هـەوای تـەمومژاوی ، ئـامرازێکی دیکـەی دکتـاتۆرە بـۆ شـێواندنی خـەڵکی و بـەردەوام بوونـی دەسەڵاتی خۆی.[1]

- هەبوونی یەك پارت :

تایبەتمەندییەکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دکتاتۆری ، هەبوونی یـەك پارتە لە وولاتدا، بێگومان ئەو پارتەش پارتی دکتاتۆرە .

هەندێ جار دکتاتۆرەکان دەگەنە دەسەڵات لە ڕێگای پارتەکانیانەوە ، کـە زۆر جار ئەو پارتانە جوخت و چالاکن و لە دەوری سەرۆك پارتەکەیان کۆ دەبنەوە و بە باوەڕو دڵسۆزییەوە نزیك دەبنەوە، گوێ ڕایەڵی سەرۆك پـارت دەبـن و قسـەی پشت گوێ ناخەن. سەرۆکەکەیان دەگەیەننــە دەسـەڵات و هەیبـەت و نمـوودی بـۆ دروست دەکەن و گەورەی دەکەنەوە .

---

(١) بڕوانە : د.محمد کامل لیلة ـ النظم السیاسیة ص٣٨٠.

نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە ، گەیشتنی هتلەرە بۆ دەسەڵات لە ئەڵمانیا ، هەروەها گەیشتنی مۆسۆلینی بۆ دەسەڵات لە ئیتالیا ، کە پارتەکانیان جوخت و چالاك بوون و زۆر ڕێك و پێك و توند و تۆڵ بوون لە ڕووی ڕێکخستنەوە .

هەندێ جاریش دکتاتۆر خۆی دەگاتە دەسەڵات بێ ئەوەی پارتێکی ڕامیاری هەبێ ، بەڵام کاتێ دەگاتە دەسەڵات خۆی پارتێکی ڕامیاری پێکەوە دەنات.

بەڵام هەندێ بۆچوون هەیە دەربارەی ئەم پارتانە دەڵێن ئەو پارتانەی کە دکتاتۆرەکان پاش گەیشتنیان بە دەسەڵات پێکەوەی دەنێن . دەبێتە مۆڵگە و جێگای خەڵکی هەلپەرست و بوودەڵە و درۆزن ، کە زۆر جار بەرژەوەندی کەسینەیی خۆیان دەیان بەستێتەوە بەو پارتانەوە ، بڕوایان بە هیچ نییە جگە لە بەرژەوەندی خۆیان نەبێ ، هەرکاتێ دەسەڵات لەق بوو و بەرەو ڕووخان چوو ، ئەوانیش وازدەهێنن و ڕوو دەکەنە دەسەڵاتی تازە و لە دەوری کۆدەبنەوە ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو جۆرە پارتانە هیچ کەسێکی دڵسۆزیان تێدا نەبێ ، بەڵکو هەندێ کەس هەر دەبن دڵسۆزبن بۆ دکتاتۆر و پارتەکەی بەتایبەت ئەوانەی کادرن لە ڕیزی پارتەکەدا . نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە لە کاتی حوکمی سالازار لە پورتغال بەدی دەکرێ . بە هەر حاڵ و دکتاتۆرەکان لە ڕێگای پارتی دەسەڵاتدارەوە خەڵکی ڕێك دەخەن ، ئەو پارتەش تاکە پارتی کاریگەری سەر گۆڕەپان دەبێت ، لەوەیە دکتاتۆر پەنا بەرێتە بەر دروست کردنی چەند پارتێکی ساختە بۆ خەڵەتاندنی ڕای گشتی دەرەوە و ناوەوە ، کە گوایە لە وڵاتدا دیموکراسیەت و فرە پارتایەتی هەیە ، بەڵام ئەو پارتانە بێ کاریگەری و کارتۆنی دەبن بەرانبەر پارتی دەسەڵاتدار ، کەپێی دەڵێن پارتی فەرماندە ( الحزب القائد ) .

**ـ دکتاتۆری سیستەمێکی کاتییە :ـ**

دکتاتۆری ، بە تایبەت دکتاتۆری تاکە کەسی ، سیستەمێکی کاتییە، هەر چەندە لەوەیە دکتاتۆر پەنا بەرێتە بەر پێك هێنانی پارت و بە ئایدۆلۆژی کردنی سیستەمەکەی . بانگەشەی ئەوە بکات ، کە پارتەکەی هەتا هەتایە دەسەڵاتدار دەبێت هەروەك و هتلەر دەیگوت دەسەڵاتی نازی هەزاران ساڵ حوکم دەکات . مۆسۆلینی باسی سەدەی فاشیزمی دەکرد .

بەڵام ئەم سیستەمە بە نەمانی دکتاتۆر لە ناو دەچێت و نامێنێ ، بەڵام دکتاتۆری ڕێچکەیی بە تایبەت لەو وڵاتانەی کە ڕێچکەیەکی دیاری کراوو بناغەیەکی جەماوەری هەبێت و لە کۆمەڵدا ریشەی داکوتابێ ، ئەگەری ئەوەی هەیە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەسەڵات بەڕێوە ببات و بمێنێتەوە .

## بەستی سێیەم :

## جۆرەکانی دکتاتۆری[1]

وەکو لە بابەتەکەی پێشوودا ئاماژەم پێ کرد ، دوو جۆر دکتاتۆری هەیە:

**یەکەم : دکتاتۆری تاکە کەسی ( الدکتاتوریە الفردیە ) :-**

دکتاتۆری تاکە کەسی زاڵ بوونی کەسێکە ، تاکێکە بەسەر وڵاتداو بەڕێوە بردنی دەسەڵات لە لایەن ئەو تاکە کەسەوە . کە پشت بە تەجروبەی کەسێتی خۆی دەبەستێ. دەوڵەت لەسەر ئیرادەی ئەو بەڕێوە دەڕوات . ئەمەو بەشێوەیەکی گشتی ، دەسەڵاتی دکتاتۆری لە ڕێگای کودەتای سەربازی و زەبروزەنگەوە دێتەکایەوە ، بەڵام لەوەیە هەندێ جار دکتاتۆر بە شێوەیەکی ئاسایی و دیموکراسی دەسەڵات بە دەست بگرێت و پاشان دکتاتۆریەتی خۆی بسەپێنێ و دیموکراسی لە وڵاتدا لە نێو ببات ، هەر وەك هتلەر لە ساڵی ( ١٩٣٣ز )بە هەڵبژاردن و بە شێوەیەکی دیموکراسی گەیشتە دەسەڵات و پاشان هەموو دام و دەزگا دەستوورییەکانی تێك داو بە ئاگرو ئاسن فەرمان ڕەوایی ئەڵمانیای کرد و ئەڵمانیای ڕوو بە ڕووی جەنگێکی دژوار کردەوە کە هەموو جیهانی گرتەوە و زەرەرو زیانێکی گیانی و ماددی زۆری بە ئەڵمانیا و هەموو جیهان گەیاند. بە هەر حاڵ بە پێویستی نازانم زیاتر لەسەر دکتاتۆریەتی تاکە کەسی بدوێم ، لەبەر ئەوەی لە باساکانی پێشووماندا بە چڕوپڕی باسی سیستەمی دکتاتۆریم کرد بەگشتی ، کە خۆی لە خۆیدا هەموو لایەنەکانی دکتاتۆری تاکە کەسی دەگرێتەوە .

---

(١) بڕوانە : د. علی غالب العانی ـ الانظمة السیاسیة ص٦.

**دووەم : دکتاتۆری ڕێچکەیی ( الدكتاتورية المذهبية ) :-**

دکتاتۆریەتی ڕێچکەیی ئەو دکتاتۆریەتەیە کە بەند نییە بە تاکە کەسێکەوە ، بەڵکو گرێدراوی چەمکێکە یان بیرو بۆچوونێك دەربارەی دەوڵەت و دەسەڵاتی ڕامیاری. دەوڵەت دەبێ بەپێی ئەو بیرو بۆچوونە بڕوات بەڕێوەو لە چوارچێوەی ڕێچکەی دیاری کراو و دەرنەچێت. دەسەڵات بەڕێوەبردن و گواستنەوەی دەسەڵات لە دەستێکەوە بۆ دەستێکیتر دەبێ بەپێی پرانسیپ و لە چوارچێوەی ڕێچکەی دیاری کراودا بێت .

دوو نموونەی زەق هەن دەربارەی دکتاتۆریەتی ڕێچکەیی ، کە لە هەمان کاتدا دوو فەلسەفەی دژ بە یەکن .

ئەو دوو فەلسەفەش :-

١. فەلسەفەی ماتریالیزم ( الفلسة المادية ) .

٢.فەلسەفەی ئایدیالیزم ( الفلسة المثالية ) .

١.فەلسەفەی ماتریالیزم :

فەلسەفەی ماتریالیزم ، وەکو لە ناوەکەی دیارە . ماددەی کردۆتە بناغەی فەسەفەکە. مادده، بناغەی شتەکانە و ، هەمیشەییەیەو، پێش بیر( فکر) هەر هەبووە و دروست نەکراوە .

ئەمەو ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ڕێچکەیی مارکسییە ، کە فەلسەفەیەکە مارکس لەسەر بناغەی ماددی جەدەلی بونیادی ناوە، هەندێ دەوڵەتانیش لەسەر بناغەی ڕێچکەیی مارکسی دکتاتۆریەتی ڕێچکەیی تیایاندا دەسەڵات

بەڕێوە دەبات ، بۆیە پێویست دەکات بزانین ماتریالیزمی جەدەلی چییە :

مادده ، بناغەی بوونە ، واتا مادده هەر هەبووەو بوون پێك دێنێ ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ، کە گەردوون لەسەر مادده دامەزراوەو گەردوونی ماددی شتێکی نادیارو غەیبی نییە، ئەوەی ئەمڕۆ شاراوەیەو نازنرێ ، لەوەیە سبەینێ بە هۆی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیاوە ئاشکرا بکرێ . ئەمە دەربارەی چەمکی ماتریالیزم بوو، ئەما دەربارەی چەمکی جەدەل :

شتەکان پێکەوە لکاوون و پەیوەندییان پێکەوە هەیە، هەرچەندە لە ڕووکەشدا جیاواز، یان جیاکار دیار بن. هەروەها شتەکان ، شت و دژەکەشی لە ئامێز دەگرن، کە لە تەبایی‌و ناکۆکیدان لە هەمان کاتدا . شتەکان سەقامگرتوو نیین، بەردەوام لە پێشکەوتندان، ئەو پێشکەوتنەش بەرە بەرە دەبێ ، تا دەگاتە ئەندازەیەك گۆڕانکارییەکی کوتوپڕی بەسەردا دێت ، ئەو گۆڕانکارییەش، گۆڕانکارییەك دەبێ لە ڕووی چۆنێتییەوە نەك چەندێتی .

ئەمەو لەبەر ئەوەی گۆڕانکاری لە ماوەیەکی دیاری کراودا شتێکی تازە دەهێنێتە کایەوە، کە لە ڕووی چۆنێتییەوە لە شتە کۆنەکە جیاوازە. ئەوە تازە کۆنە دەسڕێتەوەو خۆی جێگای دەگرێتەوە. بەم شێوەیە هەر پێشکەوتن وا دەکات تازە کۆنە ببێت و تازەی تر بیسڕێتەوەو جێگای بگرێتەوە. بەڵێ مارکس مادده بە بناغەی بوون دادەنات‌و بیرو باوەڕ ڕەنگدانەوەی ماددەیە، واتا بیرو باوەڕ بۆیە هەیە لەبەر ئەوەی مادده هەیە.

ئەمەو فەیلەسوفی ئەڵمانی هێگل ( ١٧٧٠ – ١٨٣١ز ) دەڵێ :

بیرۆکەی ڕەها ( الفكرة المطلقة) بناغەی بوونەو پێش ماددەیەو پەیداکەری ماددەیە.

بۆیە مارکس لەسەر ئەم بۆچوونەی هێگل دەڵێ :

ئەو (مارکس )، وای کرد جەدەل لەسەر پێی بوەستێ لە کاتێکدا هێگل سەروو ژێر وەستاندبووی .

بەهەر حاڵ فەلسەفەی مارکسی دەربارەی دەوڵەت و دەسەڵات لەسەر بناغەی ململانێی چینایەتی بنیاد نراوە، ململانێی نێوان چینی کرێکاران و چینی سەرمایەداران . ئەو ململانێیەش یەك شێوە لە خۆ ناگرێت ؛ لە لایەکەوە ململانێیەکی ئابوورییە، چینی کرێکاران وکرێکارەکان داوای کرێی باش و دیاری کردنی کاتژمێری کارکردن دەکەن ، بۆ چاککردنی بژێویان ، لە بەرانبەر ئەوەدا چینی سەرمایەداران وخاوەن کارگەکان هەوڵ دەدەن کەمترین کرێ بدەنە کرێکار تا بتوانن زۆرتر سوودی لێ وەربگرن و کاری پێ بکەن .

هەروەها ململانێی نێوان ئەو دوو چینە ململانێیەکی ئایدۆلۆژییە، چینی کرێکاران دەیەوێ ئایدۆلۆژیەتی خۆی ، کە ئایدۆلۆژیەتی چینی پرۆلیتاریایە بسەپێنێتە سەر ئایدۆلۆژیەتی چینی بورژوا و جێگای ئەو ئایدۆلۆژییەتە بگرێتەوە. هەروەها لە هەموویشی زیاتر ململانێیی ڕامیارییە لە نێوان ئەو دوو چینەدا، چینی کرێکاران دەیەوێ چینی بورژوا ووردو خاش بکات و خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی لێ بسێنێتەوەو سۆشیالستی دامەزرێنێت و حکومەتی چینی پرۆلیتاریا پێکەوە بنات ، کە ئەوەش لە ئەنجامدا شیوعیەتی لێ دەبێتەوە .

ئەم قۆناغەش پەیوەندی بە خەباتی چینی کرێکارانەوە هەیە، کە دەبێ لە چوارچێوەی پارتێکی کۆمۆنستیدا خۆی ڕێکبخات بۆ بەرپاکردنی شۆڕش و هەرەسهێنان بە دەسەڵاتی سەرمایەداران . هەروەها مارکسییەکان وا دەبینن ، هیچ چینێك بە ئارەزووی خۆی واز لە دەسەڵات ناهێنێ ، بۆیە دەبێ ناچار بکرێ . ئەو چینەش مارکسیەکان مەخسەتیانە ، چینی بورژووایە ، کە دەبێ چینی کرێکاران ، چینی چەوساوە ، شۆڕشێك بەرپا بکەن ، بێگومان سەرکەوتن لە قازانجیان دەبێ . ئەمەش لە کاتێکدا ڕوودەدات ، کە چەوساندنەوەی سەرمایەداران بۆ کرێکارەکان دەگاتە ئاستێك نیتر تەحەمول ناکرێ ، چەوساوەکان و زوڵم لێ کراوەکان دەتەقنەوە و شۆڕش بەرپا دەکەن. کاتێ شۆڕش بەرپا کرا ، ئەوکاتە چینی کرێکاران چینی سەرمایەداران دەڕوخێنێ و هیچ پاشماوە و ئاسەوارێکی بۆ ناهێڵێتەوە ، بۆ ئەوەی دەوڵەتی چینی پرۆلیتاریا پێکەوە بنات و کارتێکردنی پاشماوەی سەرمایەدارانی لەسەر نەبێ. پێکەوە نانی دەوڵەتی سۆشیالیستی هەنگاوێکە بۆ بەدی هێنانی هاتنە کایەوەی کۆمەڵگەی شیوعی ، کە ئەو کاتە هەبوونی دەوڵەت پێویست ناکات و دەوڵەت بەرەو نەمان دەچێت[1] . ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە: زۆر کەس باسی جیاوازی و ململانێی چینایەتییان کردووە پێش مارکس و دوای مارکسیش .

---

(١) بڕوانە : د. محمد کامل لیلة ـ النظم السیاسیة ص٣٨٦.

بەڵام ئەوەی مارکسی لە نامارکسی جیا دەکاتەوە ئەوەیە :

چەمکی مارکسی دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە دەبێ چینی کرێکاران، دەوڵەتی خۆی پێکەوە بنات، دەبێ دەسەڵاتی تاکە چین بەرجەستە بێ ، کە ئەویش دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریایە ، واتا دەبێ چینی کرێکاران بەتەنهاو تاك ڕەوانە دەسەڵات بگرێتە دەستو دکتاتۆریەتی چینی کرێکاران بێتە ئاراوە .

لە کۆتایشدا ئەوە دەخەینە ڕوو بیری سۆشیالیزم دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی زۆر کۆن[1] .

ـ ئەفلاتۆن لە کتێبەکەیدا ( الجمهوریە ) باسی لە بیری سۆشیالیزم کردووە و بە پێویستی زانیوە بۆ دابین کردنی هەماهەنگی لە کۆمەڵگەدا .

ـ هەروەها بیری سۆشیالیزم لە سەدەکانی شازدەیەم و حەفدەیەم گەشەی کرد بە هۆی نووسینەکانی سان سیمۆن و فۆرییر و لویس بلانك و ئۆێن و هەندێ نووسەرانی دیکە .

ـ بیردۆزی ئینگلیزی تۆماس مۆر Thomas Morrs لە کتێبەکەیدا شاری خەیاڵ Utopia باسی کۆمەڵگەیەك دەکات لە سێ ملیۆن یان چوار ملیۆن کەس پێکهاتبێ ، پێکەوە بژین بێ هەبوونی خاوەندارێتی ، موڵکیەتی تایبەت ، کاروبارەکانیان لە ڕێگای چەند فەرمانبەرێکی هەڵبژێردراوەوە ببرێ بەڕێوە . کە کار هەڵسەنگێنن و دیاری بکەن بە پێی پێداویستیەکانی کۆمەڵ. هەروەها ئاراستەی بەرهەمهێنان بکەن ، هەر تاکێکیش لەم کۆمەڵگەیە ژیانێکی سادە و ئاسان بەسەر بەرێت بێ ئەوەی بزانێ نەداری چیە .

ـ بیردۆزی ئیتالی کەمپانیلا Campanella لە کتێبەکەیدا شاری خۆر La cite dusoleil باس لە شارێکی خەیاڵی دەکات ، خەڵك پێکەوە بژین لەسەر بناغەی خاوەندارێتی ، موڵکیەتی جەماعی و ژیانی هاوبەش .

بە خاوەنی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە دەڵێن سۆشیالیزمە خەیاڵییەکان.

---

(١)بڕوانە : د.طعیمة الجرف ـ النظریات و النظم السیاسیة و سیادة القانون الدستوري ص١٥٩.

## ٢ـ فەلسەفەی ئایدیالیزم ( الفلسفة المثالیة):

فەلسەفەی ئایدیالیزم باوەڕی بەوە هەیە، کە بیر(فکرە) پێش مادده هاتووە و ئەویش ماددەی پەیداکردووە و بینیویەتیەوە .

ئەو ڕێچکەو بیرو باوەڕانەی وا دەبینن کە گەردوون خودا دروستی کردووەو ئەو پەیداکەرێتی ، دەبێ باوەڕیان بە فەلسەفەی ئایدیالیزم هەبێ .

ئەم فەلسەفەیەش فەلسەفەیەکی زۆر کۆنەو تا ئێستایش پەیڕەوکەرانی زۆرن. لەدێر زەمانەوە چەندەها دەسەلات و دەوڵەت ، لەسەر بناغەی ئایینی پێکەوە نراوون ، لەوانەش ئایینی ئیسلام ، کە تا ئێستاش چەند نموونەیەکی زیندوو هەن و دەوڵەتیش هەیە لەسەر بناغەی ئایینی ئیسلام پێکەوە نراووە ، بۆ نموونە لە ئێران ، دکتاتۆریەتی ڕێچکەیی تیا پەیڕەو دەکرێ لەسەر بناغەی ڕێچکەی شیعە، کە ڕێچکەیەکە لە ڕێچکەکانی ئایینی ئیسلام لە دەوڵەتدا. لە کاتی شۆڕشی ئیسلامییەوە بە سەرۆکایەتی سەرکردەی کۆچ کردوو خومەینی، لەو وولاتەدا سیستەمێکی دەسەلات هەتووەتە کایەوە کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە، ئەو دەسەلاتەش لە چوارچێوەی ڕێچکەی شیعەدا بەڕێوە دەچێ ، بە پێی فەرمودەکانی ئایینی ئیسلام دەربارەی دەسەلاتن ،هەر جموجوڵ و چالاکییەك لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیە سەرکووت دەگرێ وبە ناڕەوا و کوفر لە قەڵەم دەدرێ .ئەوەی ڕاستی بێ لە ئایینی ئیسلامدا ، کە جیاکاری نازانێ لە نێوان ئایین و دەوڵەتدا و هەردووکیان پێکەوە کۆ دەکاتەوە ، دەبێ دەسەلات لە دەوڵەتدا بە دەستی پیاوانی ئایینیەوە بێت و دەوڵەت بە پێی شەریعەتی ئیسلام بەڕێوە ببرێت ، بە پێچەوانەی ئەوەوە هاوولاتیان دەبێ ئەو کاتە دەسەلات ڕەت بکەنەوە و قبوڵی نەکەن .

هەروەها شەریعەتی ئیسلامی هەموو بەرهەڵستکار و ئۆپۆزسیۆنێك ڕەت دەکاتەوە ئەگەر لە چوارچێوەی ئەو شەریعەتەدا کار نەکەن ؛ واتا پارتە مارکسییەکان و پارتە زانست خوازەکان (عەلمانییەکان) ڕەت دەکاتەوە و نابێ هیچ پارت و ڕێکخراوێکی لەو جۆرانە هەبێ لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیدا.[1]

---

(١) بڕوانە : د. محمد عمارة ـ هل الاسلام هو الحل ؟ كيف ولماذا؟

## بەستی چوارەم :
## هەڵسەنگاندنی سیستەمی دکتاتۆریەت

سیستەمی دکتاتۆری لەگەڵ ئەو هەموو نایەتییانەی ( سلبیات ) ، کە هەیەتی وەکو کۆبوونەوەی دەسەڵات لە دەستی تەنها کەسێکدا یان تەنها گروپێك ، زندەچاڵ کردنی سەربەستی تاکەکان و پێ شێل کردنی مافی مرۆڤ . بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ لە سیستەمە دکتاتۆرییەکان توانیویانە خزمەتی باشی وڵاتەکانیان بکەن ، توانیویانە ئاستێکی باش لە پێشکەوتن ببڕن لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریدا...

هەروەها دەستووری هەندێ لە دەوڵەتەکان لە کاتی قەیران و ڕەوشی نالەباری دەوڵەتدا ، هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی کەسێکدا ، کە زیاتر ئەو کەسە سەرۆك کۆمارە کۆدەکەنەوە لەبەر ئەوەی بتوانێ ڕووبەڕووی قەیرانەکان ببێتەوە کە لە هەندێ وەختدا ڕووبەڕووی دەوڵەت دەبنەوە ، ئەم حاڵەتەش هەندێ لە یاسا زاناکانی یاسای دەستووری پێی دەڵێن : دکتاتۆری دەستووری ، نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە :

ماددەی ( ١٦ ) لە دەستووری فەرەنسا لە ساڵی( ١٩٥٨ز ) سەرۆك کۆماری دەست واڵا کردوە، کە ڕاڤەی دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەراندن بکات لە کاتێکدا ئەگەر مەترسییەك لە ئارادا بوو و بووە هەڕەشە لەسەر کۆماری فەرەنسا و دام و دەزگا دەستوورییەکانی. دەقێکی بە هەمان شێوە دەبینرێ لە دەستووری ئەڵمانیا لە ساڵی ( ١٩١٩ز ) .ئەمەو لێرەدا ئەوە دەخەینەوە بیر، کە دکتاتۆری نەخۆشی دەسەڵاتەو ئەگەر بۆ هەندێ کاتیش تۆزێ گونجاو بێ ، دەبێ دەسەڵات وەکو ئەنجام ڕێڕەوەی خۆی بگرێ و بگەڕێتەوە بۆ گەل .

## باسی دووەم
## سیستەمی دیموکراسی
### چەمکی دیموکراسی ( مفهوم الدیمقراطية ) :-

دیموکراسی زاراوەیەکی یۆنانییە لە دوو ووشە پێك هاتووە کە واتای دەسەڵاتی گەل دەگرێتە خۆی ، واتا سیستەمی حوکمێك کە لە گەلەوە سەرچاوەی گرتووە ، بە ئەمەش جیاکاری دەکرێ لە نێوان دیموکراسیو مۆنۆکراسیدا کە لفانەی دەسەڵاتی تاکە کەسیە. هەروەها لە نێوان دیموکراسیو ئەرستۆکراتیدا کە دەسەڵاتی کەمایەتی دەگرێتە خۆی ، واتا حوکمڕانی گەل لەلایەن کەمایەتییەوە.شتێکی ئاسایییە ئەگەر بڵێین دەسەڵاتی تاکەکەسیان دەسەڵاتی کەمایەتی دەبێتە هۆی ئازاردان و پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ و زەوت کردنی سەربستی گیانی تاکەکانی کۆمەڵ ، ئەمەش ئەگەر بەشێوەیەکی وورد لێکی بدەینەوە هۆیە بنەڕەتییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی دەروونی کەسی خاوەن دەسەڵات و لە هەموو حاڵەتێکدا تاکە کەسێك مرۆڤێکەو وەکو هەر مرۆڤێك تایبەتمەندی خۆی هەیە. لەومیە حاڵەتی دەروونی خاوەن دەسەڵات ئاسایی نەبێ، ئەو کاتە گەل و وولات دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی ئەو دەروون و عەقڵیەتەوە، جا ئیتر دەبێ لە پێشێلکردن و زەوت کردنی ماف و سەربەستیەکان زیاتر چ شتێك بەدی بکرێت بێگومان خاوەن دەسەڵات لەپێناو مانەوەی و بە هێزکردنی دەسەڵاتی خۆی هەموو ئامرازێکی ڕەوا و نا ڕەوا بەکار دەهێنێ. بەڵام دیموکراسی بە پێچەوانەی ئەوەوە ، لەبەر ئەوەی بەڕێوەبردنی دەسەڵات بە شێوەیەکی هاوبەشە ، ڕۆڵی تاکەکەسی تیادا کز دەبێت و ڕەوشێکی ڕامیاری باشتر و زیاتر سەقامگیر دێتە ئاراوە ، جگە لەمە گەل سەرفرازە لە گۆڕینی

نوێنەرەکانی خۆی ، بۆی هەیە بە گوێرەی دەستوور و سیستەمی هەڵبژاردنی هەر وولاتەکەی بە شێوەیەکی بەردەوام دەسەڵاتداران بگۆڕێ ، ئەمەش وادەکات ململانێی پارتە ڕامیارییەکان زیاتر لە قازانجی گەلدا بێت ، بۆ ئەوەی ڕەزامەندی گەل بە دەست بێنن وتاکەکان دەنگیان بۆ بدەن . لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ ، کە ژیانی

دیموکراسی و هەڵبژاردن مامەڵەکردنە لەگەڵ هەست و هزری جەماوەردا ، بناغەی لێك حاڵی بوون دێتە کایەوە ، شێوازی قەناعەت پێ کردن و ڕۆڵی گفتوگۆ جێگای زەبروزەنگ و چاوو سورکردنەوە دەگرێتەوە ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا گەرەنتی سەربەستی بیروڕا دەربڕین و ڕافەی سیاسەتە لە لایەن هەموو مرۆڤێکەوە . ئەمەو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە گەلێك توێژو چین و بیرو باوەڕی جیاوازو بەیەکدا چوو پێك هاتووە. لەبەر ئەوەی یەك ئایدیۆلۆژی ، یان دەسەڵاتی چینێك بە زەبروزەنگ نەسەپێتە سەر بیرو بۆچوونی چین و توێژە جیا جیاکاندا ، دیموکراسی وەکو پێویستییەکی زۆر گرنگ دێتە کایەوە بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیانەی کە دێنە کایەوە لەبوارە جیا جیاکاندا .

ئەمەو لەبەر ئەوەی دیموکراسی بووەتە پێویستییەکی حەتمی و داواکاری سەرجەم گەلانی جیهانە ، تەنانەت ئەو دەسەڵاتدارانەی کە بڕوایان بە دیموکراسی نییە، ناچار بوون لە پەیڕەو پرۆگرامەکانیاندا باسی لێوە بکەن و ئەنجومەن و دەزگای ساختەو کارتۆنی دروست بکەن بۆ شاردنەوەی سیاسەتی دکتاتۆرییانەی خۆیان لە پاڵ ئەو دام و دەزگا کارتۆنیانەدا .

دیموکراسی لە ڕاستیدا بۆ مرۆڤی ئەم سەردەمە وەکو ئاو وهەواو نان وایە ؛

واتا دیموکراسی ژیانی ئەم سەردەمەیە ، لەبەر ئەوەی مرۆڤ کاتێك ئازاد دەبێ ، ئەو کاتەش بیرو هزری تەواو دەکەوێتە کارەوە ، پێشکەوتنی مرۆڤ سەر هەڵئەدا لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا. ئەگەر ئەمڕۆ سیستەمی ڕامیاری جیهانی هەڵسەنگێنین دەبینین وڵاتە دیموکراسییەکان زۆر پێشکەوتوو ترن لەو وڵاتانەی کە تا ئێستا سیستەمی دیموکراسی ڕاستەقینەیان تێدا بڵاو نەبووەتەوە،چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بێ، یان ئابووری و ڕامیاری و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ ، ئەمەش بە تەواوی سەلمێنەری ئەو بۆچوونەیە کە لە سەرەوە باسمان کرد. ئەگەر تەماشای دیرۆك بکەین دەبینین دیموکراسی هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێش چووە و توانیویەتی زۆر تەگەرەو کۆسپ و ئاستەنگ ببڕێ تا گەیشتووەتە ئەو ئاستەی ئێستا ، هەردەم ململانێی نێوان

خۆپەرستان و دکتاتۆرەکان و حاکمە تاك ڕەوەکان بووە بەرانبەر بە نوێ خوازو پێشکەوتوو خوازان و سەرجەم گەلانی جیهان .

ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەینەوە دەبینین دیموکراسی لە یۆنانەوە سەری هەڵداوە، هەندێ فەیلەسوفی ئەغریقی باسیان لێوەکردووە وەکو ئەفلاتۆن و ئەرستۆ. لە هەندێ شاری ئەو وولاتەش چەسپێنراوە وەکو شاری ئەسینا ، هەروەها لە ئمبراتۆریەتی ڕۆماندا لە سەردەمی کۆماری و سەرەتای میرنشینی ، دیموکراسی تێدا پەیرەوکراوە. بەڵام بە گەیشتنی قەیسەر بۆ حوکم لە ڕۆما، بووە بە هۆی لەناو بردنی هەرچی جۆرە چەسپاندنێکی دیموکراسی بۆ ماوەیەکی درێژ تا هاتنی سەدەی ( ١٦ ، ١٧ز)، دیسانەوە باسی لێوەکرا لە نوویسنەکانی فەیلەسوفەکان وەکو (جان جاك رۆسۆ ) ... ، کە پێیان داگرد لەسەر دەسەڵاتی گەل ، هەروەها کاتێ شۆڕشی فەرەنسا کرا لە ساڵی( ١٧٨٩ز ) هەموو پرانسییە دیموکراسییەکان پەسەند کراو دووپاتی ڕۆڵی گەل کرایەوە لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا .

بۆ زیاتر تیشك خستنەسەر سیستەمی دیموکراسی باسەکەم کردووە بەسێ بەستەوە، لە بەستی یەکەمدا باسی ڕەوایی دیموکراسی دەکەم ، لە بەستی دووەمدا باسی جۆرەکانی دیموکراسی دەکەم، بەستی سێیەمیشم تەرخان کردووە بۆ باسکردنی هەڵبژاردن.

## بەستی یەکەم

## ڕەوایی دیموکراسی ( الشرعية الديمقراطية )

چەند بۆچوونێك هەن دەربارەی ڕەوایی دیموکراسی لە سێ بۆچوون یان لە سێ چەمکدا کۆی دەکەینەوە :-

**چەمکی یەکەم :** لە لایەن جان جاك رۆسۆوە لە کتێبەکەیدا کە بەناوی ( گرێ بەستی کۆمەڵایەتییە) خراوەتە ڕوو، بە پێی بۆچوونی ڕۆسۆ گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە ، گەل خۆی نوێنەری خۆی هەڵدەبژێرێ و هەر تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ بەشداری لە دەسەڵات دەکات ، دەسەڵات ئەگەر خانوویەك بێت، ئەوە تاکەکانی کۆمەڵ بەردەکانی ئەو خانووەن، واتا بەیەك لەسەر یەك نانی بەردەکان خانووەکە دروست

دەبێت وەهەر بەردێك هۆکارێکە ، یان ئامرازێکە بۆ پێکەوەنانی خانووەکە، گریمان دەوڵەتێك لە (١٠٠٠٠٠٠ ) ملیۆنێك هاووڵاتی پێکهاتووە، ئەوە دەسەڵات لە یەك ملیۆن بەش پێك هاتووە ، هەر بەشێکی هی تاکێکە لە تاکەکان، ئەم بۆچوونە دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی ، کە دەبێ دەسەڵاتداران لە ڕێگای دەنگدانی گشتییەوە هەڵبژێردرێن لە لایەن هەموو تاکەکانەوە ، بە چاو پۆشین لە ڕەوشی ئابووری و خوێندەواری و ڕەگەزی دەنگدەران ، بەم جۆرە هەر دەسەڵاتێك لە ڕێگای دەنگدانی گشتی و دەنگی تاکەکانی کۆمەڵەوە نەهاتبێتە سەر دەسەڵات ، ئەوە دەسەڵاتێکی ناڕەوایە.

**چەمکی دووەم** : دەنگدانی گشتی ، واتا دەسەڵات دەبێ نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی گەل بکات ، ئەم بۆچوونەش بەرژەوەندی چینی بورژوای خستە مەترسییەوە، بۆیە ئەو چینە پرانسیپی سەروەری نەتەوەی ( سيادة الامة ) هێنایە کایەوە. بە پێی بۆچوونی ئەو چینە، نەتەوە کەسایەتییەکی دەستکردی جیاوازە لە کەسایەتی تاکەکانی کۆمەڵ و نەتەوە بۆی هەیە ئەو کەسانە دیاری بکات کە نوێنەرەکانی خۆیان هەڵبژێرن. لەڕاستیدا چینی بورژوای دەسەڵاتدار لە ڕێگای دانانی ئەو یاسایانەی کە بەرژەوەندییەکانی خۆی دەپاراست ، هەندێ مەرجی دادەنا ؛ بەپێی ئەو مەرجانە هەموو کەسێك نەیەتوانی بەشداری پرۆسەی دەنگدان بکات بۆ هەڵبژاردنی دەزگاکانی دەسەڵات لە دەوڵەتدا. بۆ نموونە، هەندێ لە یاساکانی هەڵبژاردن هەبوونی بڕێکی دیاری کراو لە سەروەتی دادەنا وەکو مەرجێك بۆ هەر کەسێك بۆ ئەوەی مافی دەنگدانی هەبێ و بتوانێ دەنگ بدات ، لە ڕاستیدا بەند کردنی مافی دەنگدان بە هەبوونی بڕێکی دیاری کراوی سەروەت ، کۆسپێکە لە بەردەم خەڵکی هەژارو نەداردا ، کە زۆربەی کۆمەڵ پێکدێنن و هەوڵێکە بۆ هێشتنەوەی دەسەڵات بە دەستی خەڵکی خاوەن سەرمایەو موڵك دارەکانەوە . هەندێ لە یاساکانی تری هەڵبژاردن مافی دەنگدانی دەدایە ئەو کەسانەی کە ڕێژمیەکی دیاری کراویان هەبوو لە خوێندەواری ؛ لە بەر ئەوەی ئەو کاتە هەموو کەسێك نەیەتوانی منداڵ بناتە بەر خوێندن لەبەر هۆیەکانی دارایی‌و خێزانی‌و نەبوونی پوڵ و پارە بۆ مەسروفاتی خوێندکار . بۆیە ئەوانەی کە خوێندەوار بوون زۆربەیان لە چینی دەوڵەمەندوو خاوەن سەرمایە بوون ، بەهەرحاڵ و بە پێشکەوتنی ڕەوتی دیموکراسی‌و

دەسەڵاتی گەل، بیری دەنگدانی گشتی وەکو ئەنجام چەسپاوو ئەمڕۆ لە زۆربەی وولاتاندا وەکو تیۆرو هەم وەکو پراکتیك دەنگدانی گشتی پەیڕەو دەکرێ بۆ دیاری کردنی دام و دەزگا دەسەڵاتدارەکان لە دەوڵەتدا .

چەمکی سێیەم : چەمکی سێیەم لەگەڵ گەشەکردن و بە دەسەڵات بوونی بیری مارکسی هاتە کایەوە ، بەپێی ئەم چەمکە ، دەسەڵات دەبێ نوێنەرایەتی چین و توێژی پرۆلیتاریا بکات ، دەبێ دەسەڵات هەڵقوڵاوی خەڵکی ڕەش و ڕووت و چەوساوە بێت . نابێ بوار بدرێتە هیچ کەسێ لەسەر مزینی خوێن و ژیانی خەڵکی ببێتە خاوەن سەرمایە ، چینی بورژوا دەبێ وردووخاش بکرێ ، لەبەر ئەوەی سەرمایەداران خەڵکی دەڕوتێننەوەو لەسەر ماندوو بوون و عەرەقی ناوچاوانی ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتە بوونەتە خاوەن سەرمایەو خۆیان لە خەڵکی جیا کردووەتەوە، بۆیە لە ناو بردنیان ئەرکێکی پێویستە. ئەمەو لە سۆڤیەتی جاران تا ساڵی ( ١٩٣٥ز ) چینی بورژوا بۆی نەبوو بەشداری لە دەنگدان بکات .

## بەستیدووەم :

## جۆرەکانی دیموکراسی

دیموکراسی دەبێ بە چەند جۆرێکەوە ، کە هەریەکە و خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە ، بۆیە پێویست دەکات باسی هەر جۆرێ لەو جۆرانە بکەین :

### یەکەم : دیموکراسی ڕاستەوخۆ: LaDemocratie directte[1]

دیموکراسی ڕاستەوخۆ ، واتا حوکمڕانی گەل بە خۆی بێ ئەنجامدانی هەڵبژاردن و نوێنەر هەڵبژاردن، ئەم جۆرە دیموکراسییە لەگەڵ بۆچوونەکانیفەیلەسوف ( جان جاك رۆسۆ )دا یەك دەگرێتەوە ، کە دەڵێ : سەروەری گەل بەوە دێتەکایەوە کە گەل خۆی حوکمی خۆی بکات و دەڵێ ئەگەر هاتوو گەل

---

(١)بڕوانە : د.محمد کامل لیلة ـ النظم السیاسیة ص٤٥٢.

نوێنەری لەجیاتی خۆی هەڵبژارد ئەوە ئەو نوێنەرانە تەنها بریکارن و گەل هەر سات و کاتێ بێ دەتوانێ لایان ببات . بۆ زیاتر روون کردنەوەی ئەم جۆرە دیموکراسییە، نموونەی شاری ئەسینا دێنینەوە . لە شاری ئەسینا مانگانە لە گۆڕەپانێکی گشتیدا نزیکەی ( ٢٠٠٠٠ ) کەس لە خەڵکی ئەو شارە کۆدەبوونەوەو دیالۆکیان لەسەر کاروباری شار دەکردوو بڕیاریان لەسەر دەدا، بەم کۆبوونەوەیانەیان دەگــوت ( کۆمەڵەی گەل) یان ( کۆمەڵەی گشتی ) .

بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی و بەدواداچوونەوەی ئەو بڕیارانەو بەڕێوەبردنی کاروباری شار ، کۆمەڵەی گشتی هەڵدەستا بە دیاری کردنی ( ٥٠٠ ) کەس بە گوێرەی قورعە بۆ بەڕێوەبردنی ئەو کاروبارانە ، کە لە ژێر چاودێری کۆمەڵەی گشتیدا بەڕێوەیان دەبرد .

ئەمەو ئەم جۆرە دیموکراسییە پەیڕەوکردنی دەگمەنە لە جیهاندا ، پەیڕەو ناکرێ تەنها لە هەندێ کانتۆنەکانی سویسرادا نەبێ وەکو ( کلاریس ، ئۆتترفالد ، ئبنزیل).

لە رووی تیۆریەوە ، ئەم سیستەمە لە هەموو سیستەمەکانی تر دیموکراسیترە ، بەڵام لە رووی پراکتیکەوە سیستەمێکە دەسەڵاتی کەمایەتی تێدا بەرجەستە دەبێ .

بۆ نموونە لە ئەسینا ، تەنها هاووڵاتیە سەربەستەکان بەشداری کۆمەڵەی گشتییان دەکرد، بۆ کۆیلەو ژن نەبوو بەشداری لە کۆبوونەوەکانی ئەو کۆمەڵەیەدا بکەن . هەروەها نەهاتن بۆئەو کۆبوونەوانە شتێکی ئاسایی بوو لەبەر ئەوەی هاتن بۆ کۆبوونەوەکان سەپێنراو نەبوو. مێژوونووسەکان ژمارەی ئەوانەی کە ئامادە دەبوون بۆ کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەی گشتی بە (٢٠٠٠٠ ) کەس دەخەمڵێنن ، کە ئەم ژمارەیەش کەمایەتییە لە چاو ژمارەی دانیشتوانی ئەوسای شاری ئەسینا. ئەمەو ئەم سیستەمە وەکو ووتمان لە هەندێ لە کانتۆنەکانی دەوڵەتی سویسرا پەیڕەو دەکرێ ( کلاریس ، ئۆتترفالد، ئبنزیل) کە بە هەموویانەوە ٣٪ ی ژمارەی دانیشتوانی سویسرا پێکناهێنن .لە ئەم کانتۆنانەدا هەموو ساڵێك جارێ ئەو پیاوانەی کە تەمەنیان لە بیست ساڵ زیاترە کۆدەبنەوەو دیالۆك لەسەر خشتەی کارەکان دەکەن کە پێشتر ئامادە کراوەو دەنگ دەدەن لەسەر ئەو پێشنیارانەی کە پەیوەندییان بە هەموار کردنەوەی دەستورەوە هەیە.

هەروەها دەنگ لەسەر پرۆژە یاساییەکان و بودجەو حساباتی کانتۆن دەدەن. ئەمەو ئەمرۆ کاروباری دەوڵەت بەربلاوو چڕوپڕە ، پێویستی بە دام و دەزگای خاوەن زانیاریوئەزموون هەیە ، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو کاروبارانە ، هەروەها جیاوازی چینایەتیو نەتەوەییو ڕێچکەیی لە زۆربەی وولاتەکانداو پان و فراوانی دەوڵەت چ لە ڕووی دانیشتووان و چ لە ڕووی ڕەوشی جوگرافیو دابشبوونی شارەکان و شوێن نشینەکانەوە و پان و بلاوی ڕووبەری زۆربەی وولاتەکانی ئەم سەردەمە و زۆری دانشتوانی وا دەکات کۆبوونەوەی هەموو خەڵکی ولات لە شوێن و کاتێکی دیاری کراودا بۆ بڕیاردانی کاروباری دەوڵەت شتێکی مەحاڵ بێت. بۆ نموونە بە گوێرەی دیموکراسی ڕاستەوخۆ دەبێ خەڵکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ساڵانە یان مانگانە یان وەرزانە، لە گۆڕەپانێکی گشتیدا کۆ ببنەوەو گفتوگۆ لەسەر ڕەوشی ڕامیاری و ئابووریو کۆمەڵایەتی وولات بکەنو بڕیاری لەسەر بدەن، بەلام کۆبوونەوەی ملیۆنەها کەسان لە شوێنێکداو لە یەك حاڵی بوونیان و بڕیار دانیان شتێکی مەحاڵەو لە ڕووی پراکتیکەوە بەدی نایەت .

## دووەم : دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ .

وەکو لە دیموکراسی ڕاستەوخۆدا باسمان کرد لەو جۆرە دیموکراسیەدا نوێنەر هەڵبژاردن نییە، واتا گەل نوێنەر هەڵنابژێ بۆ بەڕێوەبردنی دەسەلات. بەلام لە دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆدا، گەل نوێنەر هەڵدەبژێرێ بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری دەوڵەت و دەست والای ( مخول ) ئەو نوێنەرانە دەکات ، بەلام ئەم دەست والا کردنە ڕەها نییە، گەل مافی چاودێری و لێپرسینەوەی هەیە بەرانبەر نوێنەرەکان تا ئەو ڕادەیە کە ئەو نوێنەرانە لابدات و خەڵکی دیکەیان لە شوێن دانات .

دیاردەکانی دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ :-

دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ هەندێ دیاردەو خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە لەوانە[(١)] :

---

[(١)] بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٦٠.

١.**ڕیفراندۆم** ـ ڕیفراندۆم واتا زانینی ڕای ئەو هاووڵاتیانەی کە مافی دەنگدانیان هەیە سەبارەت بە دۆزێکی دیاری کراو پێش ئەوەی بە شێوەیەکی کۆتایی یەکلا بکرێتەوە .

ئەمەو ڕیفراندۆم چەند جۆرێکی هەیە :-

ـ ئەگەر هاتوو ڕیفڕاندۆم پەیوەندی بە دەستوورێکی تازەوە بوو یان پەیوەندی بە هەموارکردنەوەی دەستوورەوە هەبوو، واتا ئەگەر هاتوو ڕای هاووڵاتیان وەرگیرا دەربارەی دەستوورێکی تازە، یان هەموارکردنەوەی دەستوور ، ئەوە ئەو ڕیفراندۆمە دەستوورییە .

بەڵام ئەگەر ڕیفراندۆم پەیوەندی بە کاروباری ڕامیارییەوە هەبوو وەکو بەستنی بەڵێنکاری لە لایەن حکومەتەوە یان چونە ناو هەر هاوپەیمانییەکەوە، ئەوە ئەو ڕیفڕاندۆمە ڕامیارییە، بۆ نموونە ئەو ڕیفڕاندۆمەی کە لە سویسرا ئەنجام درا بۆچوونە ناو یەکێتی ئەوروپاوە لەساڵی ٢٠٠١( لە سەرەتای مانگی سێ ) .

ـ ئەمەو ڕیفرندۆم لەوەیە سەپێنراوبێت ( الزامی ) ، کەدەبێ حکومەت پێبەند بێ بە ئەنجامەکانییەوە، لەوەیشە ڕاوێژکارانە بێت ( استشاری ) ، واتا حکومەت بابەتێك دەخاتە ڕیفراندۆمەوە بۆ زانینی ڕای خەڵکی دەربارەی ئەو بابەتە .

ـ ڕیفراندۆم لەوەیە ووجوبی بێت، واتا دەستوور دەیسەپێنێتە سەر حکومەتدا، کە بابەتێك بخاتە ڕیفراندۆمەوە، واتا چەند بابەتێك و کردارێك هەن سەپێنراونەتە سەر حکومەتدا بەپێی دەستوور، کە دەبێ بیانخاتە ڕیفراندۆمەوە. لەوەیشە ڕیفراندۆم ئارەزوومەندانە بێت، واتا حکومەت بە ئارەزووی خۆی بابەتێك دەخاتە ڕیفراندۆمەوە بۆ زانینی ڕای هاووڵاتیان دەربارەی ئەو بابەتە.

ـ ڕیفراندۆم لەوەیە پێش وەختەبێ ، لەوەیشە پاش وەختەبێ .

ڕیفراندۆمی پێش وەختە ، ئەو ڕیفراندۆمەیە کە ئەنجام دەدرێ پێش ئەوەی بابەتێك یان شتێك بڕیاری لەسەر بدرێ ، بۆ نموونە ڕیفراندۆم لەسەر پرۆژەیەکی یاسایی پێش بڕیاردان لەسەری .

ڕیفراندۆمی پاش وەختە ، ئەو ڕیفراندۆمەیە کە پاش بڕیاردان لەسەر بابەتێ دەکرێ ، بۆ نموونە ڕیفراندۆم لەسەر پرۆژەیەکی یاسایی پاش بڕیاردان لەسەری .

٢. پێشنیاری گەلەی، میللی ( الاقتراح الشعبی )

سەرەڕای هەبوونی پەرلەمان ، کە کاری سەرەکی یاسادانانە ، گەل بۆی هەیە پرۆژە پێشنیار بکات، لەوەیە ئەو پرۆژانە پەیوەندییان هەبێ بە دەقێ لە دەقەکانی دەستوورەوە ، لێرەدا پێشنیاری گەلی دەستووری دەبێ . لەوەیە پەیوەندیشی هەبێ بەدانانی یاسایەکی تازەوە لە بابەتێکی دیاری کراودا، یان هەموارکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی یاسایەکی لە ئارادابوو ، ئەم جۆرە پێشنیارەش پێی دەڵێن پێشنیاری گەلی تەشریعی . ئەمەو پێشنیاری گەلی ڕەها نییە، بۆ نموونە دەستووری سویسرا مەرجی ئەوەی داناوە ، کە دەبێ هەر پێشنیارێك بخرێتە بەردەم پەرلەمانەوە ، ( ٥٠ ) هەزار کەس لە هاووڵاتیانی دەوڵەت لەوانەی کە مافی دەنگدانیان هەیە، واژۆی ئەو پێشنیارەیان کردبێ لە ماوەی شەش مانگدا .

**٣. بەرهەڵستکاری گەلی ، میللی ( الاعتراج الشعبی ) .**

وەکو دەزانین کاری سەرەکی پەرلەمان لە هەموو جیهاندا یاسادانانە ، بەڵام لە دیموکراسی نیمچە ڕاستەخۆدا ، گەل بۆی هەیە بەرهەڵستکاری یاسایەك بکات کە لە پەرلەمانەوە دەرچووە لە ماوەیەکی دیاری کراودا پاش دەرچوونی و دەبێ لە لایەن ڕێژەیەکی دیاری کراوەوە بێ لە هاووڵاتیان کە دەستوور دیاری دەکات. لەو ماوەیەدا ئەو یاسایە ڕادەوەستێ لە ڕووی جێبەجێ کردنەوە. پاش بەرهەڵستکاری یاساکە لە لایەن گەلەوە ، دەبێ پەرلەمان ئەو یاسایە بخاتە ڕیفراندۆمەوە ، ئەگەر گەل دەنگی بۆدا ئەوە جێبەجێ دەکرێ ، ئەگەر گەل ڕەتی کردەوە ، دەبێ چاوی پێدا بخشێنرێتەوە.

**٤. هەڵوەشاندنەوەی گەلەی ، میللی :-**

لە هەندێ کانتۆنەکانی دەوڵەتی سویسرا، هاووڵاتیان مافیان هەیە پەرلەمان هەڵوەشێننەوە. ئەم داواکردنەی گەلە بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان پەیوەستە بە لە ئارادابوونی پێشنیاری هەموارکردنەوەی دەستوور ، چ ئەو هەموارکردنەوەیە گشتی بێ

یان بەشی ، دەبێ ئەو داواکاریەش لە لایەن ژمارەیەکی دیاریکراوەوە پێشکەش بکرێت لەو هاووڵاتیانەی کە مافی دەنگدانیان هەیە. بۆ نموونە لە کانتۆنی بێرن ، دەبێ داواکاری هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان لە لایەن ( ١٢ ) هەزار کەسەوە واژۆ بکرێت هەروەها لە کانتۆنەکانی لویسرین و ئەرغۆفی و ترغۆفی ، دەبێ لە لایەن (٤) هەزار کەسەوە واژۆ بکرێت .

**٥.لادانی نوێنەر :** هەروەها ژمارەیەکی دیاری کراو لە هاووڵاتیان دەتوانن داوابکەن نوێنەرێك یان زیاتر لە نوێنەرێك لە پەرلەمان لا بدرێ . ئەو داواکارییە دەخرێتە ریفراندۆمەوە ، ئەگەر هاتوو زۆربەی دەنگدەرەکان دەنگیان بۆ داواکارییەکە دا، ئەوە دەبێ ئەو نوێنەرانە دەستکێشانەوە لە پەرلەمان پێشکەش بکەن، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەنجامی ریفراندۆمەکە لە قاوانجی داواکاریەکە نەبوو ، ئەوە ئەو نوێنەرە یان ئەو نوێنەرانە حیسابی ئەوەیان بۆ دەکرێ ، کە تازە هەڵبژێردرابێتنەوە .

**٦. لادانی سەرۆك کۆمار :**

بۆ ژمارەیەکی دیاری کراو لە هاووڵاتیان هەیە ، داوای لابردنی سەرۆك کۆمار بکەن پێش تەواوبوونی ماوەی حوکمەکەی. داواکاری لابردنی سەرۆك دەخرێتە بەردەم پەرلەمانەوە ، ئەگەر موافەقەی لەسەر کرد ، ئەوە دەخرێتە ریفراندۆمەوە ، ئەگەر زۆرینەی دەنگدەرەکان دەنگیان دا بۆ دواکارییەکە، ئەوە لەسەر سەرۆکە دەست کشانەوە لە کار پێشکەش بکات .

ـ دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ ، لەگەڵ ئەوەی کە گەل ڕۆڵێکی بنەڕەتی و دیموکراسیانە دەبینێ لە هەڵبژاردن و بەڕێوەبردن و چاودێری کردنی دەسەڵات، بەڵام پەیڕەوکردنی شتێکی ئاسان نییە بە تایبەت لەو وولاتانەی کە گەل تیایاندا لە ڕووی هۆشیاری ڕامیارییەوە لاوازە، واتا جێبەجێکردنی پێویستی بە هۆشیاری ڕامیاری و زانیاری دەربارەی کاروباری دەوڵەت هەیە لە لایەن جەماوەرەوە. هەروەها جێبەجێکردنی دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ پێویستی بە سەقامگیری ڕەوشی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی لە دەوڵەتدا هەیە، ئەگینا جێبەجێکردنی دەبێتە هۆی شڵەژاوی زیاترو تێکچوونی ڕەوشی دەوڵەت. جا لەبەر ئەم هۆیانە پەیڕەوکردنی

ئەم جۆرە دیموکراسییە لەسەردەمی ئەمڕۆدا نییە، تەنها لە دەوڵەتی سویسراو هەندێ ولایەتەکانی ئەمریکادا نەبێ. تەنانەت هەندێ دیاردەشی تەنها لە هەندێ کانتۆنەکانی سویسرا پەیڕەو دەکرێ. لەگەڵ ئەوشدا لە سویسرا هەندێ ڕەخنە لە ئارادایە، بۆ نموونە (پێشنیاری گەلی) کە یەکێکە لە دیاردەکانی دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ ، بووە بەهۆی دانانی ماددەیەك لە دەستووری ئوسترالیا کە ماددەیەکە زۆر دوورە لە کرۆك و ناوەڕۆکی بابەتی دەستوورییەوە، ئەو ماددەیەش دیاری کردنی چۆنیەتی سەربڕینی مانگایە لە سەربڕین خانەکاندا. ئەم ماددەیە بە هۆی پێشنیاری گەلەوە بوو بە ماددەیەکیدەستووری هەرچەندە دوورە لە گیان و کرۆکی ڕیاسا دەستوورییەکانەوە.

### سێیەم : دیموکراسی نوێنەرایەتی .

دیموکراسی نوێنەرایەتی، واتا گەل نوێنەری خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراوو، بۆی هەیە پاش ئەو ماوە دیاری کراوە جارێکی دیکە ئەو نوێنەرانە هەڵبژێردرێتەوە، یان بەلایان بنات و خەڵکی دیکە هەڵبژێرێتەوە . تائیرە نزیکییەکی زۆر لە نێوان دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆو دیموکراسی نوێنەرایەتیدا هەیە، بەڵام هەندێ جیاوازی هەیە لە نێوانیاندا، بۆ نموونە ڕیفراندۆم و هەڵوەشاندنەوەی گەلی و پێشنیاری گەلی تایبەتمەندی دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆن ولە دیموکراسی نوێنەرایەتیدا نین ، واتا دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆ قۆناغێکی پێشکەوتووترە لە دیموکراسی نوێنەرایەتی ، بەڵام پەیڕەوکردنی پێویستی بە سەقامگیری وڵات و هۆشیاری خەڵکی ئەو وڵاتە هەیە. بۆیە لە تواناداا نییە لە هەر جێگاو شوێنێ پەیڕەو بکرێ. دیموکراسی نوێنەرایەتی، واتا هەبوونی ئەو نوێنەرانەی کە خەڵك هەڵی بژاردوون، واتا هەبوونی پەرلەمان . پەرلەمان لە چەند قۆناغێکدا لە ئنگلتەراوە سەری هەڵدا [1] . میر لەو وڵاتەدا دەسەڵاتی ڕەهای بەدەست بوو ، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو

---

[1] بڕوانە : د. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٧٢.

دەسەڵاتە ، پەنای دەبردە بەر هەندێ خەڵکی شارەزاوو دەم سپی و پیاوانی ئایینی ، بۆ ئەوەی ڕاوێژکارییان بکات سەبارەت بە کاروباری حکومڕانی .

لەگەڵ ڕۆژدا ئەم گروپە ئەنجومەنێکیان پێك هێنا کە پێی دەڵێن ئەنجومەنی گەورە ، ئەم ئەنجومەنە گەشەی کردوو پەرەی سەند ، تا ساڵی ( ١٢١٥ز ) ، بەڵگەنامەیەك مۆر کرا لە نێوان میر جۆن و ئەنجومەنی گەورە ، پاش ڕووبەڕووبونەوەیەك لە نێوان هەردوو لادا . بە گوێرەی ئەم بەڵگەنامەیە ئەنجومەنی گەورە توانی ڕۆڵی خۆی گەورەتر بکات و میر ناچاربکات ڕاوێژکاری و ڕۆڵی ئەنجومەنی گەورە قەبوڵ بکات لە کاروبارە گشتییەکاندا، بەتایبەت ئەو کاروبارانەی پەیوەندییان بە یاساکانی باجەوە هەبوو . ئەم بارودۆخە تا ساڵی( ١٢٦٥ز ) بەردەوام بوو تا میر داوای کرد لە هەر شارێکی ئینگلیزی دوو نوێنەر هەڵبژێرن بۆ بەشداری کردن لە ئەنجومەنی گەورە و هەمان ماف و دەستڕۆییان هەبێت کە ئەندامانی ئەنجومەنی گەورە هەیانە . بەڵام ئەندامانی ئەنجومەنی گەورە قایل نەبوون لەگەڵ نوێنەری شارەکاندا لە یەك ئەنجومەندا پێکەوە دانیشن، لەبەر ئەوە نوێنەری شارەکان ئەنجومەنێکیان بۆ خۆیان سازداوو لە ساڵی ( ١٣٥١ز ) دەستیان بە کاری خۆیان کردوو لە ساڵی( ١٧٧٧ز ) سەرۆکێکیان هەڵبژارد، کە لە بەردەم میردا لە جێگای ئەوان قسە بکات. لێرەدا پەرلەمانی ئینگلیزی بوو بە دوو ئەنجومەن :(ئەنجومەنی لۆردەکان) و ( ئەنجومەنی گشتی ) . بەڵام ئەنجومەنی گشتی هەڵبژێردراو لە لایەن خەڵکەوە توانیەی خۆی بەسەر گۆڕەپانەکەدا بسەپێنێ و ئەنجومەنی لۆردەکان بکاتە ئەنجومەنێکی کارتۆنی بێ دەسەڵات .

هەر لە ساڵی( ١٩١١ز ) وە دەسەڵاتی یاسا دانان کەوتە دەست ئەنجومەنی گشتیو ئەنجومەنی لۆردەکان دەست ڕۆیشتووی ئەوەی پێ درا کە لە ماوەی دوو ساڵدا قایل بێت لەسەر ئەو پرۆژە یاسایانەی کە ئەنجومەنی گشتی دایان دەنات . ئەگینا جێبەجێ دەکرێن پاش ئەو ماوەیە .

لە ساڵی( ١٩٤٩ز ) ئەو دوو ساڵە کرا بە یەك ساڵ . ئەمەو ئەنجومەنی لۆردەکان بووە ئەنجومەنێکی ( فخری ) کە ئەندامەکانی ئێستا پێك هاتوون لەو کەسانەی کە

خزمەتی بەرچاویان هەبووە لە بوارە جیاجیاكانی پێشكەوتنی وولاتدا جگە لەو ئەندامانەی كە بە وەرەسە دەبنە ئەندام و لە توێژی شازادەكان و دەم سپیانن .

## بەستی سێیەم : هەڵبژاردن

## یەكەم : پێناسەی هەڵبژاردن

هەڵبژاردن ، واتا دیاری كردنی دەسەڵاتداران لەلایەن ئەو هاووڵاتیانەوە كە مەرجی یاسایان تێدایە .

## دووەم : سروشتی هەڵبژاردن ـ چییەتی هەڵبژاردن ( طبيعة الانتخاب ).[1]

**١. هەڵبژادن مافە :** ئەم بۆچوونە لە بیرۆكەی سەروەری گەلەوە سەرچاوەی گرتووە ، كە جان جاك رۆسۆ بانگەشەی بۆ كردووە ، جان جاك رۆسۆ ووتویەتی گەل خاوەنی ئەو سەروەرییەیە كەپێك هاتەی ویستەكانی هەموو تاكەكانی كۆمەڵە ، كە هەر یەكەو بەشێك لە سەروەری پێك دێنێ ، بە گوێرەی ئەم بۆچوونە هەریەكەو بەشێك لەو سەروەرییە پێك دێنێ ، بە گوێرەی ئەم بۆچوونە هەڵبژاردن مافە، هەڵبژاردن مافێكی كەسینەیە ( حق شخصى ) ، واتا هەموو تاكێك ، هەموو هاووڵاتیەك مەرجی تێدا بێ لە ڕووی تەمەنەوە ، مافی هەیە بەشداری هەڵبژاردن بكات بێ ئەوەی هیچ كۆسپێكی بخرێتە بەر . هەروەها بۆی هەیە ئەم مافە بەكار نەهێنێ و بەشداری دەنگدان نەكات ، چونكە وەكو ووتمان هەڵبژاردن مافێكی كەسینەیە .

**٢ـ هەڵبژاردن وەزیفەیەكی كۆمەڵایەتییە ( الانتخاب وظيفه اجتماعيه) .**

ئەم بۆچوونە لە بیرۆكەی سەروەری نەتەوەوە سەری هەڵداوە . بەگوێرەی ئەم بۆچوونە سەروەری گەل ( السياده الشعبيه ) لە تاكەكانی كۆمەڵەوە سەری هەڵنەداوە ( سەرچاوەی نەگرتووە ) ، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ كەسایەتییەكی دەستكرد ( نەتەوە ) ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ، دەنگدانی هاووڵاتیان دەنگدانێكە لە جیاتی نەتەوە وەكو وەزیفەیەك . دەنگ دان و بەشداری كردن لە هەڵبژاردن بۆ هەموو تاكێك نییە لە

---

[1] بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦١٩.

کۆمەڵدا ، تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە دەسەڵات ڕێگایان پێ دەدات بە گوێرەی دەستوورو ئەو یاسایانەی کە هەل و مەرجی بەشدار بوون لە هەڵبژاردندا دیاری دەکەن . هەروەها بە گوێرەی ئەم بنچینەیە، یاسا دەتوانێ توێژێکی زۆر لە کۆمەڵ لە مافی دەنگدان دوور بخاتەوە ، ئەمەو دەسەڵات دەتوانێ بە زۆرە ملێ خەڵك بەرەو دەنـگ دان ڕاپێچ بکات ، ئەوەش لە وەخت و کاتێکدا ئەگەر بەرژەوەندی نەتەوە پێویستی بەوە کرد . جێبەجێ کردنی ئەم بۆچوونە دەبێتە هۆی دوور خستنەوەی توێژێکـی زۆر لـە هاووڵاتیـان ، واتـا دوور خستـنەوەی بنچینـەی دەنـگ دانـی گشتـی ( مبـدأ الآقـتراع ) هـەر لەبـەر ئـەم هۆیەش پاش شۆڕشی فەرنسا ئەم بۆچوونە هاتە کایەوە لە لایەن چینی بـورژواوە . بـۆ نموونـە ساڵی ( ١٨١٧ز ) لە فەرەنسا ژمارەی دانیشتوانی (٣٠) ملیـۆن کـەس دەبـوون ، لـە کاتێکدا ژمارەی ئەوانەی کە دەنگیاندا لە (١٢٠٠٠٠) کەس تێپەڕی نەدەکرد .

## سێیەم : هەڵبژاردن لە جێبەجێ کردندا

### ١. پێ بەند کردنی هەڵبژاردن :

#### أ. پێ بەند کردنی دەنگدانی گشتی :[1]

دەنگدان لە بناغـەوە وەکو بنچینـەیـەکی گشتی ، دەبێ گشتی بێ ، واتـا بـۆ هـەموو کەسێ هـەبێ دەنـگ بـدات ، بەمـەرجێ تەمـەنێکی دیاری کـراوی تـەواو کردبـێ . بـەڵام هـەندێ جـار بەهۆی چەند تەگەریەکەوە دەبێتە دەنگدانی گەمارۆدراو ، یەکێ لەو کۆسپانە :

پەیوەندی بـە ( جنسَ )وە هەیـە. ڕێژەیـەکی زۆر لـەو وولاتانـەی کـە هـەڵبژاردنی تێدا دەکرێ ، لە سەرەتای دەست پێ کردن و هاتنەکایـەوەی پرۆسیسی هـەڵبژاردن لـەو وولاتانەدا، ژن مافی دەنگدانی پێ نـەدرابوو ، ئەو مافە تـەنها بۆ پیاو بـوو . بـە ڕای مـن ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێڕوانینـە نێگەتیڤانـەی کـە بەرانبـەر ژن وەرگیرابوو لـەو چەرخە مێژووییانەی کە بۆ گەیشتن بـە دەسـەڵات و پاراستنی دەسـەڵات پێویستی بـە پیاو بوو ، لەم چەرخانـەدا هـەندێ جار ئـافرەت بەتایبـەت ئـافرەتی سلك پـرو خاوەن

---

(١)بڕوانە : د. منذر الشاوي ـ نظرية الدولة ص١٠٧-١١٤.

منداڵ ، نەك هەر ڕۆڵێكی ئایەتییان نەبوو، بەڵكو دەبوونە كێشەو كۆسپ و تەگەرە بۆ پیاو سەرباری ڕووبەڕووبونەوەی كێشە سەرەكییەكانیان، هەروەها بوارنەدان بە ژن بۆ بەشداری كردن لە دەنگدان دەگەڕێتەوە بۆ تێڕوانینی پیاوان كە گوایە ژن تەنها بۆ خزمەت كردنی ماڵ و خێزان بەكار دێت[٢] ، كاروبارە گشتی و ڕامیاریەكانیش تایبەتن بۆ پیاو. بێگومان ئەم بۆچوونەی پیاوانیش دەربارەی ژن بۆ ئەوەیە بتوانن باڵا دەستی خۆیان بەسەر ژندا بپارێزن . لەو ڕیفراندۆمانەی كە لە سویسرا ئەنجام دراوون دەربارەی دانی مافی دەنگ دان بە ژن دەرگەوتووە، كە زۆربەی ئەوانەی دانی ئەو مافەیان پرۆتستۆ (بەرهەڵستكاری ) كردووە پیاوان بوونە . هەروەها هەندێ دیاردەی لەم بابەتانەش لە بواری ئابووریشدا لە ئارادابوون .

بەڵام بە پێشكەوتنی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و زیادبوونی كارو ئەركی دەسەڵات بەهۆی زیادبوونی بوارەكانی ژیان چ لە ڕووی بەرگرییەوە بێ، چ ئابووری، كۆمەڵایەتی، ڕامیاری ... هەروەها پێشكەوتنی تەكنیك و ئامێری كارو پێشكەوتن لە هەموو بوارەكانی تردا وای كرد كە ئافرەت بەشدارییەكی كاریگەر بكات لە هەموو بوارەكاندا ، تەنانەت لەو بوارانەشدا كە تەنها پیاو بەهی خۆی دەزانی. ئەمانە هەموو بوونە هۆی ئەوەی ، كە مافی ئەوە بدرێتە ژن بەشداری هەڵبژاردن بكاو لەو ڕووەوە هیچ جیاوازییەكی نەبێ لەگەڵ پیاودا. لێرەدا پێویستە بڵێین وولایەتی ( Wyoming ) لە وولایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا ساڵی( ١٨٩٠ز ) یەكەم جاربوو مافی دەنگدانی دا بەژن ، هەروها ساڵی(١٩٢٠ز ) ئەم مافە بۆ ژن هەموو وولایەتە یەكگرتووەكانی گرتەوە، لە ئنگلتەرا ساڵی( ١٩٢٨ز )، لە فەرەنسا ساڵی (١٩٤٤) ژن مافی دەنگدانیپێدرا، لە سویسرا لەسەر ئاستی دەوڵەتی فیدرالی ساڵی( ١٩٧٣ز ) ، بەڵام لە كانتۆنەكان پێشتر .[١]

هەروەها ڕەگەز لەوەیە ببێتە هۆیەك لە هۆكانی كۆسپ خستنە سەر دەنگدانی گشتی . هەر لەسەر ئەم بناغەیە لە ئەڵمانیاكەی هتلەردا ، یەهوود بۆی نەبوو

---

(٢)بڕوانە : د.محمد كامل ليلة ـ النظم السياسية ص ٦٣٢

(١) بڕوانە : د.علي غالب العاني ـ الانظمة السياسية ص٣٦.

بەشداری لە هەڵبژاردن بکا. دەوڵەتی باشوری ئەفریقیا یەکێك بوو لەو وولاتانەی کە ڕەش پێستەکان مافی دەنگدانیان تێیاندا نەبووە.

هەروەها تەمەن یەکێکە لەو کۆسپانەی کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم دەنگدانی گشتیدا . نابێ مندالان بەشداریٔ پرۆسیسێکی گرنگی وەك هەڵبژاردن بکەن ، لەبەر ئەوەی تەمەنیان ڕێگای ئەوەیان پێ نادات .

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە : ئایا چەند ساڵ تەمەن ، یان تەمەنی چەند ساڵە، سنووری جیاکەرەوەیە لە نێوان دەنگدان و دەنگ نەدان دا ؟

بۆ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە دەڵێین : یاساکانی هەڵبژاردن جیاوازە لە دیاری کردنی تەمەنی دەنگداندا. ئەو یاسا هەڵبژاردنانەی کە دەسەلاتێکی ئورۆستۆکراتی یان بورژوازی یان پارێزگار شێوە دەریان دەکەن ، تەمەنی هەڵبژاردن یان با بڵێین تەمەنی دەنگ دان بەرز دەکەنەوە لەبەر ئەوەی ئەوکەسانەی بەتەمەنن زیاتر حەز لە سەقامگیری و ئارامی و میان ڕەوی دەکەن بەوجۆرە گەنجەکان لە دەنگدان دوو دەخەنەوە ، لەبەر ئەوەی گەنجەکان زیاتر پاڵپشتی لە لایەنە شۆڕشگێڕەکان دەکەن و حەز لە گۆڕان و شتی نوێ دەکەن، هەر لەبەر ئەو هۆیانەشە ئەو یاسایانەی کە پەیوەندییان بە هەڵبژاردنەوە هەیەو دەسەلاتە چەپڕەوەکان و شۆڕشگێڕەکان و پێشکەوتن خوازەکان دەریان دەکەن تەمەنی دەنگدان کەم دەکەنەوە. ئەمەو بەتەمەنی دەنگدان دەڵێن تەمەنی پێگەیشتووی ڕامیاری (سن الرشد السياسي). هەرلەبەر ئەم هۆیانەی کە لەسەرەوە باسمان کرد دەستووری ساڵی( ١٨١٤ز ) ی میرنشینی فەرەنسا ، تەمەنی (٣٠ ) ی ساڵی دیاری کردووە وەکو مەرجێك کە پێویست بوو بۆ هەر کەسێك بگاتە ئەو تەمەنە تا بتوانێ بەشداری لە هەڵبژاردن بکات . بەلام دەبینین ئەو سیستەمە ڕامیارییانەی کە زیاتر پێشکەتووخواز بوون تەمەنی پێکەیشتووی ڕامیارییان بە ( ٢٥ ) ساڵ دیاری کردووە ( دەستووری فەرەنسا( ١٧٩١ز ، ١٨٣٠ز )

هەروەها دەستووری فەرەنسا ساڵی ( ١٧٩٣ ، ١٨٤٨ ز ) بە ( ٢١) ساڵ دیاری کردووە.(١) هەروەها هەندێ لە یاساکانی هەڵبژاردن تەمەنی پێگەیشتووی ڕامیارییان بە(١٨) ساڵ دیاری کردووە ، لەوانە دەستوورەکانی ( ١٩٥٦ز ) میسری ، ( ١٩٦٧ز ) عێراقی ، ( ١٩٩٢ز) هەرێمی فیدراڵ. ئەو کەسانەی کە تاوانێك دەکەن ، دادگا بە هۆی ئەو تاوانانەوە تاوانباریان دەکات ، ئەو کەسانە بەشداری لە هەڵبژاردن ناکەن لەبەر ئەوەی ڕێزیان لە دەست دەدەن ، لێرەدا ناتوانین بڵێین ئەم حاڵەتە پێبەند کردنی دەنگدانی گشتییە بە واتایەکی وورد . بەڵام ئەگەر هاتوو تۆمەتبارکردنی ئەوتاوانبارەی کە ڕیزی لەدەست دەدات ئامانجێکی ڕامیاری لە دواوە بوو ، لەومیە ببێتەحاڵەتێك لە حاڵەتەکانی پێبەندکردنی دەنگدانی گشتی .

هەروەها بێبەش کردنی تاکەکانی هێزی سەربازی لە دەنگدان حاڵەتێکە لە حاڵەتەکانی پێبەندکردنی دەنگدانی گشتی. پاساو بۆ ئەم پێبەندیەش ئەوەیە، بەشداری بوونی هێزی سەربازی دەبێتە هۆی لە دەست دانی بێگەردی هەڵبژاردن بە هۆی ئەو گوشارەی کە دەکەوێتە سەر سەربازەکان لە لایەن سەردارەکانیانەوە. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەوە بەشدار بوونی هێزی سەربازی لە هەڵبژاردن دەبێتە هۆی ئەوەی سیاسەت بخزێتە ناو هێزی سەربازیەوە، ئەو حاڵەتەش دەبێتە هۆی لە دەست دانی زەبتی سەربازی و کار لە توانای هێزی سەربازی دەکات. بۆ وەڵام دانەوەی ئەم دوو پاساوە هەندێك دەڵێن ، ئەگەر چی پاساوی یەکەم لەومیە تاڕادەیەك ڕاست بێت بەنسبەت ئەو وولاتانەی لە ڕووی ڕامیارییەوە دواکەوتوون و ئاستی دیموکراسی تیایاندا پێشکەوتوو نییە. بەڵام پاساوی دووەم بەرگەی بیروڕا گۆڕینەوەی جدی ناگرێ، چونکە دوور خستنەوەی هێزی سەربازی دەبێتە هۆی دانانی تاکەکانی ئەو هێزە بە هاووڵاتی نمرە دوو ، هەروەها دەبێتە هۆی دوور خستنەوەی تەمەنی دەنگ دانیان ، بۆ نموونە ئەگەر یاسای هەڵبژاردن ( ١٨ ) ساڵی دیاری کردبێ بۆ هەر کەسێك کەبیەوێ

---

(١) بڕوانە : د.محمد كامل ليلة ـ النظم السياسية ص ٦٢٥.

دەنگ بدات لەوەیە بە هۆی خزمەتی سەربازییەوە ئەو مافەی لێ زەوت بکرێتەوە، تا ماوەی سەربازییەکەی تەواو دەبێت، ئەو کاتە دەتوانێ دەنگ بدات ، لەوکاتەشدا تەمەنی لە (١٨) ساڵ تێپەڕ دەکات ئەمەش دواخستنێکە هیچپاساوێکی بۆ نییە .

هەروەها حاڵەتێکی دیکە لە حاڵەتەکانی پێبەندکردنی دەنگدانی گشتی دەنگدانی گەمارۆ دراوە ، دەنگدانی گەمارۆ دراوە؛ واتا بەستنی مافی دەنگدان بە مەرجی هەبوونی سەروەت و پوڵ و پارەو ڕێژەیەکی دیاری کراو لە خوێندەواری . چینی ئۆروستۆکراتی هەوڵی دا خەڵکێکی زۆر لە هەڵبژاردن دوور بخاتەوە[1] ، بەتایبەت چینی بورژوا ، ئەوەش لە ڕێگای دانانی مافی دەنگدان تەنها بەو کەسانەی کە خاوەن موڵکە نەگیۆزراوەکان بوون ، کە خاوەن زەوی و زار بوون و پاڵپشتی چینی ئۆروستۆکراتی بوون ، ئەم حاڵەتەش لە مێژووی فەرەنسا بەرچاوو دەکەوێ کاتێ شارلی دەیەم ساڵی (١٨٣٠ز ) ڕێو ڕەسمێکی دەرکرد، تیایدا هاتووە دەڵێ : ((ئەو باجەی کە خاوەن پیشەسازییەکان دەیدەن بەس نییە بۆ بەشداری کردن لە هەڵبژاردن )) بەو جۆرەش ئەو ڕێو ڕەسمە زۆربەی تاکەکانی چینی بورژوای دوور خستەوە لە پرۆسەی هەڵبژاردن و دەنگدان ، دەرکردنی ئەو ڕێو ڕەسمەش بووە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ساڵی (١٩٣٠ز ) ، کە لەڕاستیدا لە لایەن چینی بورژواوە بەرپا بوو بۆ ڕوخاندنی چینی ئۆروستۆکراتی .

هەروەها چینی بورژوایش کاتێ دەسەڵاتی بە دەست گرت بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی پەنای بردە بەر گەمارۆدانی مافی دەنگدان و ئەو مافەی دا بە ئەو کەسانەی کە بەرژەوەندی چینی بورژوایان دەپاراست و دەنگیان بۆی دەدا ، ئەو کەسانەی مافی دەنگدانیان هەبوو وبەشداری پرۆسەی دەنگدانیان دەکرد ئەو کەسانە بوون کە ڕێژەیەکی دیاری کراوو باجیان دەدا ، باجیش ئەو کەسانە دەیاندا کە بازرگان و خاوەن پرۆژە پیشەسازییەکان و خاوەن پیشە سەربەستەکان بوون. هەروەها هەندێ یاساکانی هەڵبژاردن مافی دەنگدانیان داوە بەو کەسانەی کە ڕادەیەکی گونجاو خوێندەوارییان

---

(٢) بڕوانە : د. منذر الشاوي ـ نظرية الدولة ص١٠٣-١٠٦.

هەیە، بەڵام ئەو مەرجەش پەیوەندی بە ماڵ و پارەوە هەیە، بۆ نموونە لە سەدەی نۆزدەیەمی ئەورووپادا ئەوەی ڕادەیەکی گونجاو خوێندەواری هەبووایە ، ئەوە دەبووایە خاوەن پارەو سەروەت بووایە، خەڵکی هەژارو نەدار نەیەتوانی بخوێنێ ، ئەم پێبەندەییە لە ئیتالیا پەیڕەو دەکرا تا ساڵی(١٩١٢ز) .[1] هەروەها تا ئێستاش پەیڕەو دەکرێ لە پورتغال و شیلی و فلپین .

ئەمەو پاساوی گەمارۆدانی دەنگدان بۆ ئەو کەسانەی کە دەبێ خاوەن سەروەت و ماڵ بن یان خوێندەوار بن ، ئەوەیە کە گوایە ئەوانەی خاوەن پوڵو پارەو سەروەتن ، هەر ئەوانە ئەرکە گشتییەکان و قورسای بڕیارەکانی دەسەڵاتدارانیان دەکەوێتە ئەستۆ.

هەروەها ئەوانە زیاتر پەیوەستن بە وولاتەکەیانەوە بۆیە ڕاستی خوازی (العدالە ) وا پێویست دەکات هەر ئەوان دەسەڵاتداران هەڵبژێرن . هەروەها خوێندەوارەکان هۆشیارن و زیاتر تێ دەگەن لە کاروبارە گشتییەکانی دەوڵەت، بۆیە پێویست دەکات ئەوان دەسەڵاتداران هەڵبژێرن .

بەڵام وەڵامی ئەم پاساوانە ئەوەیە :

پەیوەیست بوون بە وولاتەوە، تەنها هەبوونی سەروەت و پوڵو پارە دروستیناکات ، بەڵکو زیاتر یەکێتی ڕەگەز ، زمان ،ئایین ، هەرێم ،

یەکێتی بیرەوەرییەکان و یەکێتی ئامانجە هاوبەشەکان دیاری دەکات و دەیسەپێنێ .

بە تەجروبەش دەرکەوتووە ، کە لە کاتی تەنگانەو داگیرکاریدا ، هەر ئەو کەسانە قوربانی دەدەن و پەیوەستن بە دەوڵەتەوە ، کە هەژارو نەدارو بێ پوڵ و پارەن ، بە پێچەوانەوە خاوەن سەرمایەو دەوڵەمەندەکان ، بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان لەگەڵ هەر دەسەڵاتێکدا حوکمیان بکات دەگونجێن . ئەمەو بەنسبەت بەشداری خوێندەوارەکان لە پرۆسەی دەنگداندا ، ئەوە دەڵێین :

ئەگەر نەخوێندەوارەکان بەشداری هەڵبژاردن و پرۆسەی دەنگدان بکەن ئەوە ئەوانیش لەگەڵ ڕۆژدا فێری سیاسەت دەبن و تێ دەگەن بەرژەوەندی گشتی و

(١) بڕوانە: د.علي غالب العاني ـ الانظمة السياسية ص٣٧.

بەرژەوەندی باڵای دەوڵەت لە چیدایەو زیاتر بە تەنگیەوە دەبن و پەرۆشی دەبن ، هەروەها ئەو مەرجەش زیاتر مەترسیدار دەبێ ئەگەر ڕێژەی نەخوێنەوارەکان لە دەوڵەتدا زۆر بن .

لە کۆتایدا دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە هەندێ مەرج هەن پێویستن دابنرێن لە پرۆسەی هەڵبژاردندا لەوانە [١]:

- تەمەن : دەبێ تەمەنی هاووڵاتی بۆ ئەوەی بتوانێ دەنگ بدات بەلای کەمەوە بگاتە تەمەنی پێگەیشتووی شارستانی ( سن الرشد المدني ) .

- پێناسە : هەموو یاساکانی هەڵبژاردن جەختیان لەسەر ئەوە کردوە ، کە دەبێ هەموو دەنگدەرەکان هاووڵاتی دەوڵەت بن ، نابێ بێگانە بەشداری پرۆسەی دەنگدان بکات ، تەنانەت زۆربەی یاساکانی هەڵبژاردن بۆ بەشداری کردنی ئەو بێگانەیانەی کە پێناسەی دەوڵەتیان وەرگرتووە ، مەرجی ئەوەیان داناوە کە دەبێ پێنج یان دە ساڵ تێپەڕی کردبێ بەسەر وەرگرتنی پێناسە لە لایەن بێگانەکانەوە تا بتوانن بەشداری لە پرۆسەی دەگدان بکەن .

- لێ هاتوویی عەقلی ( الأهلية العقلية )

هەموو یاساکانی هەڵبژاردن جەختیان لەسەر ئەوە کردووە کە دەبێ ئەوەی بەشداری لە پرۆسەی دەنگدان دەکات ، دەبێ شێت (مجنون) وێت (معتوه ) نەبێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم مەرجە نەقۆزرێتەوە بۆ مەرامی ڕامیاری پێویست دەکات شێتی یان وێتی سەلمێنراوو بێ بەپێی حوکمێکی دادگەیی (حكم قضائي ) .

ب : پێبەندکردنی سەربەستی پاڵاوتن ( خۆکاندیدکردن ) : -

لە بەر ئەوەی نوێنەرانی میللەت دەبێ هەوڵ و کۆششی ڕاست و دروست بدەن بۆ بەدی هێنانی ئەو ئامانجانەی کە لە پێناویدا هەڵبژێردراون ، هەروەها دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی میللەتیان دەکەوێتە دەست ، لە بەر ئەوەی دەسەڵاتدار چارەنووسی میللەتی بەدەستە ، هەندێ پێ بەندی دانراون بۆ ڕێگا گرتن لە خۆپاڵاوتن ، ئەو

---

(١) بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٣٨-٤٠.

پێبەندکردنانەش لە بەرژەوەندی گشتی دان ، کە هەندێکیان یاسایین و هەندێکی دیکەشیان پراکتیکین (فعلی)، پاساوی پێبەندییە یاساییەکان هەندێ جار دەگەڕێتەوە بۆ پاراستنی ڕێچکەی دیموکراسی و هەندێ جاری دیکەش ئەو پێبەندییانە پاساوی عەمەلی خۆیان هەیە. ئەوپێبەندیانەی کە یاساکانی هەڵبژاردن باسیان دەکەن دەکەن بۆ پاراستنی ڕێچکەی دیموکراسی و پێویستە بۆ پاراستنی مانەوەی ڕەوشی دیموکراسی و سەقامگیر بوونی هەڵبژاردنی دەسەڵات لە لایەن میللەتەوە لە ڕێگای دوورخستنەوەی هەندێ کەس یان چەند کەسێك یان هەندێگروپ .کە ئەگەر بێتوو لە هەڵبژاردن بەشدار ی بکەن ، یان دەربچن لەوەیە زیان بە ڕێچکەی دیموکراسی بگەیەنن و ڕەوشی رامیاری لە بەرژەوەندی خۆیان یان ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی هەیانە بقۆزنەوە بۆ نموونە:

قەدەغەکردنی خۆ پاڵاوتن لە لایەن قائیمقام و بەڕێوەبەری پۆلیس و سەرکردە سەربازییەکانەوە، هەروەها دادوەر و دەستەی پشکنین و دەستەی چاودێری هەڵبژاردن لەو ناوچانەی کە وەزیفەی تێدا دەبینن ، لە بەر ئەوەی ئەم جۆرە کەسانە لەوانەیە گوشار بخەنە سەر دەنگ دەران بە هۆی وەزیفەکانیانەوە .

هەروەها قەدەغەکردنی ئەو کەسانەی کە دەبنە هۆی مەترسی بۆ سەر دیموکراسی لە کاتی دەرچوونیان لە هەڵبژادن بۆ نموونە ، قەدەغەکردنی خێزانەکانی بۆرپون و بۆناپارت لە فەرەنسا بۆ پاڵاوتنی خۆیان ، جگە لەمانە بە بۆچوونی من ئەو پارتانەی ، یان ئەو کەسانەی بە ئاشکرا و بە زەقی دژایەتی دیموکراسی و هەڵبژاردن دەکەن ، قەدەغە بکرێن لە خۆپاڵاوتن بۆ هەڵبژاردن ، زیاد لەوەش مۆڵەتی کارکردنیشیان لێوەربگیرێتەوە ، لە بەر ئەوەی دوژمنی دیموکراسین. هەروەها لە ئەو وڵاتانەی کە هەڵبژاردنی تێدا دەکرێ بێگومان کەسانێك هەن لە بناغەوە خەڵکی ئەو وڵاتە نین و تازە پێناسەی ئەو وڵاتەیان هەڵگرتوە، لێرەدا ئەم کەسانە پێویستیان بەماوەی چەند ساڵێك دەبێت تاپێبەست بن بە خاك و خەڵکی ئەو وڵاتەوە و هەست و سۆزیان بۆی بجوڵێت. جا لە بەر ئەم هۆیانە یاساکانی هەڵبژاردن ڕێ نادەنە ئەو کەسانە دەنگ بدەن یان خۆیان بۆ پاڵاوتن ناونووس بکەن و لەم پێناوەدا هەندێ مەرج دادەنێن ، بۆ نموونە: زۆر لە یاساکانی هەڵبژاردن مەرجی ئەوەیان داناوە بۆ بێگانە کە دەبێ ماوەی

پێنج ساڵ تێپەرێت لە دەرکردنی پێناسە بۆ دەنگ دەر تا بتوانێت دەنگ بدات و بەشداری هەڵبژاردن بکات، بەڵام بۆ خۆپاڵاوتن دەبێ ئەوماوەیە دە ساڵ بێت . پێویستە لێرەدا باسی ئەوەبکەین، کە هەندێ یاسا هەیە بە هیچ جۆری بواری ئەو کەسانە نادات کە لە بناغەوە خەڵکی ئەو وڵاتە نیین و پێناسەی ئەو وڵاتەیان دەرکردوە خۆیان کاندید بکەن . لەو یاسایانە ، یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نەتەوە ( قانون أنتخاب مجلس الأمة) ژمارە (٧ ) لە ساڵی( ١٩٦٧ز ) کە لە ماددەی (٢٠ ) برگەی ( أ ) دەڵێت : ((ئەو کەسەی دەیەوێت خۆی بۆ پالاوتن ناونووس بکات دەبێ لە دایك و باوکێکی عێراقی بێ ))؛ واتا ئەگەر دایك و باوکی عێراقی نەبن ناتوانێ بەشداری هەڵبژاردن بکا وەك پاڵێوراوێك .

لە خۆپالاوتن بۆ هەڵبژاردن پێبەندییەك هەیە پەیوەندی بە تەمەنەوە هەیە، هەرچەندە ئەم پێبەندییە لە دەنگدانیشدا هەیە ،بەڵام ئەو تەمەنەی کە مەرجە بۆ خۆپاڵاوتن دەبێ زیاتر بێ لە ئەو تەمەنەی کە دیاریکراوە بۆ دەنگدەر، لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی کە پاڵێوراوە داوای ئەوە دەکات بەشداری بکات لە بەرێوەبردنی دەسەڵات لە رێگای دەرچوونی بە هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنە نوێنەرایەتییەکان، بۆ نموونە لە عێراق(یاسای هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی نەتەوەیی) ژمارە ٧ ی ساڵی( ١٩٦٨ز ) لە ماددەی (٢) برگەی ( ج ) داوا دەکات . پاڵێوراو دەبێ لای کەم تەمەنی (٣٠ ) ساڵ بێت ، بەڵام بۆ دەنگ دەر تەنها دەبێ (٢٠ ) ساڵی تەواوکردبێ .هەروەها یاسای ژمارە (١)ی ساڵی (١٩٩٢)ی کوردستانی عێراق لە ماددەی (٢٠) تەمەنی (١٨) ساڵی دیاری کردووە بۆ دەنگ دەر ، لە کاتێکدا برگەی دوو لە ماددەی(٢١)ی هەمان یاسا تەمەنی (٣٠) ساڵی دیاری کردووە بۆ پاڵێوراو بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی کەندید بکات بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی[1] هەروەها لەو پێبەندیانەی کە دانراون بۆ پاڵێوراو. پێبەند کردنە بە هۆی رەوشتەوە ، بۆ نموونە هەندێ یاساکانی هەڵبژاردن قەدەغەی

---

(١) بروانە : بەدران ئەحمەد حەبیب ـ هەڵبژاردنەکانی کوردستان ، چاپی یەکەم ،(١٩٩٨)، ل١٨٦.

خۆپاڵاوتنیان کردوە لەو کەسانەی کە کوشتنی بە ئەنقەست و دزیان کردووە ، هەروەها بازرگانی مایە پووچ (مفلس) بۆی نییە خۆی بۆ پاڵاوتن ناونووس بکا ئەگەر ڕێزی ( اعتبار ) بۆ نەگێڕدرابێتەوە .

هەروەها پوڵ و پارە پێ بەندییەکیتری عەمەلییە کە ڕێگا دەگرێ لە خۆ پاڵاوتن ، واتا ئەو کەسەی دەیەوێ بەشداری هەڵبژاردن بکا وەکو پاڵێوراوێك دەبێ بڕێك پارە دابنێ ، ئەو بڕە پارەیە لە دەست بدات ئەگەر ڕێژەیەکی دیاری کراوی نەهێنا لە دەنگەکان، ئەم پێبەندییە پاساوی بەوە دەدرێتەوە ، کە دەبێتە هۆی دوور خستنەوەی ئەو کەسانەی کە جدی نین لە خۆ پاڵاوتن. هەندێ بیر و بۆچوون هەن دەڵێن : ئەم پێبەندییە بۆ ئەوەیەکە نوێنەرانی چینی هەژار و زەحمەتکێش دوور بخرێنەوە لە خۆپاڵاوتن . بەڵام بە بۆچوونی ئێمە ئەم پێبەندییە لەو کاتە ئەم ئامانجە دەپێکێ ، کە بڕی پارەکە زۆربێ ، بەڵام ئەگەر ئەو بڕە پارەیە کەم بوو بە شێوەیەك کە بارگرانی نەخستە سەر ئەو کەسانەی کە خۆیان بۆ پاڵاوتن ناونووس دەکەن، ئەو کاتە ئەم پێبەندیە ئەو ئامانجە ناپێکێ .ئەمانەی کە لە سەرەوە باسمان کرد پەیوەندی بە پێبەندییە یاساییەکانەوە هەیە .

جگە لە ئەمە وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد پێ بەندی پراکتیکی (فعلی) هەیە لە سەر سەربەستی خۆپالاوتن ، شتێکی ئاساییە ئەگەر بڵێین ئەم پێبەندی یە دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی پارتە سیاسییەکان ، واتا هەبوونی حاڵەتی فرە پارتایەتی ، یان دوو پارت، زیاتر ئەم کۆسپە کاتێك دێتە کایەوە، کە لە دەوڵەتدا ، پارتەکان ڕەگ و ڕیشەیان داکوتابێ ، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە دەڵێین پاڵێوراو دەبێ یەکێ لە پارتەکانی بەشدار لە هەڵبژاردندا بیناسێنێ بە جەماوەر ، ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوەوە بێ هیوای دەرچوونی زۆر کەم دەبێت و حاڵەتی لەو جۆرە دەگمەنە ، بەم جۆرە ئەمەش بە کۆسپێك دەژمێردرێ، کە پاڵێوراو هیوای دەرچوونی نەبێت لە هەڵبژاردندا ئەگەر بە تەنها و بێ پاڵپشتی پارتێکی ڕامیاری بەشداری هەڵبژاردن بکات . ئەم پێبەندییە هەرچەندە لە ڕووی تیۆرییەوە ڕاستە بەڵام وەکو مامۆستا مۆریس دفرجیە دەڵێ: بێبایەخە لە ڕووی عەمەلیەوە، هەروەها دەڵی ((هەڵبژاردنی پاڵێوراوەکان لە لایەن

پارتەکانەوە چارەسەرێکی نموونەیی نییە بەڵکو لە شێوازەکانیتر باشترە، ئەگەر وانەبێ ئەوا فراکسیۆنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان، دەم سپییە کلاسیکییەکان، پروپاگەندەی دەوڵەت ، پروپاگەندەی سەرمایەدارەکان جێگەی پارتە ڕامیارییەکان دەگرنەوە، دیموکراسیش لە مەدا هیچی پێنابرێت )) ، هەروەها مامۆستا مۆریس لە دوایی قسەکانیدا دەڵێ (( لە ڕاستیدا دیموکراسی نیە بێهەبوونی پارتە سیاسیەکان)).

بە بیرو بۆچوونی من ئەم کۆسپە پراکتیکییە، کە باسمان کرد زیاتر سوود بە خشە ، لە بەر ئەوەی ئەو نوێنەرانەی کە لە هەڵبژاردن دەردەچن لە ڕێگای پارتە ڕامیارییەکانەوە، ئەگەر خۆیانیش مرۆڤی لێهاتوونەبن ، ئەوا ڕێنمایی و ئامۆژگاری دەکرێن لە لایەن پارتەکانیانەوە . هەموومان دەزانین پارتی ڕامیاریش بێ ئایدۆلۆژیا و پرۆگرام نابێ ؛ بەڵام ئەو نوێنەرەی کە بە پێچەوانەی ئەوەی کە باسمان کرد هەڵبژێردرابێت لەوەیە خۆی لێهاتوو بێت ، بەڵام هەرچۆن بێ ئاستی پارتێکی نییە لە ڕووی هەبوونی پرۆگرامەوە ، ئەگەر لێ هاتوو ڕۆشنبیریش نەبوو ئەوە نەهامەتییەکی گەورەترە .

## ٢. ڕێگرتن لە بنچینەی یەکسانی لە هەڵبژاردندا ( الحد من مبدء المساواة في الانتخابات ) :

وەکو دەزانین کاتێ دەسەڵات لە لایەن جەماوەرەوە ببێتە خاوەن دەسەڵات ، ئەوە دەگەیەنێ کە تاکەکانی کۆمەڵ ئەو دەسەڵاتەیان پێکەوە ناوە ، بەلام وەك بنچینەیەکی گشتی دەبێ هەرتاکێك ، کەسێك لە کۆمەڵ ، یەکسان بێ لەو بەشەی کە هەیەتی لە دیاری کردنی دەسەڵات لە گەڵ بەشی هەر تاکێکی تری کۆمەڵ کە بەشداری دەکات لە هەڵبژاردن ، بەڵام ئەم بنچینەیە لەوەیە هەندێ تەگەرەی بێتە ڕێ . لەو کۆسپ و تەگەرانەی کە دەبنە هۆی ڕێگرتن لەم بنچینەیە :

### ـ دەنگدانی ناڕاستەوخۆ :

واتا دەنگدەر ڕاستەوخۆ دەنگ بە پاڵێوراوەکانی نادات بەڵکو دەنگ بەدەنگدەری نمرە دوو دەدات ( دەنگدەری لاوەکی ) بۆ ئەوەی ئەوان پاڵێوراوەکان هەڵبژێرن ، بۆ نموونە شاری ( س) دەنگ بۆ ( أ . ب . ج .د) دەدات ، بۆ ئەوەی ئەوان

پالێوراوەکانیان بۆ هەڵبژێرن ؛ واتا لێرەدا دوو هەڵبژاردن دەکرێ ، یەکێ بۆ هەڵبژاردنی دەنگدەرە لاوەکییەکان ، هەڵبژاردنی دووەمیش بۆ هەڵبژاردنی پالێوراوەکان لە لایەن دەنگدەرە لاوەکییەکانەوە. ئەمەو مەرج نییە دەنگدانی هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆ بەدوو قۆناغ بێت ، لەوەیە بە سێ، یان چوار قۆناغ بکرێت . بۆ نموونە دەنگ دەرەکان لە هەڵبژاردنی یەکەمدا دەنگ بۆ ( أ . ب . ج . د )دەدەن، ( أ . ب . ج . د ) یش لە هەڵبژاردنی دووەمدا دەنگ بۆ ( س .ص .ح ) دەدەن ، ( س. ص . ح ) یش دەنگ بە پالێوراوەکان دەدەن .

هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆ کە پێشێلییەکی بنچینەی یەکسانییە لە دەست نیشان کردن ( خرق مبدء المساواة في الاختيار ) دوو نایەتی پێوەیە : یەکەمیان ڕۆڵی دەنگدەر گەمارۆ دەدا لە چوارچێوەی سنورێکی تەنگتردا ، ئەگەر بەراوردمان کرد لە گەڵ هەڵبژاردنی ڕاستە وخۆدا ، دووەمیان ئامرازێکە بۆ تەگەرە خستنە بەردەم بنچینەی دەنگدانی گشتی بە تایبەت ئەگەر لە دەنگدەرە لاوەکییەکاندا ڕادەی ڕۆشنبیری و توانای دارایی مەرجێك بێت بۆ خۆ پالاوتن وەك دەنگ دەری لاوەکی (نائب ثانوي ) .

**ب ـ دەنگدانی نایەکسان :**

وەکو بنچینەیەکی گشتی دەبێ هەریەکێ لە دەنگ دەرەکان یەکسان بن لە گەڵ هەر دەنگدەرێکی دیکە لە ڕووی ژمارەی ئەو دەنگانەوە کەدەیدەن . نابێ یەکێ دەنگێکی هەبێت و یەکێکی دیکە دوو دەنگ . هەڵبژاردنی نایەکسان چەند جۆرێك لە خۆ دەگرێ ، یەکێ لەو جۆرانە ئەوەیە هەندێ لە دەنگ دەرەکان مافی ئەوەیان هەبێ لە چەند ناوچەیەکی هەڵبژاردن دەنگ بدەن ؛ بۆ نموونە دەنگدەرێك مافی ئەوی هەبێ دەنگ لەو ناوچەیە بدات کە خانووەکەی تێدایە و لەو ناوچە هەڵبژاردنەی کە جێگای کاری بازرگانی کردنێتی ، هەروەها لەو زانکۆیەی لێی دەرچووە ، لەکاتێکدا دەنگدەرێکی تر کە دەرچووی زانکۆ نەبێت ، یان جێگای بازرگانی نەبێت تەنها یەك دەنگ دەدات لەو ناوچەیەی کە خانووەکەی تیادایە . ئەم حاڵەتە پێی دەڵێن شێوازی فرە دەنگدان یان دەنگدانی فرە( تعدد الاصوات) . هەروەها هەندێ یاساکانی هەڵبژاردن ڕەوشی دارایی

دەکەنە پێوەر ، بە گوێرەی ئەو ڕەوشە هەندێ دەنگدەرەکان مافی ئەوەیان هەیە زیاتر لە یەك دەنگ بدەن ، یان هەرکەسێك خاوەن منداڵی وورده بۆی هەیە بە گوێرەی منداڵەوورده‌کانی دەنگی زیاتر بدات ، یان بەرانبەر بەوەی کەمنداڵی ووردی هەیە دەنگێکی زیادە بدات جگە لە دەنگەکەی خۆی . پاساوی ئەم وەبەرییەی خاوەن خێزان وا دراوەتەوە کە گوایە ، کەسانی خاوەن خێزان بەرپرسیاری زیاتریان دەکەوێتە ئەستۆ، لە بیروباوەڕیشدا زیاتر نەرم و نیانن و عەقلانی ترن لە کەسانی زوگرد . بەلام ئەم بیرو بۆچوونانە هەر چۆنێك بێت لە بەرژەوەندی پارتە ڕاست ڕەوە پارێزگارەکان و پاشڤەڕۆیەکاندایە ( رجعی )،
چونکە کەسانی خاوەن خێزان بە پلەی یەك دەنگ بۆ نان و سەقامگیری ڕەوشی ژیان دەدەن. هەروەها هەندێ لە ڕەخنەگران دەڵێن ئەگەر لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە تەماشای بابەتەکە بکەین، دەبێ بڵێین ڕۆڵی زانایەکی زوگرد لە ڕۆڵی خاوەن خێزانێکی ڕاهاتوو لە سەر خواردنەوەو خواردنی مادده بێهۆشکەرەکان باشترە .

**ج ـ دیاری کردنی نایەکسانی ناوچەکانی هەڵبژاردن :**

بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن پێویست دەکات وولات دابەشبکرێت بۆ چەند ناوچەیەك، کە زۆر جار دابەش دەکرێت بە گوێرەی یەکانە کارگێڕییەکان (الوحدات الاداریة ). ئەم ناوچانەش پێیان دەگوترێت ناوچەکانی هەڵبژاردن ، یان بازنەکانی هەڵبژاردن. بەلام هەندێ جار ناوچەکانی هەڵبژاردن بە شێوەیەکی یەکسان دیاری ناکرێن ، ئەمەش دووجۆر دەگرێتە خۆی ، بۆ ڕوونکردنەوەی جۆی یەکەم ئەم نموونەیە دەخەینەڕوو :

گریمان ناوچەی هەڵبژاردنی ( أ ) بریتییە لە ( ٤٠٠٠٠ ) دەنگ دەر ، ناوچەی هەڵبژاردنی ( ب ) بریتی یە لە (٢٠٠٠٠) دەنگ دەر . لە هەریەکە و لە ناوچەکانی ( ا ، ب ) یەك پاڵێوراو هەڵدەبژێردرێ ، ئەمەش بەواتای ئەوەیە هەر دوو ناوچەکانی هەڵبژاردن ( أ ) ، ( ب ) هەمان قورسایی ڕامیارییان هەیە... ( ٤٠٠٠٠ ) دەنگدەر یەك پاڵێوراو پشتیوانییان لێدەکات و ( ٢٠٠٠٠) دەنگدەریش یەك پاڵێوراو پاڵپشتییان لێدەکات . ئەمەش پێشێلییەکی زەقی بنچینەی یەکسانییە لە نوێنەرایەتیدا (المساواة في التمثيل ) .

ئەم شێوەیەش لە هەڵبژاردن لە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکادا بەدی دەکرێ ، هەر ولایەتێك لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوو نوێنەری لێ هەڵدەبژێردرێ بۆ ئەو ئەنجومەنە، هەرچەندە ئەو ولایەتانە وەکو یەك نین لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانیانەوە.

جۆری دووەم دیاریکردنی ناوچەکانی هەڵبژاردنە بە شێوەیەکی دەستکرد ، ئەم حاڵەتەش لەو ناوچانە ڕوو دەدات کە نزیکن لە یەکترەوە لە ڕووی جوگرافیەوە، جگە لەوەی کە دەبێ جیاوازییەکی بەرچاویان هەبێ لە ڕووی لایەنگریانەوە بۆ پارتەکان . ئەمەو ئەم جۆرە دەستکاریەیە لە سیستەمی زۆرینەدا ئەنجامی خۆی دەپێکێ، لە بەر ئەوەی ئەو دەنگانەی دراوون بۆ ئەو پارتانەی کە زۆرینەیان بەدەس نەهێناوە بێبایەخ دەمێننەوە . بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی جۆری دووەم ( دیاری کردنی ناوچەکانی هەڵبژاردن بە شێوەیەکی دەست کرد ) ئەم نموونەیە دەخەینە ڕوو :

| | ناوچە ا | ناوچەی – ب – |
|---|---|---|
| پارتی ڕاست ڕەو | ٤٠٠٠٠دەنگ | ٢٥٠٠٠ دەنگ |
| پارتی چەپ ڕەو | ٢٠٠٠٠ دەنگ | ٣٠٠٠٠ دەنگ |

دەبینین ئەنجامی هەڵبژاردن بە پێی ئەو خشتەیەی سەرەوە لە ناوچەی (ا ) پارتی ڕاست ڕەو سەرکەوتووە، لە ناوچەی ( ب) پارتی چەپ ڕەو سەرکەوتووە .

لێرەدا دەستکاری هەردوو ناوچەکانی هەڵبژاردن ( ا ، ب) بە شێوەیە دەکرێ ، هەندێ گەڕەکەکانی ناوچەی ( ا ) دەخرێتە سەر ناوچەی ( ب) بە تایبەت ئەو گەڕەکانەی کە دەنگی پارتی ڕاست ڕەویان زۆر تێدایە بۆ ئەوەی لە ناوچەی ( ب ) تای تەرازوو بەلای پارتی ڕاست ڕەودا شۆڕببێتەوە ، هەروەها هەندێ گەڕەکی ناوچەی ( ب) دەخرێتە سەر ناوچەی ( ا ) زیاتر ئەو گەڕەکانەی کە زۆرترین دەنگی پارتی چەپ ڕەویان تێدایە. پاش ئەو دەستکاری کردنە ڕێژەی دەنگاکان دەگۆڕێ بە گوێرەی ئەم خشتەی خوارەوە :

| | ناوچەی ( أ ) | ناوچەی (ب ) |
|---|---|---|
| پارتی ڕاست ڕەو | ٣٠٠٠٠ دەنگ | ٣٥٠٠٠ دەنگ |
| پارتی چەپ ڕەو | ٢٦٠٠٠ دەنگ | ٢٤٠٠٠ دەنگ |

لێرەدا دەستکاری ناوچەکانی هەڵبژاردن وای کرد (١٠٠٠٠) دەنگی پارتی ڕاستڕەو لە ناوچەی ( أ )ەوە بچێ بۆ ناوچەی ( ب ) لە هەمانکاتدا (٦٠٠٠) دەنگی پارتی چەپڕەو لە ناوچەی(ب)ەوە چووە بۆ ناوچەی ( أ ) ، بەم دەستکاریەش پارتی ڕاستڕەو توانیویەتی لە هەردوو ناوچەکانی هەڵبژاردن(أ) و (ب) سەربکەوێ .

ئەم دەستکاری و دیاری کردنەی ناوچەکانی هەڵبژاردن بە شێوەیەکی دروست کراو لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پێی دەڵێن جیرماندەر ( Gerrymander) ئەم ناوەش لە ناوی حاکمی وولایەتی ماسۆسۆسیتی ( Gerry) یەوە هاتووە . کە لەهەڵبژاردنی ئەنجومەنی پیراندا لە ساڵی ( ١٨١٢ز ) هەڵسا بە دابەشکردنی ناوچەکانی هەڵبژاردن بە شێوەیەکی دەستکرد . ئەمە و ناپلیونی سێیەم لە فەرەنسا پەنای بردە بەر هەمان شێوە ، ئەمەش وای لە کۆماری فەرەنسایی سێیەم کرد ناوچەکانی هەڵبژاردن بە یەکە کارگێڕییەکان دیاری بکات کە دەستکاری نێوان سنورەکانیان شتێکی ئاسان نییە.

### ٣.کارکردن لە سەر هەڵبژاردن ( التاثیر علی الانتخاب ):

ئەنجامی هەر هەڵبژاردنێك دەبێ بە گوێرەی ئەو دەنگانە بێ کە دراوون ، بەڵام ئەو ئەنجامە هەندێ جار دەست کاری تێدا دەکرێ بە جۆرێك لە گەڵ ڕای دەنگ دەران یەك ناگرێتەوە. چونکە بەرژەوەندی هەندێ لایەن لە گەڵ ئەو ئەنجامەدا یەك ناگرنەوە ، کارتێکردن و شێواندنی هەڵبژاردن دەگۆڕێت لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر و لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر ، ئەوەش بە گوێرەی ڕەوشی ڕۆشنبیری و ڕامیاری و کۆمەلایەتی . بۆ نموونە هەندێ جار ئەنجامی هەڵبژاردن دەشێوێنرێ لە ناوچەیەکی هەڵبژاردندا لە ڕێگای فرێدانی پسوڵەی زیادەوە بۆ ناو سندوقەکان زیاتر لە ژمارەی دەنگدەران لەو

ناوچەیەی هەڵبژاردندا ، هەروەها پسوڵەی زیادە دەخرێتە ناو ئەو سندوقانەوە بەناوی کەسانێکەوە کە مردوون ، یان هەر نین و خەیاڵین ، یان ئەنجامی ساختە جاڕ دەدن بە پێچەوانەی ڕاستی ئەو دەنگانەی کە خراونەتە ناو سندوقەکانی دەنگدانەوە .

ئەمەو ساختەکاری لە هەڵبژاردندا هەرچەندە گۆڕاوە لە ڕووی ئامرازەوەو لە ڕووی شێوازەوە بە هۆی چاودێری جەماوەر و لایەنە ڕامیارییەکانەوە، هەروەها بەشداربوونیان لە بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن و ژماردنی دەنگەکان و جاڕدانی ئەنجامەکەی .لە گەڵ ئەمانەشدا کارتێکردن لە سەر هەڵبژاردن هەر ماوە و زیاتر لەم شێوازانەدا بە دیار دەکەوێت : -

- گوشار : بۆ کارکردن لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و بەدەست هێنانی ئەنجامێکی ساختە ، کە بەپێچەوانەی ئیرادەی دەنگدەرەکانەوە بێ ، هەندێ جار پەنا دەبرێتە بەر گوشار ، گوشار لەوەیە بکەوێتە سەر پاڵێوراو لەوەیە بکەوێتەسەر دەنگ دەر ، لێرەوە پێویستە ئەوە بخەینەڕوو ،کە گوشار لە کاتێکدا دەبێ کە ململانێ لە نێوان چەند پاڵێوراوێکدا هەبێ لە ناوچەیەکی هەڵبژاردندا ؛ بەڵام ئەگەر یەك پاڵێوراو هەبێت ئەوە ئەو کاتە گوشار نابێت ، چونکە ئەوە هەڵبژاردن نییە، بەڵکو ( بەیعەیە ) ( Plebiscite) هەر وەکو مامۆستا مۆریس دفرچیە دەڵێت: (( لە حاڵەتێکدا ئەگەر چەند پاڵێوراوێك هەبن یان چەند پاڵێوراوێك لە ململانێدابن لەسەر یەك کورسی نوێنەرایەتی، ئەو کاتە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن ڕۆڵێکی زۆر دەبینی و کار دەکاتە سەر هەڵبژاردن ، ئەو کەسانەی یان ئەو پارتانەی ، کە ئامێری پڕوپاگەندەی باشیان بە دەستەوە هەبێ ، ئەوە دەتوانن کار بکەنە سەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکان )) .

لەو وولاتانەی دان بە بوونی نەیارەکاندا دەنێن و بڕوایان بە دیموکراسی نییە یان بە کەم و کورتییەوە جێبەجێی دەکەن ، ئەوە بواری نەیارەکان نادەن پڕوپاگەندە بۆ خۆیان بکەن ، وەکو قەدەغە کردنی کۆبوونەوەو داکوتانی جاڕنامە و بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەکان و ڕۆژنامەکان .

ئەمە لە کاتێکدا خۆیان هەموو شتێك لەم جۆرانە بەکاردێنن ، بەڵام ئەو وولاتانەی کە لە ڕووی دیموکراسییەوە پێشکەوتوون هەوڵی ئەوەیان داوە بواری نەیارەکان بدەن

بۆ کۆبوونەوەو بەکار هێنانی رۆژنامە و ئامێری دیکەی راگەیاندن . هەروەها پارە کاردەکاتە سەر هەڵبژاردن ، هاوکێشی نێوان پاڵێوراوەکان تێك دەدات و دەیانخاتە قازانجی پاڵێوراوە دەوڵەمەندەکانەوە، یان ئەو کەسانەی ئابوورییەکی باش لە پشتیانەوەیە ، هەر لە بەر ئەوەش هەندێ لە سیستەمە رامیارییەکان هەوڵیان داوە کارتێکردنی پوڵ و پارە کەم بکەنەوە لە سەر هەڵبژاردن، لەو پێناوەدا چەند هەنگاوێکیان ناوە وەکو دابەشکردنی خەرجی پروپاگەندەی هەڵبژاردن بە سەر پاڵێوراوەکاندا بەیەکسانی ، یان هەلگرتنی ئەو ئەرکە لە لایەن دەوڵەتەوە، دیاریکردنی شوێنی تایبەت لە چەند جێگایەکی دیاری کراودا بۆ ئەوەی پارتەکان بە یەکسانی ئەو جێگایانە بەکار بهێنن بۆ هەڵواسینی ئەو شتانەی پەیوەندییان بە پروپاگەندەی هەڵبژاردنەوە هەیە ، یەکسانی لە دابەشکردنی هۆڵە گشتییەکان بۆ بەکارهێنانیان بۆ کۆبوونەوەی گشتی ، گرنتیکردنی یەکسانی لە بەکارهێنانی رادیۆ و تەلەفزیون ( فەرەنسا ) ،یان دیاری کردنی خەرجی هەڵبژاردن بە شێوەیەك کە نابێ هیچ پارتێك سووانەی ( سقف ) دیاری کراو رەت بدات و ئەمەش دەکەوێتە ژێر چاودێرییەوە (ئینگلتەرا ).

بەلام لە گەڵ ئەمانەشدا دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەمرۆ پروپاگەندەی هەڵبژاردن پێویستی بە پارەیەکی زۆر هەیە ، ئەمەو هەرچەندە کاربکرێت لە پێناو دابین کردنی یەکسانی، ئەو کارانە بەشێوەیەکی رەها سەرناگرن و یەکسانی دەشێوێندرێت (وەکو هەڵسانی هەندێ پاڵێوراو بە گواستنەوەی خەڵکی بە خۆرایی، یان ئاهەنگ کردن و پێشکەش کردنی خواردن .......) .

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین هەرچەندە هەوڵ و کۆشش هەیە بۆ بەدی هێنانی یەکسانی لە نێوان پاڵێوراوەکاندا، بەلام کارتێکردنی سەرمایە هەردەمێنی لە سەر هەڵبژاردن. بۆ نموونە مارك غرین کە لە هەڵبژاردنی مانگی (١١)ی (٢٠٠١) سەرکەوتنی بە دەست هێنا و بووە سەرۆکی شارەوانی نیویۆرك لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (٥٠)ملیۆن دولاری بۆ پروپاگەندەی هەڵبژاردن سەرف کرد لە پارەی خۆی ، لە کاتێکدا رکەبەرەکی لە پارتی دیموکراتی (١٥)ملیۆن دولاری سەرف کرد بۆ هەمان مەبەست.

ئەوەی کە باسمان کرد گوشار بوو لە سەر پاڵێورا و ، بەڵام گوشار لەسەر دەنگ دەر لە ڕووی شێوە و ئامراز و جۆرەوە دەگۆڕێت ، بە هۆی ڕەوش و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیارییەوە، بۆ نموونە لەو وڵاتانەی کە بیروبۆچوونی ئایینی تیایاندا زاڵە، پیاوانی ئایینی ڕۆڵێکی زۆر دەبینن بۆ گوشار خستنەسەر دەنگدەر، لەو وڵاتانە ( ئیسپانیا، ئەمریکای لاتین ، باشوری ئیتالیا، زۆربەی زۆری وڵاتە ئیسلامی‌یەکان ) هەروەها گوشاری خاوەن کارگەکان لە سەر کرێکارەکان بۆ ئەوەی دەنگ لە قازانجی ئەوان بدەن ، بەتایبەت لەو وڵاتانەی کە سەندیکاو شورای بەهێز و سەربەستیان تێدا نییە، کرێکارەکان دەترسن لە دەرکردن و کەم کردنەوەی کرێ ئەگەر دەنگ بە گوێرەی ئارەزووی ئەوان نەدەن .

ئەمە و لە دەوڵەتە دکتاتۆرییەکاندا تۆقاندنی پۆلیس بەکار دەهێنرێت بۆ گوشار خستنە سەر دەنگدەران بۆ ئەوەی دەنگ لە قازانجی دەستەی دەسەڵاتداران بدەن .

ب : دەنگدانی ئاشکرا :

وەکو پرانسیپێکی بنچینەیی دەنگ دان دەبێ نهێنی بێ، بەڵام هەندێ جار دەنگ دان بە ئاشکرا دەکرێت .

لە ڕاستی‌دا هەرچی بیانووەیەك بۆ دەنگدانی ئاشکرا بهێنرێتەوە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ بەدەست هێنانی دەنگەکان لە قازانجی لایەنێکی دیاری کراو. ئەمەو دەنگ دانی ئاشکرا لەوەیە ڕاستەوخۆ بێ، لەوەشە ناڕاستەوخۆ بێ ، وەکو نموونەیەك بۆ دەنگدانی ئاشکرای ناڕاستەوخۆ ڕێ و ڕەسمی‌هەڵبژاردنی نوێنەرەکان (مرسوم انتخاب النواب) لە عێراق ژمارە (٦)ساڵی ( ١٩٥٢ز) لە ماددەی (٣٩) برگەی( ٢ ) دەڵێ : ( ئەوکەسانەی کە نووسین نازانن بەدەم دەنگەکانیان دەدەن بەشێوەیەك کە ئەندامانی لیژنەی هەڵبژاردن گوێیان لێی بێت ، لەم حاڵەتەدا ئەوە لە پلێتی هەڵبژاردندا تۆمار دەکرێت لە لایەن ئەو نووسەرەوە کە لیژنەکە بە کاری دێنێ ، ئەوجار دەیداتە سەرۆك لیژنەکە بۆ ئەوەی واژۆی بکات و بیخاتە سندوقەکەوە)) .

ئەمە شێوەیەکە لە دەنگدانی ئاشکرای ناڕاستەوخۆ، چونکە ئەو کەسانەی کە خوێنەوارییان نەبوو زۆر بوون لە کۆمەڵگەی عێراقیدا. هەروها لە وولایەتە

یەککرتووەکانی ئەمریکا دەنگدانی ئاشکرای ناڕاستەوخۆ بەدی دەکرێ ، ئەوەش لە حاڵەتی هەڵبژاردنی پاڵێوراوی پارتەکان بۆ بەشداری کردن لە هەڵبژاردن وەکو پاڵێوراوی ئەو پارتانە، لەو حاڵەدا پسووله دابەش دەکرێتە سەر لایەنگرانی ئەو پارتانە بۆ دەنگ دان بۆ هەڵبژاردنی پاڵێوراوەکان بۆ پالاوتن ، واتا پێش دەنگدانی گشتی دەنگدانێکی سەرەتایی دەکرێ بۆ دیاری کردنی پاڵێوراوەکانی هەر پارتێك لە لایەن لایەنگرانی ئەو پارتانەوە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لایەنگرانی هەر پارتێك دەبێ خۆیان ئاشکرا بکەن کە بۆچی پارتێك دەنگ دەدەن .

**ج : یەکلاکردنەوەی دروستی هەڵبژاردن ( الفصل في صحة الانتخاب ):**

شتێکی ئاساییە ئەگەر بڵێین ،لە هەر وولاتێکدا هەڵبژاردن بە گوێرەی ڕیاسا و یاساکانی هەڵبژاردن بەڕێوە دەڕوات ، دەبێ ئەو نوێنەرانەی کە هەڵدەبژێردرێن بە گوێرەی یاساو ڕیاساکانی هەڵبژاردن هەڵبژێردرێن ، ئەگەر وانەبێ ئەوە ڕووبەرووی تانەی یاسایی ( الطعون القانونية ) دەبنەوە.

بۆ دیاری کردنی دروستی یان نادروستی دەرچوونی نوێنەرەکان لە هەڵبژاردندا دوو پرسیار دێتە کایەوە :ـ

- ئایا هەڵبژاردنی پاڵێوراوەکان بەپێی یاساو ڕیاساکانی هەڵبژاردن بووە یان نا؟
- ئایا چی دەزگایەك، یان لایەنێك بڕیار لەسەر ئەم مەسەلەیە دەدات ؟

کاتێ گومان هەبوو لە دەرچوونی ، یان دەرنەچوونی پاڵێوراوێك ، یان چەند پاڵێوراوێك لەو هەڵبژاردنەدا ، ئەو کاتە دیاری کردنی ئەو لایەنە دێتە کایەوە کە دەبێ دیاری بکرێت بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیە. لە هەندێ دەوڵەتدا ئەم مەسەلەیە ( گونجاوی یان نەگونجاوی لە گەڵ یاساکاندا)

لە تایبەتکارییەکانی دەسەڵاتی دادوەرییە ( السلطة القضائية ) ئیتر ج دادگایەکی ئاسایی بێ یان تایبەت ( محكمة اعتيادية اوخاصة ) .

هەندێ بۆچوون هەیە دەڵێن :

ـ ئەگەر دادگا سەر بە حکومەت بێ ئەوا لایەنگری ئەو نوێنەرانە دەکات کە سەر بەپارتی دەسەڵاتدارن و توندو تیژ دەبێت بەرانبەر ئەو نوێنەرانەی کەسەر بە پارتە

بەرهەڵستکارەکانن . بەڵام ئەگەر ئەو دادوەرانە سەربەخۆبن، زیاتر ڕاستی خوازی لە بڕیارەکانیاندا بەرجەستە دەبێت .

هەندێ بیروڕا هەیە دەڵێن :

تەنانەت ئەگەر دادوەرەکانیش سەربەخۆ بن گەرەنتی سەربەخۆیی عەقلیەتی ئەو دادوەرانە ناکرێ، لە بەر ئەوەی دادوەرەکان و پارێزەرەکان بە هۆی باری تایبەتی و کۆمەڵایەتییانەوە لایەنگری پارتە ڕاستڕەو و پارێزگارەکان دەکەن و توندو تیژ دەبن لەگەڵ پارتە چەپ ڕەوەکاندا. بە هۆی ئەوەوە کە باسمان کرد ، لە هەندێ وولاتدا ، ئەم مەسەلەیە خراوەتە دەسەڵات و تایبەتکاری ئەنجومەنە هەڵبژێردراوەکانەوە ، واتا ئەو ئەنجومەنانە خۆیان بڕیاری دروستی یان نادروستی هەڵبژاردنی ئەندامەکانیان دەدەن . بە ڕاستی ئەمەش جێگای ڕەخنەیە ، لە بەر ئەوەی ئەم ئەنجومەنانەش پاڵ پشتی ئەو نوێنەرانەن کە لە پارتی زۆرینەن لە ئەنجوومەندا . بۆ نموونە لە فەرەنسا ساڵی ( ١٩٥٦ز) ئەنجومەنی نیشتمانی جاڕی دروستی چەند پاڵێوراوێکیدا ، هەرچەندە زۆرینەی پێویستیان نەهێنابوو لە دەنگەکاندا بۆ دەرچوونیان لە هەڵبژاردن .

بەڕای من دادگا سەربەخۆکان باشترین دەزگان بۆ ئەوەی بڕیاری ئەوە بدەن:

ئایا هەڵبژاردنی نوێنەرەکان بە گوێرەی یاساکانی هەڵبژاردنە یان نا؟ لە بەرئەوەی دۆزەکە دۆزێکی یاساییەو ، عەقڵیەتی دادوەرانیش زیاتر پێبەندە بە جێبەجێکردنی یاساوە لە کەسانی دەزگایەك لەوەیە عەقڵیەتیان ڕامیاری بێ زیاتر لەوەی یاسایی .

## چوارەم : سیستەمەکانی هەڵبژاردن

لە هەمو هەڵبژاردنێکدا کەسانێك دەنگ دەدەن (دەنگدەر)، کەسانێکیش هەن ئەو دەنگانە بەدەست دێنن (پاڵێوراو) لێرەدا سیستەمەکانی هەڵبژاردن چارەسەری ئەوە دەکەن :

- چۆن دەنگدەرەکان دەنگ دەدەن؟
- چۆن کورسییەکان دابەش دەکرێنە سەر پاڵێوراوەکاندا؟

پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکەمان پێویست دەکات چەند زاراوەیەك هەیە ڕوونی بکەینەوە:-

١ـ دەنگدان بەتاك (التصويت الفردي) :ـ

لێرە دەنگدەر بۆی هەیە تەنیا دەنگ بە تاکە کەسێك بدا ، واتا دەنگدەر یەك ناو دەنووسێ لە کارتی دەنگدانەکەیدا ، یان ئیشارەت لەیەك ناو دەدات. دەنگدان بە تاکەکەس لە کاتێکدا دەبێ کە ناوچەی هەڵبژاردن بچووك بێتو تەنیا دەنگ بۆ یەك پاڵێوراو بدرێ لەنێوان چەند پاڵێوراوێکدا .

٢ـ دەنگدان بە لیست (التصويت على أساس القائمة) :لەم جۆرەی دەنگدانەدا ، پێویست دەکات ناوچەی هەڵبژاردن فراوان بێ بەشێوەیەك ، کە دەنگدەر بتوانێ دەنگ بۆ چەند پاڵێوراوێك بدات نەك تەنها بۆ یەك پاڵێوراو.

ئەمە و دەنگدان بە لیست دوو جۆر دەگرێتە خۆی :

أـ دەنگدان بە لیستی داخراو : لێرەدا دەنگدەر دەبێ دەنگ بە یەکێ لەو لیستانە بدات ، کە یەکێ لە پارتەکان خستویانەتە گۆڕەپانەوە ، بێئەوەی بتوانێ هیچ گۆڕانکارییەکی تێدا بکات، واتا دەنگ دەداتە لیستەکە بەتەواوی و بەوشێوەیەی کە دابەزیوە.

ب ـ دەنگدان بە لیستی کراوە: لێرەدا دەنگدەر بۆی هەیە لەو لیستانەی کە هەن چەند پاڵێوراوێك هەڵبژێرێ ، لەو پاڵێوراوانەی کە هەڵیانی بژاردووە دەتوانێ لیستێکی تایبەت بەخۆیەوە دروست بکات بە مەرجێك دەنگدەر دەبێ دەنگ بەو ژمارەیە بدات کە زیاد نەبێ لەو ژمارەیەی کە پێویستە بە نوێنەر هەڵبژێردرێن، بۆ نموونە لە ناوچەی هەڵبژاردنی (أ) دەبێ پێنج پاڵێوراوێ هەڵبژێردرێ، لێرەدا دەنگدەر دەبێ پەیوەست بێ بەو ژمارەیەوە.

بەهەرحاڵ سیستەمەکانی هەڵبژاردن لەچەند جۆرێك پێکهاتوون لەوانە :

## ١ـ سیستەمی زۆرینە (نظام الأغلبية) :

سیستەمی زۆرینە سیستەمێکە لە هەردوو جۆری دەنگدان بەکاردەهێنرێت ، دەنگدان بۆ تاکەکەس و دەنگدان بۆ لیست . سیستەمی زۆرینە زیاتر لەو وڵاتانە پەیڕەو دەکرێ کە بازنەی هەڵبژاردنی بچووك و دوابەدوای ئەوە دەنگدان بە

تاکەکەس تیایاندا پەیڕەو دەکرێ ، بەڵام لەحاڵەتی دەنگدان بە لیست ، سیستەمی زۆرینە کەمتر پەیڕەو دەکرێت .

ئەمەو سیستەمی زۆرینە دوو جۆری هەیە :ـ

ـ سیستەمی زۆرینە بە یەك خول (نظام الاغلبية ذو الدور الواحد):

لە ئەم سیستەمەدا ، هەر پاڵێوراوێك زیاتر دەنگ بێنێ لەهەر پاڵێوراوێکیتری بەشدار لە هەڵبژاردندا بە سەرکەوتو دەژمێردرێت بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ئەو ڕێژەیەی کە هێناویەتی لە سەرجەم دەنگەکان ، واتا هەر پاڵێوراوێك ئەو ڕادەیەی دەنگ بێنێ کە زیاتر بێ لە هەر یەك لە پاڵێوراوەکانیتر هێناویانە ، بە سەرکەوتو دەژمێردرێت لە هەڵبژاردندا، بۆ نموونە :

٤٠٠٠٠ دەنگ، سەرجەم دەنگەکان

پاڵێوراوەکان

أـ ١٥٠٠٠ دەنگ

ب ـ ١٣٥٠٠ دەنگ

ج ـ ١٠٠٠٠ دەنگ

د ـ ١٥٠٠ دەنگ

لێرەدا پاڵێوراوی (أ) بە سەرکەوتو دەژمێردرێ لە هەڵبژاردندا ، هەرچەندە کەمتر لە (1/3) ی سەرجەم دەنگەکانی هێناوە.

سیستەمی زۆرینە بە دوو خول :ـ

لەئەم سیستەمەدا بۆ سەرکەوتنی هەر پاڵێوراوێك دەبێ زیاتر لە نیوەی دەنگەکان بێنێ ، واتا زۆرینەی ڕەها بێنێ لە دەنگەکان ، ئەمە وەکو خولی یەکەمی هەڵبژاردن ، بەڵام ئەگەر لە خولی یەکەمدا ئەو ڕێژەیەی نەهێنا لە دەنگەکان ئەوە هەڵبژاردنێکی تازە دەکرێتەوە ، لەم هەڵبژاردنە تازەیەدا مەرج نییە پاڵێوراو زۆرینەی ڕەها بەدەست بێنێ ، بۆبردنەوەی ئەم خولە (خولی دووەم) ڕەچاوی سیستەمی زۆرینەی یەك خول دەکرێت.

نموونە : سەرجەم دەنگەکان (٤٠٠٠٠) دەنگ

پاڵێوراوەکان

أ - ٢٠٠٠١ دەنگ

ب - ٩٩٩٩ دەنگ

ج - ٥٢٠٠ دەنگ

د - ٢٨٠٠ دەنگ

هـ - ٢٠٠ دەنگ

لێرەدا پاڵێوراوی (أ) لەم هەڵبژاردنەدا براوەیە، لەبەرئەوەی (٥٠ + ١٪) ی دەنگەکانی هێناوە .

بەڵام ئەگەر (أ ، ب ، ج ، د ، ه) هیچیان ئەم ڕادەیەیان (٥٠ + ١٪) نەهێنایە ، ئەوکاتە هەڵبژاردنێکی تازە دەکرایەوەو بۆ بردنەوەی ئەم هەڵبژاردنەش (خولی دووەم) هەر ڕادەیەك پەسەند دەگرێ بەمەرجێ ئەو ڕادەیە لەئەو دەنگانە زیاتربێ کە هەر پاڵێوراوێکیتر دەیهێنێ.

هەڵسەنگاندنی سیستەمی زۆرینە :ـ

ـ ئەم سیستەمە دەبێتە هۆی ئارامیو سەقامگیری ئەو حکومەتانەی کە بەم شێوەیە هەڵدەبژێردرێن .

ـ سیستەمی زۆرینە دەبێتە هۆی وون بوونی پارتە بچووکەکان لە بەرانبەر پارتە بەهێزەکان (لەڕووی جەماوەرییەوە) و دوابەدوای ئەوە نەمانی ئەو پارتانە و کزبوونی دروست بوونی پارتی تازە.

ـ دەنگدەر دەتوانێ بەلێزانییەکی تەواوەوە لەسەر سەرجەم پاڵێوراوەکان دەنگی خۆی بدات، ئەمەش دەبێتەهۆی ئەوەی کە کاریگەری لایەنە ڕامیارییەکان کەم ببێتەوە لەسەر بیروبۆچوونی هەڵبژێردەران.

ـ لەبەرئەوەی ناوچەی هەڵبژاردن بچووکە بۆ هەموو کەسێك هەیە بەشداری هەڵبژاردن بکا وەکو پاڵێوراوێك ، بەو کەسانەشەوە کە سەروەت و سامانێکی ئەوتۆیان نییە ،لەبەرئەوەی وەکو ووتمان ناوچەی هەڵبژاردن بچووکە و ئەو پاڵێوراوانە

پێویستییان بەپارەو پولێکی ئەوتۆ نابێ بۆ خۆناساندنیان بە خەڵکی ، ئەمەش دەبێتەهۆی ئەوەی کەمتر پشت بە سەرمایەدار و لایەنە ڕامیارییەکان ببەستن.

ـ سیستەمی زۆرینە دەبێتەهۆی ئەوەی نوێنەرەکان کەمتر گرنگایەتی و بایەخ بە ڕەوشی ڕامیاری گشتی وولات بدەن ، لەبەرئەوەی بچووکی ناوچەی هەڵبژاردن لەم سیستەمەدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەڵبژاردن ببێتە ململانێی نێوان کەسایەتیەکان لە جێگای ململانێی نێوان بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیەتە جیاجیاکان.

ـ دەبێتە هۆی ئەوەی ناوچەکانی هەڵبژاردن ببێتە(ناوچەیەکیداخراو) بۆ چەند کەسانێك لەسەر بناغەی ئەو یارمەتیو ناسیاریو ئەو ئیشوکارانەی کە نوێنەری ئەو ناوچانە دابینی دەکەن بۆ خەڵکی ئەو ناوچانە، نەك لەسەر بناغەی بۆچوونو بیروباوەڕو یان ئەو خزمەتانەی کە کردوویانە لەکاتی بەشداربوونیان لە دەسەڵاتدا.

ـ سیستەمی زۆرینە بەیەك خول ، دەبێتەهۆی ئەوەی پارتێك لە هەڵبژاردن سەرکەوێت کە زۆربەی دەنگدەرەکان دەنگیان بۆ نەداوە ، بەلام ئەم حاڵەتەش پێویستی بە سێ پارت هەیە کەدەبێ نزیك بن لەیەکەوە لەڕێژەی ئەو دەنگانەی کە دەیهێنن، بۆ نموونە گریمان سەرجەم دەنگەکان یەك ملیۆن دەنگە ، ئەم سێ پارتەش هەریەکەو ئەم ڕێژەیە دەنگیان بەدەست هێناوە: -

پارتی أ : ٤٠٠٠٠٠ دەنگ

پارتی ب : ٣٧٠٠٠٠ دەنگ

پارتی ج : ٢٣٠٠٠٠ دەنگ

لێرەدا پارتی (أ) سەرکەوتووە لە هەڵبژاردندا هەرچەندە زۆربەی دەنگدەرەکان دەنگیان بۆ نەداوە.

ـ سیستەمی هەڵبژاردن بە یەك خول دەبێتەهۆی یەکگرتنی ئەو پارتانەی کە لە بیروبۆچووندا لەیەکەوە نزیکن لەیەك پارتدا ، بۆئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردن بەدەست بهێنن، بۆ نموونە : لەناوچەیەکی هەڵبژاردنی دیاریکراودا:ـ

پاڵێوراوی چەپڕەو (٢٥٠٠٠) دەنگ بەدەست دێنێ ، پاڵێوراوی پارتی ڕاستڕەو (٢٠٠٠٠) دەنگ بەدەست دێنێ ، لە هەمان کاتدا پاڵێوراوێکی تری ڕاست ڕەو (١٥٠٠٠) دەنگ بەدەست دێنێ ، لێرەدا بۆئەوەی پارتە ڕاستڕەوەکان ئەنجامی هەڵبژاردنێکی دیکە بەدەست بهێنن پێویست دەکات یەك بگرن و یەك پاڵێوراو بخەنە نێو ململانێی هەڵبژاردنەکەوە.

ـ سیستەمی زۆرینە بە دووخول هەندێجار دەبێتەهۆی فرەبوونی پارتەکان و لەهەمان کاتدا یەك نەگرتنی ئەو پارتانەی کە لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە لەیەکەوە نزیکن، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی یەکەم خولی هەڵبژاردن بەگوێرەی ئەم سیستەمە پێویستی بە زۆرینەی ڕەها هەیە ، بەدەستهێنانی زۆرینەی ڕەهاش شتێکی ئاسان نییە ، ئەمەش وا لەو پارتانە دەکات لە دۆڕاندنیان نەترسن بەرانبەر پارتەکانیتر، ئەو زۆرینەش لە گروپێ پارتی بەشداربوودا، یەکێ لەو پارتانە بیهێنێ یان نەیهێنێ ، جا لەبەرئەوە پارتە بچوکەکان دەچنە پرۆسەی هەڵبژاردنەوە بۆئەوەی بەختی خۆیان تاقی بکەنەوەو ڕێژەی خۆیان لەناو جەماوەردا بزانن.

لە کۆتاییدا پێویست دەکات ئاماژە بەوە بکەین کە بەریتانیا بە سیستەمی زۆرینەی یەك خولی وەرگرتووە لەسەدەی سیازدەیەمەوە ، هەروەها ئەمریکاو زۆربەی دەوڵەتەکانی کۆمۆنوێلس و هند پاش سەربەخۆبوونی لەساڵی( ١٩٢٧ز ) بەسیستەمی زۆرینەی یەك خولیان وەرگرتووە ، بەڵام سیستەمی زۆرینە بەیەك خول لە فەرەنسا پەیڕەوکراوە لەپاش شۆڕشی فەرەنسایییەوە تا ساڵی( ١٩٤٥ز ) ، دیسانەوە پەیڕەوکرا لە فەرەنسا لە هەڵبژاردنی ساڵی( ١٩٨٨ز ) دا ، هەروەها عیراق لەساڵی( ١٩٥٢ز ) بە سیستەمی زۆرینەی دووخولی وەرگرت بەڵام ڕێژەی (٤٠٪)ی دانا بۆ سەرکەوتن لەخولی یەکەمدا ، واتا زۆرینەی ڕێژەیی داناوە نەك زۆرینەی ڕەهای دەنگەکان.

## ٢ـ سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی(نظام التمثیل النسبي):

لە سیستەمی زۆرینەدا وەکو بینیمان ئەو پارتانە کورسییە نوێنەرایەتییەکانیان بەر دەکەوێ کە خەڵکێکی زۆر دەنگیان بۆ دەدات و زۆرینە دێنن لە ناوچەکانی هەڵبژاردندا، تەنانەت ئەگەر چەند پارتێك هەبن و خەڵکێکی بەرچاویشیان هەبێت و

ڕێژەیەکی باشیش لە دەنگدەرەکان دەنگیان بۆ بدەن، ئەوا ئەو دەنگانە بەفیڕۆ دەچن ئەگەر زۆرینە پێکنەهێنن لە ناوچەکانیهەڵبژاردندا .

لەبەر ئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردن زیاتر ڕاستیخوازی تێدا بێت و ناوێنەیەکی ڕاستەقینەی دەنگی دەنگدەرەکان بێت و تەعبیر لە ڕاستی بیر و بۆچوونی هاوولاتیان بکات، نابێ ئەو دەنگانەی کە زۆرینە نیین و لە هەمان کاتدا هەن بە فیڕۆ بچن ، بەڵکو دەبێ هەر گروپێك یان هەر پارتێك هەر یەکەو بە گوێرەی خۆی ئەوندە کورسی لە پەرلەماندا بە دەست بکەوەێت گونجاو بێت لە گەڵ کێشی خۆیدا لە ناو جەماوەردا.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەوانەی داوای سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی دەکەن زیاتر ئەو پارتانەن کە ئەندام و لایەنگریان لە هەموو ناوچەو جێگاکان هەیە بەڵام زۆرینە پێك ناهێنن ، ئەو پارتانەش زیاتر پارتە چەپەکان و پارتە سۆشیالیزمەکانن. ئەم سیستەمە بۆ یەکەم جار لە سەدەی نۆودەیەم پەیڕەو کرا لە دەنیمارك لە ساڵی (١٨٥٥ز) لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پیراندا. هەروەها ئەم سیستەمە لە ساڵی (١٨٩٩ز) لە بەلجیکا پەیڕەو کرا . هەروەها لە هۆڵەندا ، ئەڵمانیا ، چیکۆسلۆفاکیا پێش هەڵوشاندنەوەی ، ئیتالیا و سویسرا پەیڕەو کرا پاش جەنگی جیهانی یەکەم ، کە بە شێوەیەکی بەربڵاو پەیڕەوکرا لە لایەن دەوڵەتەکانەوە. هەروەها لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق پەیڕەو کرا بە پێی یاسای ژمارە (١)لە ساڵی (١٩٩٢ز).

لەم سیستەمەدا دەبێ ناوچەی هەڵبژاردن گەورەبێت و ململانێ لە سەر چەند کورسیەك هەبێت ، نەك تەنها یەك کورسی ، لە بەر ئەوەی تەنها کورسییەك دابەش ناکرێتە سەر چەند پارتێکدا ، بەڵکو دەنگدەرەکان دەتوانن دەنگ بۆ چەند نوێنەرێ بدەن لە هەمان کاتدا ، واتا لەم سیستەمەدا دەبێ ناوچەکانی هەڵبژاردن گەورەبن و دەنگدان لە سەر بناغەی لیست بێت.

بۆ دابەشکردنی کورسیەکان لە سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەییدا بە سەر پاڵێوراوەکاندا دوو سیستەم هەن یەکێکیان سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی تەواوە (نوێنەرایەتی ڕێژەیی لە سەر ئاستی نیشتمانی ). ئەوی تریانیش نوێنەرایەتی ڕێژەیی

تەقریبی یە (نوێنەرایەتی ڕێژەیی لە سەر ئاستی ناوچەکان). بۆیە پێویست دەکات ئەو دوو سیستەمە بە دور و درێژی باس بکەین.

## أ- سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی لە سەر ئاستی نیشتمانی:

لە سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی سەرژمێری هەموو دانیشتوانی وولات دەکرێت و ژمارەی ئەوانەی بۆیان هەیە دەنگ بدەن دیاری دەکرێت ، هەروەها ژمارەی کورسییەکانی پەرلەمان بەشێوەیەکی تەقریبی دیاری دەکرێت ، پاشان ژمارەی ئەوانەی کە بۆیان هەیە دەنگ بدەن دابەش دەکرێتە سەر ژمارەی کورسیەکانداودابەشکردنەکەش (معدل)ی نیشتمانی دێنێتە کایەوە.[1]

گریمان سەرژمێری سەرجەم دەنگدەرەکان لە وولاتێکدا یەك ملیۆن دەنگدەرەو ژمارەی کورسییەکانی پەرلەمانیش (١٠٠) کورسییەو ژمارەی پارێزگاکانیش لە دەوڵەتدا (١٠) پارێزگان ، هەر پارێزگایەکیش بە ناوچەیەکی هەڵبژاردن لە قەڵەم دراوە.

$$\text{موعەدەلی نیشتمانی} = \frac{\text{ژمارەی دەنگدەران}}{\text{ژمارەی کورسییەکان}}$$

$$\text{موعەدەلی نیشتمانی} \quad ١٠٠٠٠ = \frac{١٠٠٠٠٠٠}{١٠٠}$$

لێرەدا لەهەر پارێزگایەك کە ناوچەیەکی هەڵبژاردنە ، چەند پارتێك هەریەکەو لیستی خۆی دادەبەزێنێ .

---

[1] هەندێ لە یاساکانی هەڵبژاردن ئەو دەنگانەی کە دراون دابەش دەکەنە سەر ژمارەی کورسیەکاندا بۆ دەرهێنانی موعەدەلی نیشتمانی ، یەکێ لەو یاسایانەش ، یاسای ئەنجومەنی نیشتمانیە لە کوردستانی عێراق کە لە یاسای ژمارە (١)ی ساڵی (١٩٩٢)ز لە ماددەی (٣٦)دا باسی کردووە .

گریمان لە یەکێ لە پارێزگاکان کە ناوچەیەکی هەڵبژاردنە ، ئەم پارتانە هەر یەکەو ئەم ژمارەیە لە دەنگەکانیان هێناوە:

لیستی پارتی أ = ٤٥٠٠٠ دەنگ

لیستی پارتی ب = ٣٢٠٠٠ دەنگ

لیستی پارتی ج = ١٩٠٠٠ دەنگ

لیستی پارتی د = ٤٠٠٠ دەنگ

لێرەدا ژمارەی ئەو کورسیانەی کە هەر یەك لەم پارتانە هێناویانە بەم شێوەیە دەردەکرێ:

ژمارەی دەنگدەرانی لیستی هەر پارتێك

موعەدەلی نیشتمانی

لیستی پارتی أ: ٤٥٠٠٠ / ١٠٠٠٠ = ٤ کورسی و٥٠٠٠دەنگ زیادە

لیستی پارتی ب : ٣٢٠٠٠ / ١٠٠٠٠ = ٣ کورسی و٢٠٠٠دەنگ زیادە

لیستی پارتی ج: ١٩٠٠٠ / ١٠٠٠٠ = ١ کورسی و٩٠٠٠دەنگ زیادە

لیستی پارتی د: ٤٠٠٠ / ١٠٠٠٠ = سفر و٤٠٠٠دەنگ زیادە

لێرەدا وەك دەبینین لیستی پارتی (أ) ٤ کورسی و٥٠٠٠ دەنگی زیادەی هەیە.

لیستی پارتی (ب) ٣ کورسی و٢٠٠٠ دەنگی زیادەی هەیە.

لیستی پارتی (ج) ١ کورسی و ٩٠٠٠ دەنگی زیادەی هەیە.

لیستی پارتی (د) کورسی بەرنەکەوتوەو٤٠٠٠ دەنگی زیادەی هەیە .

بێگومان لەهەموو پارێزگاکانی تریش لە نموونەکەی پێشوماندا ئەو دەنگە زیادانە هەن ، وەکو ووتمان ئەو دەنگە زیادانە لە سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەییدا بەفیڕۆ ناڕۆن ، بەڵکو هەر لیستێك بەپێی ئەو دەنگانەی هێناویەتی کورسی بەردەکەوێ لە پەرلەماندا ، بۆیە ئەم پرسیارە دێتەپێش:

ئایا ئەو دەنگانە چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت؟

بەگوێرەی نوێنەرایەتی ڕێژەیی لەسەر ئاستی نیشتمانی هەموو دەنگە زیادەکان کۆدەکرێنەوەو بەرانبەر بەو دەنگە زیادانە کورسی لە پەرلەماندا وەردەگیرێ، گریمان لیستی پارتی (أ) لەسەرجەم پارێزگاکاندا بەم شێوەیە دەنگی زیادەی بۆ ماوەتەوە :

پارێزگای ١ ٥٠٠٠ دەنگ

پارێزگای ٢ ٤٠٠٠ دەنگ

پارێزگای ٣ ١٠٠٠ دەنگ

پارێزگای ٤ ٢٥٠٠ دەنگ

پارێزگای ٥ ٥٠٠ دەنگ

پارێزگای ٦ ٨٠٠٠ دەنگ

پارێزگای ٧ ٧٠٠٠ دەنگ

پارێزگای ٨ ٣٠٠٠ دەنگ

پارێزگای ٩ ١٥٠٠ دەنگ

پارێزگای ١٠ ٤٢٠٠ دەنگ

سەرجەم دەنگە زیادەکانی لیستی پارتی (أ) (٣٦٧٠٠) دەنگە ، ئەم دەنگە زیادانە وەکو بینیمان هی هەموو ناوچەکانی هەڵبژاردنە، دابەش دەکرێ بەسەر دەرەوەی دابەشکردنی هەڵبژاردندا (٣٦٧٠٠\١٠٠٠٠ = ٣ کورسی) واتا لیستی پارتی (أ) سێ کورسیتری بەردەکەوێت لەسەر ئاستی نیشتمانی جگە لەئەو کورسیانەی کە هێناویەتی.

هەر پارتێك چەند کەسێك دیاری دەکات بۆ پڕکردنەوەی ئەو کورسیانە ، کە زۆرجار خەڵکی پلەوپایەدارن لەناو حزبدا ، واتا ئەم نوێنەرانە لە پەرلەماندا لەلایەن پارتەکانیانەوە دانراوون بێئەوەی کەس دەنگی بۆیان دابێت.

## ب ـ نوێنەرایەتی ڕێژەیی تـەقریبی، نوێنەرایـەتی ڕێژەیـی لەسەرئاسـتی ناوچەکان (التمثيل النسبي التقريبي) :ـ

لەبەرئـەوەی دابەشـکردنی کورسـییە نوێنەرایەتییـەکان بـەگوێرەی نوێنەرایـەتی ڕێژەیی تەواو، دەبێتە هۆی ئەوەی کە چەند کەسێك کورسییان بەرکەوێت لە لیستی نیشتمانی بێئـەوەی کـەس دەنگی بۆیـان دابێ ، بۆیـە هـەندێ لـە وولاتـەکان پـەنایان بردوەتـە بـەر ئـەم شێوازە بـۆ دابەشکردنی کورسییەکانی نوێنەرایـەتی لـەناوەوەی ناوچەکانی هەڵبژاردندا.

بەپێی نوێنەرایـەتی ڕێژەیی تـەقریبی دەنگـە ڕاسـتەکان لـە هـەر ناوچەیـەکی هـەڵبژاردندا دابـەش دەکرێـن بەسـەر ژمـارەی کورسییەکاندا، بـەم دابــەش کردنـەش دەرەوەی دابەشکردنی هەڵبژاردن دەردەچێت.

گریمـان (١٠٠٠٠٠) دەنگـی داوە لـە ناوچەیـەکی هـەڵبژاردندا و ( ١٠ ) کورسـی تـەرخانکراوە بـۆ ئـەو ناوچەیـە، لـێرەدا پێویسـتە دەرەوەی دابەشـکردنی هـەڵبژاردن دەربکەین :

$$\frac{\text{دەنگە ڕاستەکان}}{\text{ژمارەی کورسییەکان}} = \text{دەرەوەی دابەشکردنی هەڵبژاردن}$$

$$\frac{١٠٠٠٠٠}{١٠} = ١٠٠٠٠$$

گریمان چوار لیسـتی هـەڵبژاردن ( قائمـە انتخابیـە ) دابەزیـە ئـەم ناوچەیـە و هەریەکەو ئەم ژمارەیانە دەنگیان هینا :ـ

لیستی (أ) ٤٤٠٠٠ دەنگ ، لیستی (ب) ٣١٠٠٠ دەنگ

لیستی (ج) ١٨٠٠٠ دەنگ ، لیستی (د) ٧٠٠٠ دەنگ

لیستی پارتی أ: $\frac{٤٤٠٠٠}{١٠٠٠٠}$ = ٤ کورسـی و ٤٠٠٠ دەنگ زیادە

لیستی‌پارتی‌ب : $\frac{31000}{10000}$ = ٣ کورسی و ١٠٠٠دەنگ زیادە

لیستی پارتی ج: $\frac{18000}{10000}$ = ١ کورسی و ٨٠٠٠دەنگ زیادە

لیستی پارتی د: $\frac{7000}{10000}$ = سفر و ٧٠٠٠دەنگی هەیە

لێرەدا لە کۆی دە کورسی هەشتیان دابەشکراوون و دووانیان ماونەتەوە.

دوو رێگا هەیە بۆ دابەشکردنیان :-

**رێگای یەکەم : رێگای مانەوەی بەهێز (طريقة الباقي الأقوى)**

بەپێی ئەم رێگایە ئەم موعادەلەیە پەیرەو دەکرێ :-

ژمارەی ئەو دەنگانەی کە هەر لیستێك هێناویەتی - دەرەوەی دابەشکردنی هەڵبژاردن × ژمارەی ئەو کورسیانەی کە هەر لیستێك هێناویەتی ) .

لیستی (أ) ٤٤٠٠٠ - (١٠٠٠٠× ٤) = ٤٠٠٠ دەنگ

لیستی (ب) ٣١٠٠٠ - (١٠٠٠٠× ٣) = ١٠٠٠ دەنگ

لیستی (ج) ١٨٠٠٠ - (١٠٠٠٠× ١) = ٨٠٠٠ دەنگ

لیستی (د) ٧٠٠٠ - (١٠٠٠٠× ٠) = ٧٠٠٠ دەنگ

وەکو دەبینین لیستی (ج) زیاترین رێژە دەنگی بۆ ماوەتەوە، بۆیە کورسییەکی بەردەکەوێت لەو دوو کورسییەی کە ماونەتەوە ، کورسیەکەی تریش بەر لیستی (د) دەکەوێت ، لەبەرئەوەی زیاترین رێژە دەنگی بۆ ماوەتەوە پاش (ج).

**رێگای دووەم : رێگای موعەدەلی بەهێز**

بەپێی رێگای موعەدەلی بەهێز ئەو دەنگانەی کە لیستەکان هێناویانە دابەشدەکرێن بەسەر ئەو ژمارە کورسیانەی کە هێناویانە + ١ ، ئەو لیستانەی کە کورسیان نەهێناوە ، کورسییەك دەخرێتە پاڵیان ، هەر لە نموونەکەی پێشووماندا :-

نیستی (أ) ٤٤٠٠٠ دەنگی هەیەو (٤) کورسی هێناوە

$$\frac{44000}{1+4} = 8800$$ دەنگ

لیستی (ب) ٣١٠٠٠ دەنگی هەیە و سێ کورسی بەدەست هێناوە

$$\frac{31000}{1+3} = 7750$$ دەنگ

لیستی (ج) ١٨٠٠٠ دەنگی هەیەو یەك کورسی بەدەست هێناوە

$$\frac{18000}{1+1} = 9000$$ دەنگ

لیستی (د) ٧٠٠٠ دەنگی هەیەو کورسی بەرنەکەوتوە

$$\frac{7000}{1+0} = 7000$$ دەنگ

بەم شێوەیە کورسی زیادەی یەکەم بەر لیستی (ج) کەوت لەبەرئەوەی زیاترین دەنگی ماوەتەوە.

بۆ دابەشکردنی کورسی دووەم هەمان ڕێو شوێن دووبارە دەکرێتەوە.

لیستی أ $$\frac{44000}{1+4} = 8800$$ دەنگ

لیستی ب $$\frac{31000}{1+3} = 7750$$ دەنگ

لیستی ج $$\frac{18000}{1+2} = 6000$$ دەنگ

لیستی د $$\frac{7000}{\text{صفر}+1} = 7000$$ دەنگ

لێرەدا لیستی( أ )زیاترین دەنگی بۆ ماوەتەوە بۆیە ئەو کورسیەی کە ماوەتەوە بەری دەکەوێ.

لە کۆتاییدا بەپێی نوێنەرایەتی ڕێژەی تەقریبی هەر لیستێك

| لیست | بەگوێرەی ڕێگای مانەوەی بەهێز | بەگوێرەی ڕێگای موعەدەلی بەهێز |
|---|---|---|
| لیستی أ | ٤ کورسی | ٥ کورسی |
| لیستی ب | ٣ کورسی | ٣ کورسی |
| لیستی ج | ٢ کورسی | ٢ کورسی |
| لیستی د | ١ کورسی | صفر کورسی |

ئەمەو جگە لە ئەو دوو ڕێگایە چەند ڕێگایەکیتر هەیە وەکو (دهۆنت) و دەرەوەی دابەشکردنی ڕاست (خارج القسمە الصحیح) کە بە پێویستی نازانین لێرەدا باسی بکەین.

## هەڵسەنگاندنی سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی

- سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی دەبێتە هۆی ڕاستیخوازی (العدالة) لە دابەشکردنی کورسییە نوێنەرایەتییەکاندا، جگەلەوەی دەبێتەهۆی هەبوونی هەموو بیروڕاو بۆچوونەکان لە پەرلەماندا.

- لەنوێنەرایەتی ڕێژەیی تەواودا بەهۆی دەنگە زیادەکانی ناوچەکانی هەڵبژاردنەوە ، هەندێ نوێنەر دەگەنە پەرلەمانو بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەمێننەوە ، ئەو نوێنەرانەش لەلایەن پارتەکانیانەوە دیاری دەکرێنو بە گرنگترین ئەندامەکانی ئەو پارتانە دەژمێردرێن.

- سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی دەبێتە هۆی پەرەپێدانی فرە پارتایەتیو دروستبوونی پارتی تازە بەشێوەیەکی بەردەوام ، لەبەرئەوەی وەکو بینیمان لە سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەییدا دەنگەکان بەفیڕۆ ناچن ، ئەو پارتانەش هەرچەندە

لەوەیە کورسیان بەدەست نەکەوێت لە ناوچە جیاجیاکاندا بەڵام بە کۆکردنەوەی دەنگە زیادەکانیان لەوەیە چەند کورسییەکیان بەدەست بکەوێت لە پەرلەماندا.

**دابەشکردنی کورسیە نوێنەرایەتیەکان لەنێوان پاڵێوراوی لیستەکاندا**

زۆرجار لیستەکان ئەوەندە کورسی بەدەست دەهێنن کە کەمترە لە ژمارەی پاڵێوراوی سەر لیستەکان ، ئایا ئەو کورسییانە چۆن دابەش دەکرێنە سەر پاڵێوراوەکاندا ؟

لێرەدا دەبێ جیاوازی بکرێت لەنێوان :

أ – لیستی کراوە :-

ئەگەر لیستەکان کراوە بوون ، واتا هەر دەنگدەرێك بۆی هەبێت چەند پاڵێوراوێك هەڵبژێرێت بەگوێرەی ئەو ژمارەیەی کە دیاری کراوە. ئەوە لیستێکی تایبەت بەخۆیەوە دروست دەکات، واتا دەنگدەر بۆی هەیە لەناو لیستێکی تایبەت بەخۆیەوە ناوی چەند پاڵێوراوێك بنوسێت و هەر ناوێکی لە لیستێکەوە وەرگرتبێت ، بەمەرجێ پابەند بێت بەو ژمارەیەوە کە دیاریکراوە.

لێرەدا بۆ سەرکەوتنی هەر پاڵێوراوێك ، یان چەند پاڵێوراوێك لەناو هەمان لیستدا پەیرەوی سیستەمی زۆرینە دەکرێت، واتا ئەو پاڵێوراوەی زیاتر دەنگی هێنابێت لەهەر پاڵێوراوێکیتر لەناو هەمان لیستدا، ئەوە کورسی بەردەکەوێت ،ئیتر ئەگەر چەند کورسییەك بێت ئەوا براوەکان ئەو کەسانە دەبن کەدەنگی زیاتریان هێناوە لە هاورێکانیان لەناو هەمان لیستدا ، بۆ نموونە :-

| لیستی (أ) | لیستی (ب) | لیستی (ج) |
| --- | --- | --- |
| س | ز | د |
| ص | ش | ی |
| ع | ك | ف |
| ح | ر | ه |

گریمان دەنگدەر بۆی هەیە دەنگ بە سێ پاڵێوراو بداتو دەنگدەرێك بەم جۆرە دەنگیدا :

ص ، ك ، هـ (لیستی دەنگدەر، هەڵبژێردەر)

لێرەدا ئەو دەنگدەرە لیستێکی تایبەت بەخۆیەوە دروستکرد . گریمان لیستی (أ) دوو کورسی بەرکەوتو هەریەك لە پاڵێوراوەکانی بەم جۆرە دەنگیان هێنا:

س : ٢٠٠٠٠ دەنگ ، ص : ٢٠٠٠ دەنگ

ع : ٨٠٠٠ دەنگ ، ح : ١٠٠٠٠ دەنگ

لێرەدا (س) لە هەموویان زیاتر دەنگی هێناوە کورسییەکی بەردەکەوێ ، پاش (س)، (ح) دەنگی زۆری هێناوە ، کورسی دووەمی بەردەکەوێت .

ب – لیستی داخراو :ـ

لێرەدا دەنگدەر یان دەبێ دەنگ بۆ لیستەکە بدا بەگشتی و یان ڕەتی بکاتەوە بەهەمان شێوە، دابەشکردنی کورسیەکان لەنێوان پاڵێوراوی هەر لیستێك دەکەوێتە دەست پارتەکان.

هەرپاڵێوراوێ ناوی یەکەم بێ،ئەوە کورسییەکی بەردەکەوێ، ئەگەرئەولیستە کورسی تری بەدەست هێنا، ئەوە ئەدرێ بەوپاڵێوراوەی کەناوی دووەمە لە لیستەکەداو، ئیتر بەم شێوەیە... بەڵام بۆچارەسەرکردنی ئەم کەم وکورتییە و بۆئەوەیهەڵبژێردەر بتوانێ پاڵێوراوی خۆی هەڵبژێرێ لەناوهەمان لیستدا ،ئەوە هەندێ یاساکانی هەڵبژاردن ،دەنگدانی ومبەرتریان (التصويت التفضيلي) هێناومتەکایەوە بۆدابەشکردنی کورسیەکان لەناوهەمان لیستدا ،واتا دەنگدەر لەجێگای ئەوەی دەنگ بەلیستەکە بدات بە تەواوی یان ڕەتی بکاتەوە بەهەمان شێوە ، هەڵدەسێ بەدیاریکردنی ئەوپاڵێوراوانەی کەخۆیدەیەوێت لەهەمان لیستدا. بەوجۆرە ئەو پاڵێوراوانەی کە دەنگی زیاتر دەهێنن لەپاڵێوراوەکانی تری ناو هەمان لیست ،ئەوە کورسیەکانیان بەردەکەوێ .

بۆنموونە لەسەر دەنگدانی ومبەرتر (التصويت التفضلي)

لستی (أ) : <u>س</u> ص <u>ع</u> ج

لێرەدا دەنگدەر هەردوو پاڵێوراوی (س) و (ع)ی دەستنیشانکرد لە لستی(أ).

٣ـ سیستەمی هەڵبژاردنی تێکەڵاو(الانظمة الانتخابية المختلطة)

لەبەرئەوەی هەریەکەو لەسیستەمی زۆرینەو سیستەمی نوێنەرایەتی رێژەیی ئایەتی ونایەتی خۆیان هەیە، بۆلادان لەکەم وکورتیەکانی ئەو دوو سیستەمە هەندێ لەیاساکانی هەڵبژاردن پەنایان بردووەتە بەرسیستەمی هەڵبژاردنی تێکەڵاو ، ئەم سیستەمە خەسڵەتی هەردوو ئەوسیستەمانەی تێدایە ، کۆکەرەوەی مەزایەو ڕایەڵەکانی ئەودووسیستەمەیە ، بەڵام یاساکانی هەڵبژاردن پەیڕەوی ئەم سیستەمەیان کردوە بەلادان بەلای یەکێ لەو دوو سیستەمەی پێشوودا، جا بۆیە پێویستە بەدرێژی باسی ئەم دوو سیستەمە بکەین:

## أـ سیستەمی تێکەڵاوی لادەر بەلای سیستەمی زۆرینەدا:

ئەم سیستەمە وەکو گوتمان خەسڵەت وتایبەت مەندی هەردوو سیستەمی زۆرینەو سیستەمی ڕێژەیی تێدا بەدی دەکرێ،جا لەبەر ئەوە پێویستی بەشیکردنەوە هەیە :

١ـ خەسڵەتەکانی سیستەمی ڕێژەیی لەسیستەمی تێکەڵاوی لادەر بەلای سیستەمی زۆرینەدا :

ـ ناوچەیهەڵبژاردنی پان وفراوان .

ـ ئەوناوچەیە جێگای ئەوەیە کەچەند نوێنەرێکی تێدا هەڵبژێردرێ.

ـ هەرپارتێك دەتوانێبەشداری هەڵبژاردن بکات لەو ناوچانە بەچەند پاڵێوراوێ بێئەوەی یەك لیست کۆیان بکاتەوە .

ـ پارتەکان دەتوانن بەلیست بەشداری بکەن ، بەڵام دەبێدەنگدان بۆتاك بێ (التصويت الفردي ) نەك بۆلست .

٢ـ خەسڵەتەکانی سیستەمی زۆرینە لەسیستەمی تێکەڵاوی لادەر بەلایسیستەمی زۆرینەدا .

ـ هەڵبژێردەر دەبێ دەنگ بۆ یەك پاڵێوراو بدات .

ـ کورسییەکان لەڕێگای زۆرینەوە دابەش دەکرێن .

نموونە :

گریمان لەناوچەیەکی هەڵبژاردن ژمارەی دەنگە ڕاستەکان ١٠٠٠٠٠دەنگ بوو، سێ کورسی تەرخان کراوە بۆئەو ناوچەیە وپێنج پاڵێوراو لەململانێدا بوون ،ئەنجامی دەنگدانیش بەم شێوەیە بوو:-

پاڵێوراوی أ : ٣٠٠٠٠ دەنگی بە دەست هێناوە

پاڵێوراوی ب : ٢٥٠٠٠ دەنگی بە دەست هێناوە

پاڵێوراوی ج : ٢٠٠٠٠ دەنگی بە دەست هێناوە

پاڵێوراوی د: ١٥٠٠٠ دەنگی بە دەست هێناوە

پاڵێوراوی هـ: ١٠٠٠٠ دەنگی بە دەست هێناوە

هەر سێ کورسییەکە بە سەر ( أ ، ب ، ج ) دا دابەش دەکرێ لە بەر ئەوەی لەوانیتر دەنگیان زیاتر هێناوە. ئەو دەنگانەش ( د ، هـ ) هێناویانە دەمێنێتەوە بێ نوێنەر، ئەمەش ناوەڕۆکی سیستەمی زۆرینەیە، ئەوانەی لە سەرەوە باسمان کرد تا ڕادەیەکی زۆر لە سیستەمی هەڵبژاردنی ژاپۆنیدا بەدی دەکرێن .

ب ـ سیستەمی تێکەڵاوی لادەر بەلای سیستەمی ڕێژەییدا :

ئەم سیستەمە لە یاسای هەڵبژاردنی فەرەنسیدا بەدی دەکرێ لە ساڵانی (١٩١٩ و ١٩٥١ ) بە گوێرەی یاسای هەڵبژاردنی ساڵی( ١٩٥١ز ) ، ئەگەر هەر لیستێك ڕێژەی زۆرینەی ڕەها بە دەست بهێنێت (زیاتر لە نیوەی دەنگەکان ) لەو کاتەدا ، ئەوە ئەو لیستە هەموو کورسییەکانی ناوچەی هەڵبژاردن بە دەست دەهێنێ ، ئەمە ئەگەر لیستێك ڕێژەی زۆرینە بە دەست بهێنێ . بەڵام ئەگەر گروپێك لە لیستەکان ڕێژەی زۆرینەی ڕەهایان بە دەست هێنا ، ئەو کاتە کورسییەکان دابەش دەکرێن بە سەر لیستەکاندا بە ڕێگای موعەدەلی بەهێز ( طريقة المعدل الاقوى ) .

بە پێی ئەو یاسایە ، یاسای ساڵی (١٩٥١ز) لە لایەکەوە سیستەمی ڕێژەیی بەدی دەکرێ لە بەر ئەوەی دەنگ دان بۆ لیستە ، لە لایەکی ترەوە سیستەمی زۆرینە بەدی دەکرێ لە بەر ئەوەی دابەش کردنی کورسییەکان لە ڕێگای ئەو سیستەمەوە دابەش دەکرێن.

ج ـ سیستەمی تێکەڵاوی هاوکێش :( الانظمة المختلطة المتوازنة )
ئـەم سیستەمە هـەردوو سیسـتـەمی زۆرینـە و نوێنەرایـەتی ڕێژەیـی تێـدا پـەیڕەو دەکرێ .

ـ سیسـتـەمی زۆرینـە: هـەر دەنگدەرێـك پـاڵێوراوی خـۆی هـەڵدەبژێرێ لـە ناوچـە هەڵبژاردنـە بچووکەکـەی خـۆی ، لـە بازنـە بچووکەکـەی خـۆی ( منطقتـه الانتخابیـة الصغـیرة ) ، بـەم شـێوەیە و بـە گوێـرەی ئـەو سیسـتەمە نیـوەی نوێنـەرەکان هەڵدەبژێردرێن

ـ سیستەمی نوێنەرەرایەتی ڕێژەیی: ئەو نیوەی تری نوێنەرەکان بە گوێرەی ئەم سیستەمە هەڵدەبژێردرێن لە سەر ئاستی وولایەتەکان ، لەم حاڵەتەدا هەڵبژێرەر دەنگ بە لیست دەدات بۆ هەڵبژاردنی نوێنەر .

لەم باسەد بۆمان دەردەکەوێت کە هەر دەنـگ دەرێك دوو بلیتـی هەیـە ، یەکـەمیان بـۆ دەنگدانە بە گوێرەی سیستەمی زۆرینـە، ئـەوی تریـان بـۆ دەنـگ دانـە بـەگوێرەی سیستـەمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی. ئەمە و ئەم سیستەمە لە ئەڵمانیای یەکگرتوو پەیڕەو دەکرا .

# بەشی سێیەم
# بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان و ئەو سیستەمانەی کە لەسەربنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دامەزراوون

.ئەم بەشەم کردوە بە دوو باسەوە ، لە باسی یەکەمدا باسی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دەکەم و لە باسی دووەمدا باسی ئەو سیستەمانە دەکەم کە لە سەر بناغەی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دامەزراوون .

## باسی یەکەم :
## بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان
**( مبدأ الفصل بين السلطات )**

**pricipe de separation des pouvoirs**

وەکو دەزانین و ئەمڕۆ لە بەرچاومانە لە دەوڵەتدا ، دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادوەری (دادگوزاری ) هەیە ، بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکات ، کە دەبێ ئەو سێدەسەڵاتە لە یەك جیابن و هەر یەکەو کاری خۆی بەجیا لەوی تر ئەنجام بدات ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو دەسەڵاتانە هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نەبێ ، بەڵکو دەبێ کارەکانیان بە ئاشکرایی‌و ڕوونی ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی هەر دەسەڵاتێك لەو دەسەڵاتانە ئاگای لە کاروبارەکانی دەسەڵاتەکانی‌تر هەبێت و هەر دەسەڵاتێکیش سنوور بۆ دەسەڵاتەکانی تر دابنێت .

یەکەم هەوڵی پراکتیکی بۆ پەیڕەو کردنی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان لە ئنگلتەراوە سەری هەڵدا لە کاتی حوکمڕانی کرۆمۆیل [1] دژ بە جەوری میرنشینی ،

---

(١) بڕوانە : د. يحيى الجمل ـ الانظمة السياسية المعاصرة ص

بەڵام کاتێ کرۆموێك ڕوخاو میرنشینی گەڕایەوە هەڵسا بە پوچەڵ کردنەوەی دەستووری کۆماری و پرانسیپی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان . هەروەها یەکەم هەوڵی تیۆری دەربارەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان ، هەر لە ئنگلتەراوە سەری هەڵدا لە سەر دەستی جۆن لۆك(١٦٣٢-١٧٠٤) ز لە کتێبەکەیدا (حکومەتی مەدەنی ) ، ئەو بە پێویستی دەزانی ، دەزگای یاسادانان، سەربەخۆ بێ لە دەزگای ڕاپەڕاندن ، هەروەها باسی دەزگایەکی تری کردوەو ناوی ناوە ( دەزگای فیدرالی ) ، کە مەبەستی ئەو دەزگایانە بووە کە کاروبارەکانی دەرەوەو جەنگ و ئاشتییان بەڕێوەدەبرد. بەڵام لەهەمان کاتدا یاسازانەکان دەڵێن، سەرەڕای ئەو بیروبۆچوونانەش ناتوانرێ لۆك بەخاوەنی تیۆری بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان لەقەڵەم بدرێ. ئەمەو ئەفلاتۆن باسی دامودەزگاکانی دەوڵەتی کردوەو بەشەش دامودەزگا لە قەڵەمی داوون . هەروەها ئەرستۆ دامودەزگاکانی دەوڵەتی بەسێ دامودەزگا لە قەڵەم داوە کەئەمانەن :[1]

١. دەزگای یاسا دانان ، کە پێکهاتوە لە کۆمەڵەی گەل (جمعية الشعب) لە سیستەمی دیموکراسی ڕاستەوخۆدا .

٢. دەزگای ڕاپەڕاندن کە کاری جێبەجێکردنی یاساکانی دەکەوێتە ئەستۆ و لەو کەسانە پێك هاتوە کە کۆمەڵەی گەل دیارییان دەکات .

٣. دەزگای دادگوزاری (دادوەری ) کە پێکهاتوە لەو دادگاو دادوەرانەی کە یاسا بەئەنجام دەگەیەنن .

بەڵام مۆنتسکیۆ بە داهێنەری تیۆری بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دادەنرێ ،مۆنتسکیۆ (١٦٨٩-١٧٥٥) ز لە کتێبەکەیدا (گیانی یاساکان ) ساڵی( ١٧٤٨ز ) ، باسی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی لە یەکتر کردوە .

ـ جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەك بە گوێرەی بۆچوونی مۆنتسکیۆ لە سەر بناغەی ڕێکخستنی دەسەڵاتەکان بنیادنراوە ، مۆننتسکیۆ دەڵێت:( لە هەموو دەوڵەتێکدا سێ‌جۆر دەسەڵات هەیە ، ئەگەر هاتوو دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی

---

(١) بڕوانە:د. علي غالب العاني ـ الأنظمة السياسية ص٥٩ .

ڕاپەڕاندن لە دەستی یەك کەسدا بوون، یان لە دەستی یەك دامەزراودا بوون ، ئەوە سەربەستی نامێنێ ، چونکە دەبێتە هۆی ئیستیبداد( استبداد). سەربەستی ڕامیاری لە کاتێکدا دەبێ ، کە حکومەتێکی میانڕەو هەبێ ، حوکم تیایدا ڕەها نەبێ ، دەسەڵات تیایدا بۆ جەور بەکار نەهێنرێت )) . ئەمەو مۆنتسکیۆ گومان لە سروشتی مرۆڤ دەکات ، کاتێ دەسەڵاتی بکەوێتە دەست و دەڵێ : مرۆڤ کاتێ دەسەڵاتی بکەوێتە دەست بە خراپی ڕاڤەی دەکات و بەکاری دەهێنێ تا ئەو ڕادەیەی کەسنوورێکی دیاریکراو ڕایدەوەستێنێ .ئامانجی مۆنتسکیۆ لە ڕێچکەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان بۆ بەدی هێنانی سەربەستی ڕامیاری تاکە کەسەکان و بەدیهێنانی حوکمڕانی میانڕەوە، کە هیچ دەسەڵاتێك نەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم دەسەڵاتەکانی تر داو زاڵ نەبێت بەسەریاندا، لە هەمان کاتدا هاوسەنگی لەنێوان دەسەڵاتەکاندا هەبێ ، لەبەرئەوەی دەسەڵاتی جەور لێکراو بتوانێ بەرامبەر دەسەڵاتی بەکار هێنەری جەور ڕابوەستێ .

وەکو ئاماژەمان پێکرد مۆنتسکیۆ باسی دەسەڵاتەکان دەکات و دەڵێ (( لە هەموو دەوڵەتێکدا سێ جۆر دەسەڵات هەیە ، دەسەڵاتی یاسادانان ، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بۆ ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە یاسای نێودەوڵەتی گشتی یەوە ، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بۆ ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە یاسای شارستانییەوە)) .

لێرەدا مۆنتسکیۆ باسی دەسەڵاتی دادوەری ناکات ، بەڵام کاتێ باسی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دەکا دەڵێ: (( ڕاپەڕاندنی ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە یاسای شارستانییەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پێناسەی دەسەڵاتی داد گوزارییە "دادوەری" )).

لێرەدا بە ڕای من دەسەڵاتی دادوەری تێکەڵی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن کردووە . هەروەها دکتۆر (مونزر ئەلشاوی )[1] دەڵی (( باس نەکردنی مۆنتسکیۆ بۆ دەسەڵاتی دادوەری ئەوە ناگەیەنێ کە ببێتە بەشێك لە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن ، بەڵکو ئەو ( مۆنتسکیۆ ) دەسەڵاتی دادوەری زیاتر بە پاشکۆی یان لکاوی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن داناوە )) .

---

(١) بڕوانە: د.منذر الشاوي ـ نظرية الدولة ص١٩٢ .

- لە ژێر کارتێکردنی بۆچوونەکانی مۆنتسکیۆ.
- دەستووری فەرەنسا سالّی( ١٧٩١ و ١٨٤٧ )ز بە بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاّتەکانی وەرگرتووە .
- جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ لە سالّی( ١٧٨٩ز ) تیایدا هاتووە . هەر گروپێکی ڕامیاری دەستووری نییە ئەگەر زامنی تاکەکانی نەکات و جیاکاری نەکات لە نێوان دەسەلاّتەکاندا .
- دەستووری ئەمەریکاش پاش جەنگی ڕزگاربوونی لە بەریتانیا بە بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاّتەکانی وەرگرتووە .

**- ڕەخنە لە تیۆری مۆنتسکیۆ سەبارەت بە بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاّتەکان :**

هەندێ ڕەخنە ڕووبەڕووی تیۆرەکەی مۆنتسکیۆ بووەتەوە سەبارەت بە جیاکاری نێوان دەسەلاّتەکان ، ئەم ڕەخنانەش ئەمانەن :

١.مۆنتسکیۆ کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی سیستەمی ڕامیاری ئینگلیزییەوە، لەژێر ئەو کارتێکردنەدا خوازیاری لەچوارچێوەدانی دەسەلاّتی ڕەهای میرنشینی بووە لە فەرەنسا، هەروەها بەدی هێنانی سەربەستی ڕامیاری بۆ هاوولاّتیان ، هەر ئەمەش وای لێکرد داوای پرەنسیپی خەیالّی بکا کە دووربێ لە دیفاکتۆی ڕامیارییەوە (الواقع السياسي).

٢.ئامانجی مۆنتسکیۆ لە ڕێچکەی جیاکاری نێوان دەسەلاّتەکان بۆ پاراستنی سەربەستی بوو، بەلاّم ئەوە جێگای ڕەخنەیە، پاراستنی سەربەستی و ڕێزگرتن لە سەربەستی پەیوەندی بە ئایدۆلۆژیای ڕامیاری و بارودۆخی گشتییەوە هەیە .

٣. مۆنتسکیۆ داوای میانەڕەوی ڕامیاری دەکرد لە ناوەوەی دەسەلاّتە ڕەسمییەکاندا، لە کاتێکدا ئەو میانەڕەوییە لە دەرەوەی دامەزراوە ڕەسمییەکاندا پێویستە، وەك هەبوونی گروپەکانی گوشار و پارتە ڕامیارییەکان .

**ـ بۆچوونەکانی ڕۆسۆ دەربارەی دەسەلاتەکان : ـ**

جان جاك ڕۆسۆ لە کتیبەکەیدا ( گرێبەستی کۆمەلایەتی ( العقد الاجتماعي ) ساڵی( ١٧٦٢ز ) کە لە ئەمستردام لە هۆڵەندە دەرچووە دەڵی : ئەو کارە کارێکی یاسایی‌یە ، ئەگەر ئیرادەیەکی گشتییەوە سەرچاوە بگرێ و باسی بابەتێکی گشتی بکا، واتا ئەو کارەی پێی دەوترێت یاسا ، پێویستی بە دووشت هەیە . ئیرادەیەکی گشتی - بابەتێکی گشتی( ادارة عامة - موضوع عام ). ئەم شتەش دەگەڕێتەوە بۆ دەسەلاتی یاسادانان . هەرکارێك یان فەرمانێك بابەتەکەی تایبەت بوو بە تاکە کەسەوە ، ئەوە بە کاروباری بەڕێوەبردن دەژمێردرێ و پەیوەندی بە کاروباری سەروەرییەوە نییە. لێرەشەوە جیاوازی نێوان لۆك و مۆنتسکیۆ لە گەڵ ڕۆسۆدا دەردەکەوێت ، لۆك و مۆنتسکیۆ وا دەبینن کە دەسەلات دەبێ دابەش بکرێ لە نێوان چەند دامەزراوێکدا، کە جیابن و لە نێوانیاندا ململانێ‌هەبێ . بەلام ڕۆسۆ باوەڕی بەوە هەیە، کە دەسەلات دەبێ لە دەستی یەك دامەزراودا کۆببێتەوە کە ئەویش دەسەلاتی یاسادانانە .

ـ دیدوبۆچوونی ڕۆسۆ دەربارەی حکومەت و دابەشکردنی دەسەلات لە سەروەری گەلەوە سەرچاوەی گرتووە . ڕۆسۆ حوکم ڕانی دەداتە گەل . گەل دەبێ خاوەن سەروەری بێ ، گەل دەبێ خاوەن حوکمڕانی بێ ، لە بەر ئەوە سەروەری تەنها بە دەسەلاتی یاسادانانەوە بەستوەتەوە و بەرز و باڵادەست تری کردوە بە سەر دەسەلاتە کانی‌تردا .

بە گوێرەی ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد، ڕۆسۆ یەکسانی سەربەخۆیی ڕادەیی نێوان دەسەلاتەکانی نەکردووەتە بناغە بۆ دابەشکردنی دەسەلاتە کانی دەوڵەت ئەمەش وەك و لە سەروە باسمان کرد ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕۆسۆ سەروەری کردووەتە بناغەیەك بۆ دابەش کردنی دەسەلاتەکان . هەروەها (جیمس مارسن) هەرسێ دەسەلاتی ڕاپەڕاندن و یاسادانان و دەسەلاتی دادوەری دەسەلمێنێ . بەلام جۆرە هەماهەنگییەك لە نێوان ئەو دەسەلاتانەدا بەڕەوا دەبینێ ، وای بۆ دەچێ جیاکردنەوەی تەواو لە نێوان دەسەلاتە جۆربەجۆرەکان لەبار نییە لە دیمۆکراسیدا .

## ـ هەڵسەنگاندنی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکان ـ

جیاکاری نێوان دەسەلاتی یاسادانان و دەسەلاتی ڕاپەڕاندن لە سەدەی (١٨) یەمدا سەری هەڵدا [١] ئامانجی ئەو جیاکاری یە لە چوارچێوەدانی دەسەڵاتی ڕەهای میرنشین بوو، بە دۆزینەوەی ئەنجومەنێك ، کە دەسەڵات لە گەڵ میرنشیندا بە ڕێوەبەرێ و لە هەمانکاتدا ڕووبەڕووی ببێتەوە. ئەوجیاکارییە تیۆریە زیاتر لەوەی کە لە ڕاستی و دیفاکتۆدا هەبێ. چونکە ڕاستی ئەمڕۆ وا دەردەخات ، کە دەسەڵاتی یاسادانان دابەش بوە بە سەر دەسەلاتی یاسادانان و دەسەلاتی ڕاپەڕاندندا ، بۆ نموونە (٩٠ ٪ )ی ئەو یاسایانەی کەپەرلەمانی ئینگلیزی دایناوون لەو پرۆژە یاسایانەوە هاتوون کە وەزارەت پێشنیاریانی کردووە.

هەروەها وەزیفەی دادوەری ناتوانرێ بە وەزیفەیەکی سەربەخۆ دابنرێ ، یان بە وەزیفەی سێیەم لە دەوڵەتدا ، لەبەر ئەوەی ئەرکی ئەو وەزیفەیە گونجاندن ، یان بە شێوەیەکی ڕێکتر جێبەجێکردنی ئەو یاسا گشتییانەیە کە وەزیفەی یاسادانان دایان دەنات، ئەو سەربەخۆییەی دادگا هەیەتی کە خزمەتێکی گشتی دەکات ، پێویستییەکانی ئەو خزمەتە دەیسەپێنێ و زیاتر لە هەلو مەرجی تاکتیکییەوە سەرچاوەی گرتووە . هەروەکو سەربەخۆیی دامەزراوە گشتی‌یەکان ، چۆن ئەو دامەزراوانە پێویستییان بە جۆرە سەربەخۆییەك هەیە. هەروەها وەزیفەی دادوەری وەك پاشکۆیەك بۆ وەزیفەی ڕاپەڕاندن لەوەدا دەردەکەوێ ، ئەو بڕیارانەی لە وەزیفەی دادوەرییەوە دەردەچن جێبەجێ کردنیان لە سەر ئارەزووی هەڵسوڕێنەرانی کاروباری ڕاپەڕاندن دەوەستێ .

ئەمەو وەزیفەی دادوەری بەشێکە یان لقێکە لە وەزیفەی ڕاپەڕاندن؛ چونکە ئەرکی سەرەکی وەزیفەی دادوەری گونجاندنی یان جێبەجێکردنی یاسایە ئەوەش خۆی لە خۆیدا کاری ڕاپەڕاندنە. لەڕاستیدا لێرەدا دابەش کردنی کارەکان هەیە نەك وەزیفەی

---

[١] (١)بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ص١٩٥.

جیاواز. وەزیفەی ڕاپەڕاندن وەکو ئامێرێکی بەڕێوەبردن کاری بەڕێوەبردن دەگرێتە ئەستۆ. وەزیفەی دادوەریش وەکو ئامێرێکی دادوەری کاری دادوەری دەگرێتە ئەستۆ .

هەروەها د.ئیبراهیم دەروێش دەربارەی بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دەڵێت[1] :

١.ئەم بنچینەیە دەبێتە هۆی پەرش و بڵاوبوونی دەسەڵات و دابەش بوون و ونبوونی لە نێوان چەند دامەزراوەیەکی جۆربەجۆردا .

٢.ئەم ڕێچکەیە ئەنجامی تەجروبەی کارکراوە ڕامیارییەکانە لە هەندێ قۆناغی دێرۆکیدا. جا لە بەر ئەوە ئاسۆیەکی ڕوون و ئاشکرای نییە. هەروەها دەڵێ : شیکردنەوەی کۆتایی بۆ ڕێچکەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکان دەگاتە ئەنجامێکی دیاری کراوو :

ڕێچکەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتە کان لە جەوهەرو ناوەڕۆکدا لە سەر ئامانجی دیموکراسی و لەسەر دیرۆکی دیموکراسی بنیاد نراوە . بواری جێبەجێکردنێشی حکومەتێکی نوێنەرایەتییە ( حكومة تمثيلية ) .

ـ دفرجیە دەڵێ (( پرەنسیپی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان چ لە ڕووی تیۆریەوە بێ ، چ لەڕووی ڕەسمییەوە بێ تا ئێستا بناغەیەکە لە بناغەکانی یاسای گشتی لە وولاتانی ڕۆژئاوادا، بەڵام ئەو پرانسیپە خەریکە بەرە بەرە بایەخی خۆی لە دەست دەدات لە ڕووی پراکتیکییەوە )).

---

(١) بڕوانە:د. أبراهيم الدرويش ـ النظام السياسي ، دراسة فلسفية سياسية ،ص١٢٨ .

## باسی دووەم
## ئەو سیستەمانەی کە لەسەر بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان دامەزراوون

### بەستی یەکەم
### سیستەمی سەرۆکایەتی [١]

لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا ، سەرۆك لە لایەنِ گەلەوە هەڵدەبژێردرێت ، خاوەن دەسەلاتێکی زۆرو فراوانە ، یاریدەدەری هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا یارمەتی دەدەن . ئەو یاریدەدەرانە سەرۆك خۆی دەستنیشانیان دەکات و بەرپرسیارە لە دەست نیشان کردنیان، بەرپرسیاریشن لە بەردەمیدا ، بۆی هەیە لایشیان بدات ، ئیتر ئەو یاریدەدەرانە ناویان وەزیر، سکرتێر ، هەر شتێکی دیکە بێت .

ئەمە و لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا ئەنجومەنی وەزیران نییە، سەرۆك وەکو ئاماژەمان پێکرد سەرۆکی دەزگای ڕاپەڕاندنە و بە پشت بەستن بە خودی خۆی و یاریدەدەرەکانی هەموو کاروبارەکانی دەوڵەت بەڕێوە دەبات . هەروەها دەزگای یاسادانانیش لە لایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێ ، هەریەکەو لە سەرۆکی دەوڵەت و دەزگای یاسادانان بەجیا کاری خۆی دەکاو هیچ یەکێ لەوانە دەسەلاتی بەسەر ئەوەی دیکەوە نییە، سەرۆکی دەزگای ڕاپەڕاندن بۆی نییە دەستێوەردانی کاروبارەکانی دەزگای یاسادانان بکات ، ناتوانێ پەرلەمان یان یەکێك لە ئەنجومەنەکانی هەڵوەشێنێتەوە، یان دانیشتنەکانی دوا بخات. یان پەکیان بخات. هەروەها دەسەلاتی یاسادانان بۆی نییە دەستێوەردانی کاروبارەکانی سەرۆك و دەزگای ڕاپەڕاندن بکات ، هەروەها بۆی نییە متمانە لە سەرۆك بکێشێتەوە و دەستی لە کار بکێشێتەوە . لە ڕۆشنایی ئەو باسەی سەرەوەماندا دەتوانین جیاکارییەکانی سیستەمی

سەرۆکایەتی بەم خالانەی خوارەوە دیاری بکەین :-

---

(١) بروانە: د.علي غالب العاني ـ الانظمة السياسية ص٧٩.

١.سەرۆکی هەڵبژێردراو لە لایەن گەلەوە .

٢.نەبوونی سەرۆك وەزیران و ئەنجومەنی وەزیران .

٣.نەبوونی کارتێکردنی ئاڵ و گۆڕ لە نێوان دامەزراوەکانی دەسەلاتدا .

ئەمەو هەرچەندە جیاکاری نێوان ئەو دوو دەسەڵاتە لە ڕووی تیۆرییەوە هەبێت، بەڵام لە ڕووی پراکتیکییەوە هاوکاری و هەماهەنگی لە نێوانیاندا بەدی دەکرێت ، هەر وەکو لە باسکردنی سیستەمی سەرۆکایەتی لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بۆمان دەردەکەوێت . ئەوەی ماوە باسی بکەین ئەوەیە ، لەدایك بوونی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دایك بوونی سیستەمی سەرۆکایەتیە، دەستوری ئەو وڵاتە لە ساڵی( ١٧٨٧ ز ) بە بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکانی وەرگرتووەو دەستڕۆیشتووی و تایبەتمەندییەکانی هەر دەسەلاتێکی دیاری کردووە. ئەمەو دەزگاکانی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم دەزگایانەن :

یەکەم : دەزگای ڕاپەڕاندن :

بڕگەی یەك لە ماددەی دوو لە دەستووری ئەمریکا دەڵێ:

سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی دەکەوێتە ئەستۆ ، بۆ ماوەی چوار ساڵ سەرۆکی وڵات دەبێت ، لە هەمان کاتدا جێگری سەرۆك هەڵدەبژێردرێت بۆ هەمان ماوە . پێش ساڵی (١٩٥١ز ) سەرۆك بۆی هەبو چەند جارێك سوود لە هەڵبژاردن وەربگرێ وەکو پاڵێوراوێك بۆ سەرۆکایەتی . بۆ نموونە ، فرانکلین ڕۆزفلت چوارجار خۆی کاندیدکرد بۆ سەرۆکایەتی ، هەر چوار جارەکەش لە هەڵبژاردن سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

بەڵام پاش هەموارکردنی دەستوور لە ساڵی( ١٩٥١ز )و بە گوێرەی ئەو هەموارکردنەوەیە نابێ سەرۆك لە دووجار زیاتر هەڵبژێردرێ ، یان با بڵێین خۆی کاندیدبکات ، ئەم گۆڕانکاریانەش بە پێی هەموارکردنەوەی ژمارە (٢٢) ی دەستوور لە ساڵی (١٩٥١ز ) هاتە کایەوە .

دەبێ سەرۆك لە دایك بووی ولایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا بێ، بەلای كەمەوە دەبێ بۆ ماوەی چواردە سالْ لە وولاْت نیشتەجێ بوبێت ، تەمەنی لە سیو پێنج سالْ كەمتر نەبێت .[١]

ماددەی (١٢) لە دەستوور باسی هەلْبژاردنی سەرۆك دەكات لە وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا :

ـ هەر وولایەتێك بە گوێرەی پەیڕەووپرۆگرامی ناوخۆ چەند دەنگ دەرێك دیاری دەكات ، دەبێ یەكسان بێ بەژمارەی نوێنەرانی ئەو وولایەتە لە كۆنگریسی ئەمریكادا ، دەنگدەران كۆدەبنەوە لە وولایەتەكەی خۆیان ، بە دەنگدانی نەهێنی دەنگ دەدەن بە دوو پالْێوراو كە دەبێ بەلای كەمەوە یەكێ لەو پالْێوراوانە خەلْكی وولایەتەكەی خۆیان نەبێ ، بەو جۆرە هەر وولایەتێك لیستێك بۆ خۆی ئامادە دەكات ، ناوی ئەو كەسانەی تیادایە كە دەنگیان بۆ دراوەو ژمارەی ئەو دەنگانەی كە هێناویانە . پاش سەقامگیر كردنی ئەو لیستانە واژۆ دەكرێ و بەخەتم كراوی ڕەوانەی بارەگای وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەكرێ بە ناونیشانی سەرۆكی ئەنجومەنی پیرانەوە ، لە بەر چاوو تەماشاكردنی ئەندامانی هەردوو ئەنجوومەنی پیران و نوێنەران ، سەرۆكی ئەنجومەنی پیران هەموو لیستەكان هەلْئەتەكێنێ ، ئینجا دەنگەكان دەژمێرێ ، ئەو كەسەی زۆرترین دەنگی هێنابێ ، ئەوەدەبێتە سەرۆكی وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ، ئەگەر هاتوو دەنگەكان یەكسان بوون ، ئەوا ئەنجومەنی نوێنەران بە دەنگدانی نەهێنێ یەكێ لەوانە هەلْدەبژێرێ بۆ سەرۆك .

بە گوێرەی ماددەی (١٢) لە دەستوور ، هەلْبژاردنی سەرۆك كۆماری وولایەتەیەكگرتووەكانی ئەمریكا بە دووقۆناغدا تێدەپەڕێ : -

قۆناغی یەكەمیان : یەكەم جار هەر وولایەتێك بە گوێرەی سیستەمی تایبەتی ناوخۆ ، هەلْبژاردنێكی نەهێنێ ئەنجام دەدات ، بۆ هەلْبژاردنی چەند پالْێوراوێك كە

---

(١) بڕوانە: د. يحيى الجمل ـ الانظمة السياسية المعاصرة ص١٦٠.

دەبێ هەڵبژێردراوەکان ئەندامی کۆنگریسی ئەمریکا نەبن ، واتا نوێنەری ئەو وولایەتە نەبن لە هەردوو ئەنجومەنی نوێنەران و پیراندا ، هەروەها دەبێ ژمارەیان یەکسان بێ بە ژمارەی ئەو نوێنەرانەی کە نوێنەرایەتی ئەو وولایەتە دەکەن لە کونگریسی ئەمریکادا .

لە قۆناغی دووەمدا هەڵبژێردراوانی هەر وولایەتێك دادەنیشن بە دەنگدانی نەهێنیێ دەنگ بۆ دووکەس دەدەن و نابێ ئەو دووکەسە هەردووکیان خەڵکی وولایەتەکەی خۆیان بن ، دەبێ هەر نەبێ یەکێکیان خەڵکی وولایەتێکی دیکە بێ ، واتا دەبێ ئەو دووکەسە یان هەر نەبێ یەکێکیان خەڵکی وولایەتەکەی خۆیان نەبێ ، پاش ئەو دەنگدانە هەر وولایەتێك لیستێ ئامادە دەکات بە ناوی ئەو کەسانەی دەنگیان بۆ دراوە و بە ژمارەی ئەو دەنگانەی هێناویانە ، ئەو لیستانە پاش سەقامگیر کردن و واژۆکردنی، خەتم دەکرێ و دەنێردرێ بۆ بارەگای حکومەتی وولایەتە یەکگرتووەکان بە ناونیشانی سەرۆکی ئەنجوومەنی پیرانەوە ، سەرۆکی ئەنجومەنی پیران لە بەرچاوی ئەندامانی هەردوو ئەنجومەن ، ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران، لستەکان هەڵئەتەکێنی و ناوەکان دەردەخات ، ئەو کەسەی دەنگی زیاتری هێنابێ ، دەبێتە سەرۆکی وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، لە کاتێکدا کەسانێك یان دوو کەس دەنگیان وەکو یەك هێنابێ ، ئەوە ئەنجومەنی نوێنەران بەدەنگدانی نەهێنی یەکێکیان هەڵدەبژێری و دەبێتە سەرۆکی وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، هەرچەندە ئەگەری ڕوودانی ئەو حاڵەتە زۆر دوورە لەبەر ئەوەی لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دووپارتی سەرەکی هەیە و زیاتر ململانێکە دەکەوێتە نێوان هەر دوو پالێوراوی ئەو دوو پارتەوە . یەکێکیان دەنگی زیاتر لەوەکەی دیکەیان دێنێ ، ئیتر ئەو زیادەیە زۆربێ یان کەم .

سەرۆکی وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ساڵانە سەد هەزار دۆلار وەکو موچە ، پەنجا هەزار دۆلاریش وەکو دەرماڵە وەردەگرێ ، موچە و دەرماڵەی سەرۆك باجی لە سەرە ، ئەگەر هاتوو سەرۆك مرد ، یان دەستی لە کارەکەی کێشایەوە ئەوە جێگری سەرۆك ، کە ئەویش هەر لە گەڵ سەرۆکدا هەڵدەبژێردرێ بۆ ماوەی چوار ساڵ جێگای

دەگرێتەوە . کاتێ کەنەدی کوژرا ، جێگرەکەی جۆنسۆن جێگای گرتەوە ، کاتێکیش نلسون ناچار بو دەست بکێشێتەوە لە سەرۆکایەتی ، جیرالدفۆرد جێگای گرتەوە ، هەر لەم ماوەیەدا لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پاش تەقینەوەکانی (٢٠٠١/٩/١١) حکومەتی ئەمریکا هەلسا بەشاردنەوەی جێگری سەرۆك کۆمار بۆ ئەوەی لە کاتی نەمانی سەرۆك کۆماردا بۆشاییەکی دەستووری دروست نەبێت و جێگری سەرۆك جێگای سەرۆك بگرێتەوە .

ئەمەو سەرۆك لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەسەلاتی فروانی هەیە لەوانە:-

توانای دەرکردنی سیستەم ، سەرۆکی بالای دەزگای بەڕێوەبردنە ، هەرخۆی فەرمانبەرە فیدرالیەکان دادەنات و لایان دەبات، سالی (١٨٦٨ز ) سەرۆکی ئەمەریکا ئەندرۆجاکسۆن وەزیری جەنگی لادا هەرچەندە زۆرینەی ئەندامانی کۆنگرس بەرهەلستکار بوون بەلام هیچیان پێنەکرا . هەروەها کاتێ سەرۆکی ئەمریکا(ویلسۆن) نەخۆش بوو ، وەزیری دەرەوە هەلسا بە کۆکردنەوەی وەزیرەکان بە مەبەستی کۆبوونەوە لە گەلیاندا بۆ دانانی نەخشەیەکی گشتی بۆ کار . سەرۆك لە بەرارنبەر ئەوەدا هەلسا بەلادانی لەسەر کارەکەی . بە پێی دەستوور دەبێ ئەنجومەنی پیران هاریکاری سەرۆك بکات بۆ دانانی فەرمانبەرە گشتییەکان، بەلام لە ڕووی پراکتیکییەوە سەرۆك خۆی هەلدەستێ بە ئەنجامدانی ئەو کارە .

سەرۆك سیاسەتی دەرەوە ئاراستە دەکات ، لە دانانی نوێنەرانی دەولەت و کۆنسۆلەکان لە ولاتاندا ، بەلێنکاری دەبەستێ ، ئەمانە هەمووی بە هاوکاری لە گەلْ ئەنجومەنی پیراندا. دان بە دەولەتاندا دەنێ ( اعتراف بالدول)، سەرۆك کۆمار سەرۆکی گشتی سوپایەو لە کاتی جەنگدا دەسەلاتێکی نیمچە دیکتاتۆری هەیە ، مافی بڕیاردانی لێبوردنی هەیە . هەروەها لەبواری کاروباری یاسادانانداا. سەرۆك بۆی هەیە پێشنیاری پرۆژەی یاساییەکان بکات و ئاراستەی کۆنگریسیان بکات بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ، یان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ پێشنیاری پرۆژە یاساییەکان دەکات لە ڕێگای ئەو بەرنامەو پرۆگرامانەی کە سالانە ئامادەیان دەکات و بە شێوەی نامە ئاراستەی

کۆنگرسیان دەکات ، کە لەڕاستیدا ئەو پرۆگرامانە لە پرۆژەی یاسایی پێکهاتوون، یان لە ڕێگای پارتەکەیەوە لە کۆنگریسدا . بەهەر حاڵ دەسەڵاتەکانی سەرۆك لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆرن ، وەکو مامۆستا ولیام ڕیکەر باسی دەکا و دەڵێ نوسینگەی سەرۆك وا کاردەکات هەروەکو ئەوەی نەزانێ بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان چییە ، لەدەستیدا دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن کۆدەبێتەوە و هەروەها بەرپرسیاریەتی سەرەکی لە بواری یاساداناندا دەکەوێتە ئەستۆی . ئەوەندە دەسەڵاتی هەیە بتوانێ زاڵ بێ بەسەر دام و دەزگاکانی تردا .

دووەم : دەزگای یاسادانان[1]

دەسەڵاتی یاسادانان لە وولایەتە یەکگرتووەکانیئەمریکا لە دوو ئەنجومەن پێك دێ ئەنجومەنینوێنەران (Representative) و ئەنجوومەنی پیران (Senate) بەهەردوو ئەنجومەنەکەوە کۆنگریسی ئەمەریکا پێك دێنن .

ـ ئەنجومەنی نوێنەران لە نوێنەرانی هەموو گەلی ئەمریکی پێك دێ ، هەر نوێنەرێك نوێنەرایەتی ( ٤٠٠,٠٠٠) چوار سەد هەزار کەس دەکات ، بەڵام دەبێ هەر وولایەتێك بەلای کەمەوە نوێنەرێکی هەبێ بەچاو پۆشین لە ژمارەی دانیشتوانی، واتا ئەگەر ( ٤٠٠٠٠٠) چوار سەد هەزار کەسیش ژمارەی دانیشتوانی نەبێ .

ماوەی نوێنەرایەتی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا دوو ساڵە ، ئەم ئەنجومەنە لە کاتی ئێستادا لە ( ٤٣٥) ئەندام پێکهاتووە .

ـ ئەنجومەنی پیران لە نوێنەری وولایەتەکان پێك دێ ، هەر وولایەتێك دوو نوێنەری هەیە بە چاوپۆشین لە ژمارەی دانیشتوانی ، ماوەی نوێنەرایەتی لە و ئەنجومەنەدا شەش ساڵە و هەر دوو ساڵ جارێ ( ٣/١ ) ی نوێنەرانی ئەو ئەنجومەنە نوێ دەکرێنەوە.

---

(١) بڕوانە: د. یحیى الجمل ـ الانظمة السياسية المعاصرة ص١٥٥.

د. علي غالب العاني ـ الانظمة السياسية ص٨٢.

ئەنجومەنی نوێنەران لە لایەن جێگری سەرۆکی ئەمریکاوە سەرۆکایەتی دەکرێ. مافی دەنگدانی لە حاڵەتێکدا هەیە ، ئەو حاڵەتەش ئەوەیە ، ئەگەر هاتو دەنگەکان یەکسان بوون ، ئەوکاتە دەنگی سەرۆکی ئەنجومەن لە گەڵ هەر گروپێکدا بێت، ئەوە دەنگی ئەو گروپە سەر دەکەوێت.ئەمەو کاری بناغەیی کۆنگریس یاسادانانە، هەر ئەنجومەنێك لە هەردووئەنجومەنی پیران و نوێنەران بۆی هەیە پێشنیاری پرۆژەی یاسایی بکات .

کاتێ لە لایەن ئەنجومەنی خاوەن پرۆژە پێشنیار کراوەکەوە پرۆژە پێشنیار کراوەکە پەسەندکرا ، ئەوە پێشکەش بە ئەنجومەنەکەی دیکە دەکرێت بۆ پەسەند کردنی ئەگەر پەسەندی کرد ، ئەوە دەخرێتە بەر دەستی سەرۆك کۆمار بۆ ڕاستگۆکردنی ، ئەگەر سەرۆك کۆمار ڕاستگۆی‌کرد ، ئەوە ئەو یاسایە بەکاردەخرێت و جێبەجێ دەکرێت ، بەلأم ئەگەر سەرۆك کۆمار مافی ڤیتۆی بەکارهێنا دەبێ‌ئاماژە بە هۆی ڕەتکردنەوەی پرۆژە یاساییەکە بکات و بیگێڕێتەوە بۆ ئەو ئەنجومەنەی پرۆژە یاساییەکەی پێشنیار کردوە . ئەگەر هاتو هەریەك لە ئەنجومەنی پیران و نوێنەران بە زۆرینەی (٣/٢ ) ی دەنگەکان پرۆژە یاساییەکیان پەسەند کرد ، ئەوە کاری پێدەکرێ و جێبەجێ‌دەکرێت و بەرهەڵستکارییەکەی سەرۆکیش پشتگوێ دەکرێت ، بەلأم ئەگەر کاتێ یەکێ لە ئەنجومەنەکان پرۆژەیەکی یاسایی پێشکەش بە ئەنجومەنەکەی دیکە کردو ئەو ئەنجومەنە پرۆژە یاساییەکەی قەبوڵ نەکرد ، یان تێبینی لە سەر هەبو ، ئەوە لێژنەیەك دادەنرێت کە لە چەند ئەندامێکی هەردوو ئەنجومەن پێك دێت بەیەکسانی لە ژمارەی ئەندامەکانی هەریەك لەو دوو ئەنجومەنە ، ئەو لیژنەیە هەڵدەستێ بە نزیك کردنەوەی بۆچوونەکان دەربارەی پرۆژە پێشنیارکراوەکە ، ئەگەر گەیشتنە ئەنجام ، ئەو کاتە دەبێ لە لایەن هەردوو ئەنجومەنی پیران و نوێنەرانەوە پەسەند بکرێ ، پاش پەسەند کردنی پێشکەش بە سەرۆك کۆمار دەکرێت بۆ ڕاست گۆکردنی و هەمان ڕێ و شوێن ( اجراءات ) وەردەگیرێت کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد.

بێجگە لە کاری یاسادانان ئەنجومەنی پیران هاریکاری سەرۆك دەکات لە دانانی فەرمانبەرە گشتییەکان و بەستنی بەڵێنکاری لەلایەن سەرۆکەوە ، ئەو بەڵێنکاریانەی کە سەرۆك دەیانبەستێ پێویستییان بە ڕەزامەندی (٣/٢ ) ی دەنگەکانی ئەنجومەنی پیران هەیە بۆ جێبەجێکردنیان. لەو میانەیەدا ، دەنگدانی ئەنجومەنی پیران بۆ بە ئەندام بوونی ( وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا )بە ڕەزامەندی ( ٤٩ ) دەنگ بۆ بە ئەندام بوون ، بەرانبەر بە (٣٥) دەنگ بۆ بە ئەندام نەبوون لە کۆمەڵەی نەتەوەکاندا ، بووە هۆی ئەوەی وولایەتەیە کگرتووەکانی ئەمریکا نەبێتە ئەندام لەو دەزگا نێودەوڵەتیەدا هەرچەندە سەرۆك ویلسون ڕۆڵێکی لە بەرچاوی هەبوو لە بەهاتنە کایەی پەیماننامەی ( فەرسای ) و بنیاد نانی کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەڵام بۆ بە ئەندام بوون لە نەتەوە یەکگرتووەکان تەنها دو ئەندام دەنگیان نەدا بۆ بە ئەندام بوون ، بۆیە ئەمریکا بوو بە ئەندام و ئەندامێکی چالاکیش لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا ، ئەنجومەنی نوێنەران دەتوانێ تۆمەت ئاراستەی سەرۆك و گەورە بەرپرسانی حکومەت بکات لە حاڵەتی تاوانی خیانەتی مەزن ، یان هەرتاوانێك دەوڵەت ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوە. لەو کاتەدا ئەنجومەنی پیران دەبێتە دادگاو لە دانیشتنێکی نهێنی دا بە زۆرینەی (٣/٢ ) ی دەنگەکان بڕیار دەدات .

ئەوەی ماوە باسی بکەین ئەوەیە .

لە ئەنجومەنی نوێنەراندا بیست لیژنەی هەمیشەیی هەیە، هەر لیژنەیەك لە (بیست ـ سی ) ئەندام پێکهاتووە. لە ئەنجومەنی پیراندا (١٦) لیژنەی هەمیشەیی هەیە هەر یەکەو لە (١٣) ئەندام پێکهاتووە.

لە ڕاستی دا ئەم لیژنانە زۆرجار بەکارهێنراوون بۆ چاودێری دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن. هەروەها هەندێ کاروبار ئەنجام دەدەن لە کاروباری دەسەڵاتی دادگوزارییەوە نزیك دەبێتەوە ، بۆیە هەندێ کەسان وای بۆ دەچن کە ئەنجامدانی ئەم کاروبارانە جۆرە لادانێکە لە بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەڵاتەکان ، کە دەستوور جەختی لە سەر کردووە.

سێیەم : دەسەڵاتی دادگوزاری ، دادوەری[1]

ماددەی سێ ، بڕگەی یەك لە دەستووری وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ،باسی ئەوە دەكات كە دەسەڵاتی دادوەری دەكەوێتە ئەستۆی دادگای فیدراڵی باڵا و ئەو دادگایانەی كە لە پلەدا لە دادگای فیدراڵی باڵا كەمترن و كۆنگرس بە گوێرەی پێویست دایان دەمەزرێنێ .

ئەمەو دەسەڵاتی دادوەری لە وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ساڵی (١٨٠١ز ) بووە خاوەن كێش و قورسایی خۆی سەپاند كاتێ دادوەر جۆرج مارشاڵ بووە سەرۆكی و لەوپلەیەدا مایەوە بۆ ماوەی ( ٣٥ )ساڵ ، هەر لەو ماوەیەشدا دادگا بڕیاری دا لەسەر چاودێری كردنی لەسەر دەستووریەتی یاساكان ، واتا دادگای فیدرالی باڵا بڕیاری دا چاودێری یاساكان بكات ، ئایا ئەو یاسایانە گونجاوون لە گەڵ دەستووردا ، یان پێچەوانەی دەستوورن ؟. ئەو بڕیارەش تا ڕۆژی ئەمڕۆ پرانسیپێكی بنەڕەتییە لە ژیانی ڕامیاری و یاسایی وولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا. لەساڵی (١٩٣٠ز ) كاتێقەیرانی ئابووری هاتەكایەوە ، سەرۆكی ئەمەریكا ڕۆزفلت هەوڵیدا بۆ چارەسەركردنی ئەو قەیرانە هەندێ یاسا دەربكات ،كەبتوانێ دەستێوەردانی كاروباری ئابووری بكات .بەڵام دادگای فیدراڵی باڵا ، ڕووبەڕووی ئەو هەوڵانەی سەرۆك بووەوە بە بیانوی ئەوەی كە ئەویاسایانە لە گەڵ چەمكی ئابووری ئازادا ناگونجێن ،لەوكاتەدا ڕۆزفلت ئەو هەڵوێستەی دادگای فیدراڵی باڵای بەهەڵوێستێكی وشك و كۆنەپەرستانە لەقەڵەم دابۆیە هەوڵیدا سیستەمی دادگای فیدراڵی بگۆڕێ ،بەڵام ئەو هەولەش سەرینەگرت ، لەبەر ئەوەی گۆڕینی سیستەمی دادگای فیدراڵی باڵا بەهەمان ڕێوشوێن ئەنجام دەدرێكە بۆهەمواركردنەوە لەدەستووردا دەگیرێتە بەر ،بۆئەو كارەش دەبێ كۆنگرس بە (٣/٢) ی دەنگەكان دەنگی لەسەربدات ، هەروەها دەبێ (٤/٣)ی وویلایەتەكان موافەقەی لەسەر بكەن . بەهەر حاڵ دەسەڵاتی دادوەری لە وویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا سەربەخۆیی تەواوی هەیە بەرامبەر هەردوو دەسەڵاتی

---

(١) بڕوانە: د. يحيى الجمل ـ الانظمة السياسية المعاصرة ص١٥٦.

یاسادانان وراپەراندن ،هەروەها دەسەلاتی دادوەری رۆلێکی بەرچاوو وزەق دەبینێ لەژیانی یاسایی ورامیاری لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ،ئەو رۆلەش تائەو رادەیە گەورەو مەزنە ،وای لە هەندێکردوە ناوی وویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بنێن حکومەتی دادوەران (حكومة القضاة) و سەرۆکی دادگای فیدرالی بالا بەکەسایەتی دووەم دوای سەرۆکی دەولەت لە قەلەم بدەن .

## ـ هەلسەنگاندنی سیستەمی سەرۆکایەتی ـ[1]

سیستەمی سەرۆکایەتی لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا،لەسەر بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکان دامەزراوە .سەرۆکی دەولەت بۆی نیە پەرلەمان هەلوەشێنێتەوە وپەرلەمانیش بۆی نییە دەستی سەرۆك لە کاربکێشێتەوە ،لەهەمان کاتدا هاوکاریو هەماهەنگیو تەنانەت چاودێریش لەنێوان دەسەلاتەکانی راپەراندن ویاسادانان ودادوەریدا هەیە .واتا ئەو دەسەلاتانە پێکەوە کاردەکەن و پەیوەندیو هەماهەنگی لە نێوانیاندا هەیەو بەتەواوی جیا نیین لە یەکتر ،لەهەندێ وەخت وکاتی جیاجیاشدا یەکێ لەو دەسەلاتانە توانیویەتی زال ببێ بەسەر گورەپانی رامیارییدا بۆوەخت وکاتێکی دیاریکراو و رۆلێکی زیاتری بینیوە لە دەسەلاتەکانیتر .بۆ نمونە لەسالی (١٩٢٠ـ١٩٣٠ز) دەسەلاتی دادوەری رۆلێکی زیاتری بینیوە لە سیاسەتی وویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا ،تادەسەلاتی راپەراندن و یاسادانان.لە سالی( ١٩٣٧ز-١٩٤٥ز) لەکاتی حوکمرانی رۆزفلت ،دەسەلاتی سەرۆك کۆمار رۆلێکی زیاتری بینیوە لەگۆرەپانی رامیاری وولاتدا تا دەسەلاتی دادوەری ودەسەلاتی یاسادانان .هەروەها لەکاتی هاتنی کەنەدی بۆ سەر حوکم لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا رۆژی ئەمرۆ ،رۆلی سەرۆك کۆمار لە ژیانی سیاسی وولات زیاترە لە هەر دەسەلاتێکی تر ،هەرئەمەش وای کردوە ناوی سیستەمی رامیاری لە وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بنرێ سیستەمی سەرۆکایەتی .لەهەندێ وەخت وکاتی تردا دەسەلاتی یاسادانانیش رۆلی سەرەکی

---

(١) بروانە: د. يحيى الجمل ـ الانظمة السياسية المعاصرة ص١٧٠.

هەبووە لە گۆڕەپانی ڕامیاری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ،زیاتر لەڕۆڵی دوو دەسەلاتەکەی تر .وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد دەسەلاتەکانی ڕاپەڕاندن ویاسادانان ودادوەری بەتەواوی جیا نین لەیەك ،بەڵکو هەندێ هاوکاری وهەماهەنگی هەیە لەنێوانیاندا،بۆیە بە پێویستی دەزانین ئەو هەماهەنگییە بخەینە ڕوو. لەکاتیکدا سەرۆك بەرپرسی یەکەمی دەزگای ڕاپەڕاندنە،بۆی هەیە ڤیتۆ (نقض) بەکاربێنێ دژ بەو یاسایانەی کە کۆنگرس پەسەندیان دەکات ودەخرێنە بەردەم سەرۆك بۆ ڕاستگۆکردنیان (تصديق) .

سەرۆك پێشنیاری پرۆژە یاسایییەکان دەکات لەڕێگای ئەو نامەیەی کە ساڵانە دەیخاتە بەردەم کۆنگرس وباسی ڕەوشی دەوڵەتی فیدراڵی ئەمریکای تیادا دەکات .لەبەرئەوەی سەرۆك سەرۆکی یەکێ لە دووپارتەسەرەکییەکەیە لەسەر گۆڕەپانی ڕامیاری و زۆرجاریش پارتەکەی زۆرینەی کورسییەکانی کۆنگرسی بەردەکەوێ ،لەبەرئەوە سەرۆك دەتوانێ لەڕێگای ئەندامانیپارتەکەیەوە لەکۆنگرسدا ،پرۆژەی یاسایی پێشنیار بکات و زۆرجاریش ئەوپرۆژە یاساییانە دەبنە یاساو پەسەند دەکرێن لەلایەن کۆنگرسەوە.

ئەمەو سەرۆك پەیوەندی بەدەزگای دادوەریششەوە هەیە ،سەرۆك لە گەڵ ئەنجومەنی پیراندا ،ئەندامانی دادگای فیدراڵی باڵا دادەنێن .هەروەها دەسەلاتی یاسادانان پەیوەندی لەگەڵ دەسەلاتی ڕاپەڕندن و دەسەلاتی دادوەری هەیە، ئەنجومەنی نوێنەران دەتوانێ تۆمەت ئاراستەی سەرۆك و گەورە بەرپرسانی حکومەت بکات لە حاڵەتی خیانەتی مەزن وهەر حاڵەتێکی دیکە ،کەمەترسی ڕووبەڕووی وولات ببێتەوە .لەم کاتەشدا ئەنجومەنی پیران دەبێتە دادگاو بڕیار لەسەر ئەو مەسەلەیە دەدات .هەروەها ئەنجومەنی پیران لە گەڵ سەرۆکدا ئەندامانی دادگای فیدراڵی باڵا دادەنێن و دەبێ ئەنجومەنی پیران ڕازیبێ لەسەر ئەو بەڵێنکارییانەی کە سەرۆك لە سەرئاستی نێودەوڵەتی دەیانبەستێ .هەروەها دەسەلاتی دادوەری چاودێری لەسەر دەستورییەتی یاساکان دەکات بەو شێوەیەی کە لە باسەکانی پێشودا باسمان کردووە .

## بەستی دووەم :

## سیستەمی پەرلەمانی[١]

سیستەمی پەرلەمانی لە وولاتێکیمیرنشینییەوە سەری هەڵدا ئەو وولاتەش بەریتانیایە ،بەریتانیا لە چەند قۆناغێکدا لەدەسەلاتێکی میرنشینیتاك ڕەوانەی ڕەهاوە بەرە بەرەو پێشەوەچوو تاگەیشتە سیستەمی پەرلەمانی کە دەسەلاتی تیادا بەکردار بکەوێتە دەستی وەزارەت ،ئەو وەزارەتەی کە لە پەرلەمانەوە هەڵدەقولێت و نوێنەرایەتی زۆرینەی خەڵکی ئەو وولاتە دەکات ،چونکە وەزارەت لە لایەن پارتی زۆرینەوە لە پەرلەماندا پێکدەهێنرێ. لەسیستەمی پەرلەمانیدا وەزارەت دەبێ متمانەی پەرلەمان بەدەست بێنی ،ئەگەر نا ئەوە دەبێ دەست لە کاربکێشێتەوە ،هەروەها وەزارەت بۆی هەیە داوا لەسەرۆك کۆمار(لەدەوڵەتی کۆماریدا)یان میر (لەدەوڵەتی میرنشینیدا)بکات ،پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوەوهەڵبژاردنی نوێبکرێ .

تایبەتمەندییەکانی سیستەمی پەرلەمانی:

سیستەمی پەرلەمانی هەندێ تایبەتمەندی هەیە کەئەمانەن :-

١.هەبوونی سەرۆکی دەوڵەت وسەرۆك وەزیران لە هەمان کاتدا .

٢.لاوازی ڕۆڵی سەرۆکی دەوڵەت .

٣.کارتێکردنی ئاڵوگۆڕ لە نێوان پەرلەمان و وەزارەتدا .

١.هەبوونی سەرۆکی دەوڵەت وسەرۆك وەزیران لە هەمان کاتدا :

وەکو بینیمان لەسیستەمی سەرۆکایەتیدا ،سەرۆکی دەوڵەت سەرۆکی دەسەلاتی ڕاپەڕاندنە ،بەلام لە سیستەمی پەرلەمانیدا ،دوو سەرۆك هەیە ،سەرۆکی دەوڵەت کە سەرۆك کۆمارە لە دەوڵەتی کۆماریدا و میرە (ملك) لە دەوڵەتی میرنشیندا .

---

(١) بڕوانە : د.علي غالب العاني ـ الانظمة السياسية ص٦٥.

هەروەها لە پاڵ سەرۆکی دەوڵەتدا ،سەرۆك وەزیران هەیە ،کە خۆی وەزیرەکان هەڵدەبژێری و پێشکەشی سەرۆکی دەوڵەتیان دەکات، هەرخۆی بە ناوی ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەدوێت لەبەردەم پەرلەماندا وسەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەکات .

٢.لاوازی ڕۆڵی سەرۆکی دەوڵەت :[١]

لەڕاستیدا لاوازی ڕۆڵی سەرۆکی دەوڵەت بەهۆی پێشکەوتنی دیرۆکییەوە لە ئنگلتەراوە هاتە کایەوە.هەتا سەدەی (١٨) هەژدەیەم وەزیرەکان یارمەتیدەرو ڕاوێژکاری میربوون .بەڵام بەهاتنی بنەماڵەی هانۆڤەر بۆ دەسەڵاتداریێتی ئەو وولاتە (١٧١٤-١٨٣٧)زو نەزانینی زمانی ئینگلیزی لەلایەن یەکەم میرەوەو بێکارەیی ئەوەکانی دیکەیان لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا .وای لە وەزیرەکان کرد بێ ئامادەبوونی میر کۆببنەوە. پلەی هەندێ لەو وەزیرانە وا بەرزببوەوە لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمیندا تا بگاتە ئەو ڕادەیەی کە پلەی وەزیری یەکەم بێتە کایەوە .واتا بە پێی پێشکەوتنی دیرۆکی ئەو تایبەتمەندییەی سیستەمی پەرلەمانی هاتە کایەوە ،ئەوەی ڕاستی بێ لەڕووی دەستوورییەوە سەرۆك لە سیستەمی پەرلەمانیدا هەندێ دەسەڵاتی پێدراوە وەکو هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیران ،لادانی وەزارەت ،هەندێ دەسەڵاتی یاسادانان وەکو بەرهەڵستکاری لەسەر یاساکان ، مافی ڕەتکردنەوەی یاساکان ،داواکردنی پەرلەمان بۆ دانیشتنەکانی،مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان .ئەم بۆچوونانە لە دەستووردا هەن ،لەڕووی تیۆرییەوە ڕاستن .بەڵام ڕاڤەکردنی پراکتیکی دەسەڵات لە سیستەمی پەرلەمانیدا ڕۆڵی لاوازی سەرۆك دەخاتە ڕوو ، بۆنموونە :-

سەرۆك ناچارە سەرۆك وەزیران هەڵبژێرێ لەنێوان ئەندامانی ئەو پارتەی کە زۆرینەی هەیە لە پەرلەماندا ،لەکاتێکیشدا ئەگەر دوو پارتی سەرەکی هەبوو ،ئەوە دەبێ سەرۆك وەزیران لەسەرۆکی پارتی زۆرینە لە ئەنجومەندا هەڵبژێردرێ .ئەمەوبۆ

---

(١)بڕوانە: د. يحيى الجمل ــ الانظمة السياسية المعاصرة ص١٧٢.

د. منذر الشاوي ــ نظرية الدولة ص١٧٩.

د. علي غالب العاني ــ الانظمه السياسيه المعاصره ص٦٦-٦٨.

دانانی وەزیرەکانیش لەلایەن سەرۆکەوەسەرۆك دەبێ وەزیر دابنێت لەسەر پێشنیاری سەرۆك وەزیران بەگوێرەی بڕیاری ئەو پارتەی کە زۆرینەی لە پەرلەماندا هەیە یان بەبڕیاری ئەو پارتانەی کەڕێك کەوتوون لە پێکەوەنانی وەزارەتێکی هاوبەش سەرۆك ناتوانێ وەزارەت لابدات لەکاتێکدا ئەگەر ئەو وەزارەتە متمانەی پەرلەمانی بەدەست هێنابێ،ئەگینا خۆی توشی کێشە دەکات .ڕۆڵی سەرۆکیش لەکاری یاسادانانەدا لەڕاستگۆکردنی ئەو بڕیارانە زیاتر نییە کەپەرلەمان پەسەندیان دەکات .هەروەها هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەن (پەرلەمان) نابێ تەنها بەفەرمانی سەرۆك وەزیران نەبێ پاش وەرگرتنی بڕیار لە لایەن وەزارەتەوە.ئەمەو داواکردنی پەرلەمان لەلایەن سەرۆکەوە بۆ دانیشتنەکانی ،ئەوە هەندێ لە دەستوورو زۆربەی یاسای دەوڵەتەکان بەحوکمی یاسا کات وساتی دانیشتنەکانی پەرلەمانیان دیاری کردووە .

٣.کارتێکردنی ئاڵوگۆر لە نێوان پەرلەمان و وەزارەتدا .

لەنێوان پەرلەمانو وەزارەتدا کارتێکردنی ئاڵوگۆڕ هەیە :-

١.بەرپرسیارێتی وەزارەت لەبەردەم پەرلەماندا[1] :-

لەبەرئەوەی لە سیستەمی پەرلەمانیدا وەزارەت دەسەڵاتی ڕاستەقینەی بەدەستە، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ.

ئەم بەرپرسیارەتیەش ، بەرپرسیارەتیەکە لەبەردەم پەرلەماندا ، واتا پەرلەمان چاودێری کاروباری وەزارەت دەکات، ئەویش لەچەند ڕێگایەکەوە ، ئەو ڕێگایانەش ئەمانەن:-

ا.پرسیار :

پرسیار پەیوەندی بەدوو لایەنەوە هەیە : لایەنێکی ، یەکێ لەئەندامەکانی پەرلەمانە کە پرسیارێك دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو ڕووبەڕووی لایەنەکەی دیکە دەکاتەوە ، ئەو لایەنەش یەکێکە لە وەزیرەکان.

---

(١) بڕوانە: د. ابراهيم الدرويش ـ النظم السياسية ، دراسة فلسفية سياسية ص ١٥٨-١٥٩
د. علي غالب العاني ـ الانظمة السياسية ص ٦٨-٧١.

پرسیارکەر بۆی هەیە پرسیارەکەی بکێشێتەوە پێش ئەوەی وەزیری پرسیار ئاراستەکراو وەڵامی بداتەوە ، ئەگەر وەزیر وەڵامی دایەوە ، پرسیارکەر بۆی هەیە تەنها یەك جار قسە لەسەر ئەو وەلامە بکات، نابێ هیچ ئەندامێکی تری پەرلەمان بەشداری ئەم پرسیارو وەلامدانەوەیە بکات.

ئەگەر هاتوو وەلامی وەزیر کزو لاوازو ڕوون نەبوو، بۆ پرسیارکەر هەیە بابەتی پرسیارەکەی بکاتە وەڵامدانەوە.

ب.وەڵامدانەوە :

وەکو باسمان کرد کاتێ وەڵامی وەزیر شیاوو ڕوون نەبوو ، ئەوە پرسیارکەر بۆی هەیە وەڵامی وەزیر بکاتە وەڵامدانەوە لەبەر ئەوەی وەڵامدانەوە ئاکامی ترسناکی لێدەبێتەوە، ئەوە وەزیر ماوەی دەدرێتێ وەڵامەکەی ئامادە بکات بۆ دانیشتنێکی دیکە پاش ئەو دانیشتنەی کە وەڵامدانەوە تیایدا دەخرێتە ڕوو. وەڵامدانەوە بە تۆمەتێك دەست پێدەکات سەبارەت بە کەم تەرخەمی یان ئیهمال بوون و لادان لەهەر یاسایەك لەلایەن یەکێ لە وەزیرەکانەوە.

پاش تۆمەت ئاراستە کردن بۆ وەزیر ماوەی دەدرێتێ لە دانیشتنێکی دیکەدا وەڵامی خۆی ئامادە بکاتو بۆچوونەکانی لەبەردەم پەرلەماندا بخاتەڕوو ، پاش ئەو وەڵامە لە دانیشتنێکی دیکەدا پەرلەمان گفتوگۆ لەسەر وەڵامی وەزیر دەکات، لەم گفتوگۆیەدا بۆ هەموو ئەندامانی پەرلەمان هەیە بەشداری بکەن. ئەگەر هاتوو وەڵامی وەزیر پەسەند نەکراو لەجێگای خۆیدا نەبوو. ئەوە سەرۆك وەزیران پاش ڕاسپاردنی لەلایەن وەزیرەکانەوە کێشانەوەی متمانە دەخاتە دەنگدانەوە لە پەرلەماندا ، ئەگەر هاتوو ئەنجامی دەنگدان لە بەرژەوەندی وەزارەت نەبوو، ئەوە دەبێ وەزارەت دەست لە کار بکێشێتەوەو ڕێگا بدا وەزارەتێکیتر دروست بکرێکە

جێگای متمانەی پەرلەمان بێت، لەبەرئەوەی بەرپرسیارێتی هاوبەشە، کێشانەوەی متمانە لە وەزیر، واتا کێشانەوەی متمانە لە وەزارەت.(١)

ج. لێکۆڵینەوە :

ئەنجومەن پێش ئەوەی وەزیرو وەزارەت تۆمەتبار بکات ، لیژنەیەك پێکدێنێ بۆ لێکۆڵینەوە لەبابەتی وەڵامدانەوەکە . بۆئەو مەبەستەش پشت بەهەموو بەلگەیەك دەبەستێ ، پاشان ئەنجومەن بە ووردەکاری ئەو ڕاپۆرتە دەخوێنێتەوە کە لیژنەکە پێشکەشی دەکات، ئەگەر هاتوو ڕاپۆرتەکە ئیسپاتی کەم تەرخەمی وکەم و کورتی وەزیری کرد، ئەوە ئەو کاتە ئەنجومەن، وەزیر ولەبەرئەوەی بەرپرسیارێتی وەزارەت هاوبەشە وەزارەتیش تۆمەتبار دەکات ، تۆمەتبارکردنیش واتا کێشانەوەی متمانە لە

---

(١) لەسایەی دەسەلاتی ئەدواردی سێیەم لەساڵی (١٣٧٦ ز) ئەنجومەنی گشتی دەیتوانی تۆمەت ئاراستەی یەکێ لە وەزیرەکان بکات بەوە کە تاوانێك یان گەورە کەتنێکی کردووە، تا لەبەردەم ئەنجومەنی لۆردەکاندا دادگایی بکرێت، کە زۆرجار بڕیاری بەندی نشین کردن یان لە سێدارەدانی دەدرا، بەڵام دوایی بینیان ئەم سزایە گران و قورسە، بۆ لادانی وەزیری پەسەندنەکراو ، ئەنجومەنی گشتی ، وەزیری ناپەسەندی ئاگادار دەکردەوە کە لەوەیە ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتی گەورە کەتن بکرێتەوە، ئەو کاتە وەزیر بەو ئاگادارکردنەوەیە دەستی لەکار دەکێشایەوە. تائێرە بەرپرسیارێتی وەزیر، بەرپرسیارێتیەکی تاکەکەسی بوو، تائەو کاتە وەزارەت دەزگایەکی سەربەخۆو یەکگرتوو نەبوو، بەڵام لەساڵی( ١٧١٤ز ) وە کاتێ میر بەشداری دانیشتنەکانی وەزارەتی نەدەکرد ، ڕێگای خۆشکرد بۆئەوەی کەسێکی‌تر وەزارەت بەڕێوە بەرێت و نوێنەرایەتی وەزارەت بکات لەبەردەم ئەنجومەنی گشتی‌دا، لەوکاتەدا بەرپرسیارێتی وەزیر بووە بەرپرسیارێتیەکی ڕامیاری -جینائی- هەروەها بووە بەرپرسیارێتیەکی ڕامیاری بەکۆمەڵ (جماعی) ، لەبەرئەوەی وەزارەت بووە دەزگایەکی سەربەخۆو جەماعی ، بەرپرسیارێتی بەکۆمەڵ هاتەکایەوە ، واتا هەموو وەزارەت بەرپرسیارە لەکارو کرداری هەر وەزیرێك لەو وەزارەتە، تۆمەت ئاراستەکردن بۆ وەزیرێك و دەست کێشانەوەی ئەو وەزیرە لەکار دەست کێشانەوەی وەزارەتە بەگشتی.

وەزارەت، لەوکاتەدا وەزارەت دەبێ دەست لەکار بکێشێتەوە، بەلام ئەگەر هاتو ڕاپۆرتەکە هیچ ئاماژەیەکی تێدانەبوو سەبارەت بە کەموکورتی و کەمتەرخەمی وەزیر، یان ئەنجومەن قەناعەتی بە ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکە نەکرد، ئەوە ئەو کاتە ، بابەتەکە پەردەپۆش دەکرێتو کۆتایی پێدەهێنرێت.

٢.مافی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەن:

وەزارەت یان دەزگای ڕاپەڕاندن ئەم مافەی پێدراوە لەبەرئەوەی هاوکێش بێت لەگەڵ دەزگای یاسادانانو نەکەوێتە ژێر ڕەحمەتی ئەو دەزگایەوە، وەزارەت بۆی هەیە داوا لەسەرۆك کۆمار بکات ئەنجومەن هەڵوەشێنێتەوە، ئەوەش لەکاتێکدا دەبێ وەزارەت درك بەوە بکات، ئەنجومەن بووەتە کۆسپ لەڕێگای بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا، یان وەزارەت بیەوێ پشتگیری باشتری هەبێ لەپەرلەمانەوە، لەپێناو ئەوەدا هەلێك دەقۆزێتەوە بە تایبەت لەوکاتانەی کە بزانێ جەماوەرێکی زیاتر پشتگیری دەکەن، ئەوکاتە هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنو پێکهێنانی ئەنجومەنێکی تازە لەوەیە ببێتە هۆی زیادبوونی ئەندامانی ئەو پارتەی کە وەزارەتی لێ پێکهاتووە، ئەوەش دەبێتە هۆی زیاتر پاڵپشتی وەزارەت لەلایەن پەرلەمانەوە، ئەمەو وەزارەت سەرفراز نیيە لە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان لەهەر کاتو ساتێکدا ، بەڵکو دەبێ پێبەند بێ بەچەند بنەمایەکەوە کە بۆی دیاریکراوە ، پاش ئەوەی باسای سیستەمی پەرلەمانیمان کرد بە شێوەیەکی گشتی، بە پێویستی دەزانین باسی سیستەمی پەرلەمانی ئینگلیزی بکەین بۆزیاتر ئاشنابوون بە ئەو سیستەمە.

## سیستەمی پەرلەمانی بەریتانیا

سیستەمی ڕامیاری بەریتانیا لەچەن سەدەیەکدا بەپێی چەند قۆناغێك لە سیستەمی میرنشینی ڕەهاوە هەنگاوی نا تا دروستبوونی ئەنجومەنی لۆردەکان و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی گشتی (مجلس العموم)، پاشان دەسەلاتی بەرفراوانی وەزارەت، ئەو وەزارەتەی کە لە ئەنجومەنی گشتییەوە هەڵدەقوڵێ ، ئەمەو سیستەمی ڕامیاری لەو وولاتەدا لەسەرەتادا میرنشینی ڕەهابوو ، پاشان هەبوونی هەندێ ئەنجومەن لەپاڵ میرنشیندا، پاشان هاتنەکایەوەی پەرلەمانێکی هەڵبژێردراو لە لایەن گەلەوە ، کە

وەزارەت بەرپرسیارە لە بەرامبەریدا ، ئەو وەزارەتەی کە لەخودی پەرلەمانەوە هەڵدەقوڵێ و دەبێ متمانەی پەرلەمان بەدەستبێنێ.

قۆناغی یەکەم بەدرێژترین قۆناغ دەژمێردرێت لەمێژووی دەسەڵاتی بەریتانیادا ، سیستەمی ڕامیاری لەو وڵاتەدا لەساڵی (١٠٦٦ز) ەوە تا سەرەتای سەدەی حەڤدەیەم دەسەلاتی میرنشینی ڕەهابوو، میر دەسەلاتی ڕەهای هەبوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەت و هەندێ ئەنجومەنی ڕاوێژکارانە هەبوون، بەڵام لە دەسەڵاتی میریان کەم نەدەکردەوە ، تەنها یارمەتیدەری بوون ، میر جیمسی یەکەم دەربارەی دەسەلات لەساڵی (١٦٠٩ز) ووتویەتی: "میرەکان لەبان کورسی خودا دادەنیشن لەسەر زەمین".

هەروەها شارلی یەکەم ساڵی (١٦٢٥ز) ووتویەتی:- "دەسەڵاتداریێتی ڕەها تەنها مافی میرەکان نییە، بەڵکو ئەرکێکە دەکەوێتە سەرشانیان".

ئەمەو بەهاتنی حوکمی دکتاتۆریەتی کرۆمۆیل و لەسێدارەدانی شارلی یەکەم لەساڵی( ١٦٤٩ز ) قۆناغێکی نوێ هاتەکایەوە، بەتایبەت کاتێ خێزانی ئورانج هاتە سەر دەسەڵات. لەم ماوەیەدا میر لەسەرەتای ساڵی( ١٦٨٩ز ) واژۆی لەسەر یاسایەك کرد، کە هاوکاری دەسەڵاتی پەرلەمان بکاتو باخوبەرییەرەکانی ( امتیازات ) میر کەم بکاتەوەو بیرۆکەی دامەزراندنی دادگا تایبەتییەکان هەڵوەشێنێتەوەو بە شتێکی ناڕەوا لە قەڵەمی بدات.

هەر لەم کاتەدا سیستەمی وەزارەت سەری هەڵداو گەشەی کرد، میر بەئارەزووی خۆی سەرۆك وەزیرانی هەڵدەبژارد بێئەوەی پێبەندبێ بە زۆرینەی یەکێ لە دوو پارتە سەرەکییەکانی پەرلەمانەوە .

لەسەر سەرۆك وەزیران بوو، هەوڵ بدات متمانەی پەرلەمان بەدەست بێنێ و زۆرینەی ئەندامانی پەرلەمان بەلای خۆیدا ڕابکێشێ بەهەرجۆرێك بێت. لەبەرچاوترین وەزارەتەکانی ئەوکاتە، وەزارەتەکەی ( سێر رۆبرت وەلپۆل ) بوو کە بیست ساڵ دەسەڵاتی بەڕێوەبرد لەکاتی حوکمڕانی هەردوو میر جۆرجی یەکەمو جۆرجی دووەم، جۆرجی یەکەم لەبەرئەوەی زمانی ئینگلیزی نەدەزانی

سەرپەرشتیو سەرۆکایەتی دانیشتنەکانی ئەنجومەنی وەزیرانی نەدەکرد ، تەنها واژۆی بڕیارەکانی ئەنجومەنی وەزیرانی دەکرد بە تایبەت پاش ئەوەی بەرەبەرە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن لەو وڵاتەدا کەوتە دەستی ، ئەمەو جۆرجی دووەم هەروەکو جۆرجی یەکەم ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەدەبینی لە بەڕێوەبردنی دەسەڵات لە وڵاتدا. بەڵام کاتێ جۆرجی سێیەم هاتە سەر حوکم ، ئەو میرە زمانی ئینگلیزی دەزانی ، بۆیە هەوڵیدا هەندێ دەسەڵاتی میر بگێڕێتەوە ، داوای لە ولیەم پیت کرد وەزارەتێك پێکەوە بنێت، ولیەم پیت وەزارەتێکی پێکەوەنا، ئەو وەزارەتە ڕەزامەندی میری لەسەربوو، بەڵام ڕەزامەندی تەواوی پەرلەمانی لەسەر نەبوو، بۆیە کاتێ بودجەی ساڵانەی خستە بەردەم پەرلەمان بۆ دەنگدان، بەیەك دەنگ زیادە بڕیاری لەسەردرا، بۆیە ولیەم پیت داوای لە میرکرد پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە و هەڵبژاردنی نوێ بکرێ ، کاتێ میر پەرلەمانی هەڵوەشاندەوەو هەڵبژاردنێکی نوێ کرا، ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بە زۆرینەی ڕەها لە بەرژەوەندی ولیەم پیت کۆتایی پێهات.

ئەمەو قۆناغی سێیەم بەرەبەرە هاتەکایەوەو تا کامڵو سەقامگیرتر بوو لەسایەی دەسەلاتی میر ڤیکتۆریا کە (٦٠) ساڵ دەسەلاتی بەڕێوەبرد (١٨٣٧-١٩٠١)ز .

وەکو زانراوە لە بەریتانیا دەستوورێکی نووسراو نییە، لەو وولاتەدا دەستووری عورفی هەیە، هەرچەندە وەکو لەسەرەوەش ئاماژەمان پێکرد، هەندێ بەڵگەنامەی نوسراو هەیە لەوانە – بەڵگەنامەی مەزن (الميثاق الاعظم) ی ساڵی( ١٢١٥ز ) ، بەڵگەنامەی مافەکان (١٦٢٩، ١٦٨٩ز) هەروەها دوو بڕیاری پەرلەمان لە ساڵانی (١٩١١، ١٩٤٩ز) ، ئەو دوو بڕیارەی کە ئەنجومەنی لۆردەکانی لە هەموو دەسەڵاتێك دابڕی و تەنها بووە ئەنجومەنێکی فەخری. سیستەمی هەڵبژاردنی ئینگلیزی بە سیستەمی زۆرینەی سادە (یەك خول) وەردەگرێ ،ئەو سیستەمەش وا دەکات ململانێ بکەوێتە نێوان دوو پارتی بەهێزەوەو سەرکوتکردنی بەردەوامی پارتە بچووکەکان ، هەر ئەو سیستەمەش بووەتە هۆی هەبوونی دوو پارتی سەرەکی لە بەریتانیا (پارێزگارانو کرێکاران).

سیستەمی پەرلەمانی ئینگلیزی لەچەند دامودەزگایەك پێکدێت لە باسکانی داهاتوماندا شیدەکەینەوە:-

**یەکەم: میر (الملك)**

بە گوێرەی ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر سیستەمی ڕامیاری ئینگلیزدا هاتوون لەساڵی (١٢١٥ز) ەوە تاوەکو ساڵی( ١٩٤٧ز ) ، میر کە خاوەن دەسەلاتێکی ڕەهابوو بەرەبەرە ڕۆڵی میر کزولاوازبوو ، تالەگەڵ ڕۆژدا وای لێهات ، تەنها ڕۆڵێکی کاکڵەیی بگێڕێ لەسیستەمی ڕامیاری ئینگلیزدا و وەکو ڕەمزێکی یەکێتی نیشتمانی لەقەڵەم بدرێ، چ لە بواری یاسادانانندا بێ ، چ لە ڕووی سیاسەتی ناوەوەو دەرەوەی وولاتدا بێ.

میر لە پەرلەماندا وتاری خاوەن شکۆ دەخوێنێتەوە و سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەی وولات دەخاتەڕوو، بەلام ئەم وتارە لەلایەن وەزارەتەوە ئامادە دەکرێ، میر تەنها ئەرکی خوێندنەوەی دەکەوێتە ئەستۆ، هەروەها پەرلەمان دەسەلاتی یاسادانانی لەدەستە بەشێوەیەکی تەواو. هەرچەندە ئەو یاسایانەی پەرلەمان دەریان دەکات، دەبێ بخرێنە بەردەم میر ، بەلام میر دەبێ واژۆی لەسەر بکات بێ لێکۆڵینەوە.

**دووەم : پەرلەمان**

پەرلەمان : پەرلەمانی ئینگلیزی لە دوو ئەنجومەن پێکدێ ، ئەم دوو ئەنجومەنەش ئەمانەن:-

**ئەنجومەنی لۆردەکان:** ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە لە ڕێگای دانان و وەرەسەوە دەبنە ئەندام.

لەکاتی ئێستادا دانانی ئەو ئەندامانە بەتەنها مافی میر نیەو بەڵکو وەزارەت پێشنیاری ئەندامەکانی دەکات بۆئەوەی میر لەو ئەنجومەنەدا جێگەیان بکاتەوە، ئەو ئەندامانەی کە وەزارەت پێشنیاریان دەکات ، وەکو بەرامبەرێك و پاداشتێکە بۆ ئەو خزمەتانەی کە بۆ وولات کردوویانە. لە ڕاستیدا ئەم ئەنجومەنە بەگوێرەی ئەو گۆڕانکاریانەی لەساڵانی (١٩١١- ١٩٤٩ز ) ەوە هاتونەتە کایەوە، لە ئەنجومەنێکی خاوەن دەسەلاتەوە بووەتە ئەنجومەنێکی فەخری دابراو لەهەموو دەسەلاتێك.

لەساڵی( ١٩٠٩ز ) ئەنجومەنی لۆردەکان ئەو بودجەیەیان ڕەتکردەوە کە ئەنجومەنی گشتی بڕیاری لەسەردابوو و پەسەندی کردبوو، هەرچەندە ئەو بودجەیە لەسەر بەرنامەیەکی پێشکەوتووخوازانە دامەزرابوو، باجی دەخستە سەر کۆمپانیاکان و کانزاکانو داهاتەکان، هۆی ڕەتکردنەوەی لەلایەن ئەنجومەنی لۆردەکانەوە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەو بودجەیە ، ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە خۆیانی دەگرتەوە، لەبەرئەوەی خۆیان خاوەن کۆمپانیاکان و کانزاکان بوونو داهاتی باشیان هەبوو، بۆیە ئەو بودجەیەیان ڕەت کردەوە بە (٣٥٠ )دەنگ بەرامبەر بە( ٧٥ )دەنگ.

ئەم کێشەو گێرمیە لەنێوان ئەنجومەنی لۆردەکانو ئەنجومەنی گشتیدا بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی گشتیو ئەنجامدانی هەڵبژاردن لەساڵی (١٩١٠ز ) ، لە پڕوپاگەندەی ئەو هەڵبژاردنەدا ئەنجومەنی گشتی داوای کەمکردنەوەی تایبەتکاریو دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی لۆردەکانی دەکرد، کاتێ هەڵبژاردن ئەنجامدرا لە بەرژەوەندی ئەنجومەنی گشتی کۆتایی پێهات . بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەوە یاسای ساڵی( ١٩١١ز ) هاتەکایەوە ، کە ئەنجومەنی لۆردەکان لەژێر گوشاری زۆردا پەسەندی کرد بە زۆرینەی (١٣١) دەنگ بەرامبەر ( ١١٤ )دەنگ.

بەپێی ئەو یاسایە ئەنجومەنی لۆردەکان هیچ دەسەلاتێکیان بەدەستەوە نەما کە پەیوەندی هەبێ بە کاروباری داراییەوە، ئەو کاروبارانە دەکەونە ئەستۆی ئەنجومەنی گشتییەوە، هەروەها بەپێی ئەو یاسایە دەسەڵاتی ئەنجومەنی لۆردەکان سنووردارکرا بەنسبەت یاساکانی دیکەشەوە ، ئەنجومەنی لۆردەکان تەنها مافی بەرهەڵستکاری بۆمایەوە ، بەرهەڵستکاری ئەو یاسایانەی کە ئەنجومەنی گشتی دەریان دەکات ، بەڵام کاتێ ئەنجومەنی لۆردەکان بەرهەڵستکاری یاسایەك دەکات کە ئەنجومەنی گشتی بڕیاری لەسەرداوەو پەسەندی کردووە، ئەوە پاش بەرهەڵستکاری ئەنجومەنی لۆردەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجومەنی گشتی ، ئەگەر ئەنجومەنی گشتی لە سێ خولی دانیشتنەکانی خۆیدا پەسەندی کرد ، ئەوا بەکاردەخرێو جێبەجێدەکرێ ، سەرەڕای بەرهەڵستکاری ئەنجومەنی لۆردەکان. ئەمەو لەیاسای ساڵی ( ١٩٤٧ز ) ، تەنانەت مافی بەرهەڵستکاری یاساکانیش لەلایەن ئەنجومەنی لۆردەکانەوە

سنوردارکرا، ئەنجومەنی لۆردەکان بەپێی ئەو یاسایە ناتوانێت لەیەك ساڵ زیاتر یاسا ڕابگرێ، کاتێ لە ئەنجومەنی گشتییەوە بڕیاری لەسەر بدرێ و پەسەندبکرێ، پاش ماوەی ئەو ساڵەش ، ئەگەر ئەنجومەنی گشتی پەسەندی بکات ئەوە بەکاردەخرێو جێبەجێدەکرێ.

لەڕاستیدا شێوەی دانانی ئەنجومەنی لۆردەکان ، کە دوورە لە پرانسیپی دیموکراسیو هەڵبژاردنەوەو بێهەڵبژاردن ئەو ئەندامانە دەگەنە ئەو ئەنجومەنە، هەروەها لاوازی ئارەزووی زۆربەی ئەو ئەندامانە لە خۆ خەریك کردن بە کاروباری گشتییەوە ، هەروەها وەکو لە سەرەوەش ئاماژەمان پێکرد بە ئەندام بوونیان لەو ئەنجومەنەدا بێ ململانێو کێبڕکێ ، هۆی لاوازبوونی ئەو ئەنجومەنەیە، کە ئێستا بووەتە ئەنجومەنێکی فەخری ، کە هەندێ یاسازانەکان هەبوونو مانی بە شتێکی زیادە لە قەڵەم دەدەن.

ئەوەی ماوە دەربارەی ئەنجومەنی لۆردەکان بیڵێین ئەومیە، هەرچەندە ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە دەوروبەری هەزار کەس دەبن بەڵام لە کۆبونەوەکاندا تەنها (٤٠-٥٠) کەسیان ئامادەی ئەو کۆبونەوانە دەبن.

–ئەنجومەنی گشتی :

ئەم ئەنجومەنە لەلایەن میلەتەوە هەڵدەبژێردرێ ، تا ساڵی( ١٩١١ز ) بۆ ماوەی حەوت ساڵ هەڵدەبژێردرا ، بەڵام پاشان بوو بە پێنج ساڵ ، ژمارەی ئەندامەکانی (٦٣٠) ئەندامەو بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێن. ئەم ئەنجومەنە ئەرکی یاسادانانو چاودێری ڕامیاری لەسەر کاروباری وەزارەتدەگرێتە ئەستۆ. هەر پرۆژەیەکی یاسایی لە ئەنجومەنی گشتیدا دووجار دەخوێندرێتەوە ، پاشان دەدرێتەلێژنەیەك لە ناو ئەنجومەندا ، دەخرێتە بەردەم ئەنجومەن لەگەڵ ڕاپۆرتێکدا ، کە لیژنەکە ئامادەی دەکات، پاشان بۆ جاری سێهەم لەبەردەم ئەنجومەندا دەخوێندرێتەوە، دوایی ئەنجومەن دەنگی لەسەر دەداتو ڕەوانەی ئەنجومەنی لۆردەکانی دەکات، ئەگەر ئەنجومەنی گشتی پرۆژە یاساییەکەی پەسەندکردو ئەنجومەنی لۆردەکان بەرهەڵستکاری نەکرد، ئەوە ڕەوانەی میر دەکرێ بۆ خەتم کردنیو پاشان بەکاردەخرێ.

هەر لەم ئەنجومەنەوە وەزارەت هەڵدەقوڵێ لە سەرۆکەوە تا وەزیرەکان.

## سێیەم : وەزارەت

پێکەوەنانی وەزارەت لە سیستەمی ئینگلیزیدا پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە دەرئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی گشتییەوە (مجلس العموم)، پاش هەڵبژاردن میر بانگی سەرۆکی پارتی زۆرینە دەکات کە وەزارەت پێکەوە بنێت، سەرۆکی پارتی زۆرینە لیستی وەزارەتەکەی دەخاتە بەردەست میر، کە دەبێ بێ گفتوگۆ ڕاستگۆی (مصادقة) بکات.

لە ڕاستیدا لەهەموو سیستەمێکی دیموکراسیدا وەزارەتێکی ئامادەکراو هەیە ، چ وەزارەتی پارتی دەسەڵات بەدەست بێت چ وەزارەتی پارتی بەرهەڵستکار، کە پێی دەڵێن حکومەتی سێبەر (حکومة الظل) ، ئەوەلە کاتی پێویستدا ئەو وەزارەتە ئامادەکراوە دەخرێتە ڕوو و حکومەتی لێ پێکەوە دەنرێ ، وەزارەت لە سیستەمی ئینگلیزیدا دەسەڵاتی بەرفراوانی هەیە، تا ڕادەیەك هەندێ لە یاسازانان ، کە یەکێ لەوانە مامۆستا ( ئەندریە هۆریۆیە)، بە میراتگری دەسەلاتی میرنشینی دادەنێ ، ئەم دەسەڵاتە بەرفراوانەی وەزارەت وایکردووە ، وا لێکبدرێتەوە کە پەرلەمان لە بەرامبەر وەزارەتدا لاوازو نابەرامبەرە ، بەڵام لە ڕاستیدا پێکهاتەی سیستەمی ئینگلیزی وایکردووە پەرلەمان ڕووبەڕووی وەزارەت نەبێتەوە، لەبەرئەوەی وەکو لەسەرەوە باسمان کرد وەزارەت لە پارتی زۆرینە پێکدێ لە پەرلەماندا، ئەوەش وا دەکات پەرلەمان پشتگیریو هەماهەنگی وەزارەت بکات لە کارەکانیدا.

پێکهاتەی وەزارەتی ئینگلیزی تایبەتمەندی خۆی هەیە ، لە گەلێك وەزیرو جێگری وەزیرو وەزیرەکانی دەوڵەت پێکدێ، کە هەندێجار دەگەنە (١٠٠) وەزیر ، بەڵام وەزیرە ڕاستەقینەکان نزیکی (١٥-٢٠) کەس دەبن.

ئەمەو لەکاتی قەیرانەکاندا وەزیرەکان کەم دەکرێنەوە ، تەنها ئەم وەزارەتانە دەمێننەوە جگە لە سەرۆك وەزیران (بەرگری ، دارایی، ناوخۆ ، دەرەوە).

ئەنجومەنی وەزیران لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا (٥) وەزیر بوون و لە جەنگی جیهانی دووەمدا (٥-٨) وەزیر بوون.بەهەرحاڵ ئەوەی ماوە لە کۆتاییدا بیڵێین :-

کاتێ باسی سیستەمی ڕامیاری لە بەریتانیا دەکرێت، دەبێ سیستەمی حزبایەتی لەو وولاتەدا لەبەرچاوبگیرێ ، لە سەرەتادا دوو پارتی بەهێز هەبوون، پارتی پارێزگاران‌و پارتی (احرار)، بەڵام لەگەڵ ڕۆژدا پارتی کرێکاران کە لەخاوەن پیشەکان‌و فەرمانبەرە بچوکەکان وسەندیکاکان پێکهاتووە جێگای پارتی (احرار) گرتەوە.

ژمارەی ئەندامانی ئەو دوو پارتە لە پەرلەمانی بەریتانیادا لە یەك نزیك دەبنەوە، بۆیە یەکێ لەو پارتانە کە پارتی زۆرینەیە وەزارەت پێکدەهێنێ‌و ئەویتریانیش بەرهەڵستکار دەبێ‌و کێش‌و گوشاری تایبەتی خۆی هەیە ، لەڕاستیدا هۆی زاڵبوونی دوو پارت لە پەرلەمانی بەریتانیا دا لە ڕووی ژمارەی ئەندامانەوە ، وەکو لە سەرەتاشدا ئاماژەمان پێکرد دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەو وولاتە سیستەمی زۆرینەی سادە (یەك خول) پەیڕەو دەکات لە هەڵبژاردندا.

**چوارەم : دەسەلاتی دادوەری – دادگوزاری ( السلطة القضائية )[1]**

دەسەڵاتی دادوەری لە بەریتانیا ڕێزێکی باشی هەیە لەلایەن خەڵکەوەو دادوەرەکان بێلایەنی خۆیان دەپارێزن‌و بەهیچ شێوەیەك تێکەڵی سیاسەت نابن.دادوەرەکان لەسەر بناغەی نموودو توانای خۆیان‌و ناسراویان و ڕاڤەکردنیان لە بواری دادوەریدا هەڵیان دەبژێرن بەڕێ‌و ڕەسمێك کە لە مێژەوە دەردەچێت ، پاش قەبوڵ کردنی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە.

دادوەر لە وەزیفەی دادوەری‌و لەو جێگەیەی دامەزراوە دەمێنێتەوە تا لە ژیاندا مابێ ، بەڵام دەبێ دادوەرێك لە جێگایەکەوە بگوێزرێتەوە بۆ جێگایەکی‌تر بە ڕەزامەندی هەردوو ئەنجومەنەکەو پەرلەمان.

ئەمەو نۆ دادوەر کە ئەندامن لە ئەنجومەنی لۆردەکاندا دادگای پێداچوونەوەی باڵا (المحكمة الاستئنافية العليا) پێکدێنن.

ئەو کەسانەی کە تۆمەتبارکراوون لەلایەن دادگاکانەوە دەتوانن داوای پێداچوونەوەی حوکمەکە بکەن لەبەردەم ئەم دادگایەدا بەپێی ئەو ڕێ‌و شوێنانەی کە

---

(١) بڕوانە: د.يحيى الجمل ـ الانظمة السياسية المعاصرة ص١٩٩.

دیاریکراوون، بەلام لە هەمان کاتدا جێگری داواکاری گشتی بۆی نیە داوای پێداچوونەوە بکات لەبەردەم دادگای پێداچونەوەی بالادا سەبارەت حوکم بە بێتاوانی، کە لە قازانج کەسێك دەرچوو بێت، هەرچەندە دەسەلاتی دادوەری چاودێری یاساکان ناکات لەڕووی گونجاویان لەگەڵ دەستووردا، لەبەرئەوەی یاسا دەستوورییەکان لە بەریتانیا نە لە سەرچاوەو نە لە ڕێو شوێن دا جیاوازیان نییە لەگەڵ یاسا ئاسایی‌یەکاندا، بەلام دەسەلاتی دادوەری زامنی سەربەستی تاکە کەسیو سەربەستی هاتوچۆی هاوولاتیانو لەوجۆرانە دەکات.

ئەمەو دەسەلاتی دادوەری بێلایەنو سەربەخۆیە و لەژێر هیچ کارتێکردنێکی هەردوو دەزگای ڕاپەڕاندنو یاسادانان‌دا نییە، لە کاتێکدا دەبینین ئەو دوو دەسەلاتە جۆرە هاوکێشییەكو هەماهەنگییەك لەنێوانیاندا هەیە.

## بەستی سێیەم :

## سیستەمی کۆمەڵە ( نظام الجمعية ) [١]

ئەم سیستەمە دان بەهەبوونی چەند دەزگایەکدا دەنێت بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت، بەلام یەکێ لەو دەزگایانە بالادەست دەکات بەسەر دەزگاکانی تردا، ئەو دەزگایەش پەرلەمانە، کە لە سویسرا پێیدەڵێن کۆمەڵەی فیدراڵی.

پاش شۆڕشی فەرەنسایی و لە سێدارەدانی میر ، سیستەمی کۆمەڵە لە فەرەنسا پەیڕەوکرا، هەموو دەسەلاتەکان کەوتنە دەست کۆمەڵەی نیشتمانی ،کۆمەڵەی نیشتمانیش هەڵدەستا بەدیاریکردنی ئەوانەی کەئەرکی جێبەجێکردنی کاروبارەکان دەکەوتە ئەستۆیان، بەلام ئەم سیستەمە لە فەرەنسا کەوتە ناو گێژاوێکەوە لەساڵی (١٧٩٢ز) وە دەستی پێکرد تا ساڵی (١٧٩٥ز ) بەردەوام بوو،تا فەرەنسا لەو سیستەمە لایدا، واتا سیستەمی کۆمەڵە دوورخرایەوە ، هەروەها لە فەرەنسا سیستەمی کۆمەڵە

---

(د) بڕوانە د. يحيى الجمل ـ الانظمة السياسية المعاصرة ص ١٩١.

د.علي غالب العاني ـ الانظمة السياسية ص٨٥.

پەیرەوکرا بۆ جاری دووەم لە ساڵی (١٨٤٨ز) و بۆ جاری سێیەم لە ساڵی (١٨٧١ز)، ئەمەی دواییان دوا پەیرەوکردنی سیستەمی کۆمەڵە بوو لە وڵاتی فەرەنسادا.

هەروەها توركیا سیستەمی کۆمەڵەی پەیرەوکرد بە گەیشتنی مستەفا کەمال ئەتاتۆرك، هەرچەندە ناوبراو خۆی حوکمڕانی پراکتیکی لە دەوڵەتدا دەکردو پەیرەوکردنی ئەم سیستەمەش لە تورکیا تەنها لەڕووی تیۆرییەوە بوو.ئەوەی ڕاستی بێت سیستەمی کۆمەڵە بووە مۆرکی سیستەمی سویسرا و لەهیچ وولاتێك بەتەواوی پەیرەو نەکرا تەنها لە سویسرا نەبێت، بۆیە پێویست دەکات بەشێوەیەکی بەربلاو باسی بکەین بۆئەوەی بتوانین تیشك بخەینە سەر ئەم سیستەمە بەشێوەیەکی تەواو.

## دەزگاکانی دەسەڵات لە سویسرا (هیئات السلطة في سويسرا):-

سویسرا لە ساڵی (١٩٤٨ز )ەوە دەوڵەتێکی فیدراڵیە ، لە (٢٢) کانتۆن (هەرێم) پێکدێت، لەساڵی (١٩٧٤ز ) هەموارکردنەوە لە دەستووردا کرا، بەگوێرەی ئەو هەموارکردنەوەیە (تعديل) دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵی فراوانکرایەوەو چوارچێوەی سیستەمی ڕامیاری سویسرا دیاریکرا:

یەکەم : **دەزگای یاسادانان :**

دەزگای یاسادانان لە دەوڵەتی فیدراڵی سویسرا لە (٢) ئەنجومەن پێکدێت : ئەنجومەنی نیشتمانیو کانتۆنەکان، بە هەردووکیانیش دەڵێن کۆمەڵەی فیدراڵی (الجمعيه الفدراليه).

ئەنجومەنی نیشتمانی لەلایەن هەموو هاووڵاتیانی دەوڵەتی سویسراییەوە بە هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ پێکەوە دەنرێ بەڕادەی یەك نوێنەر بۆ (٢٢) هەزار دەنگ ، بەمەرجێ بەلای کەمەوە هەر کانتۆنێك یان نیوکانتۆن نوێنەرێکی هەبێت بەچاوپۆشین لە ژمارەی دانیشتوانی ئەو کانتۆنانە یان نیو کانتۆنانە، ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی بۆماوەی (٤) ساڵ هەڵدەبژێردرێن ، بەڵام ئەنجومەنی هەرێمەکان لە (٤٤) ئەندام پێکدێت بەڕادەی (٢) ئەندام بۆ هەر کانتۆنێكو یەك ئەندام بۆ هەر نیو کانتۆن (٣ کانتۆنی سویسرایی هەیە، هەریەك لەو کانتۆنانە لە (٢) کانتۆن

پێکدێت، جا هەر یەک کانتۆن لەو دوو کانتۆنانە بە نیو کانتۆن دەژمێردرێت بە تێڕوانینی دەستووری فیدراڵی .

کۆمەڵەی فیدراڵی وەکو هەر پەرلەمانێ یان هەر دەزگایەکی یاسادانانی هەر دەوڵەتێك کاری یاسادانانی دەکەوێتە ئەستۆ. ماددەی ( ٨٥ ) لە دەستووری سویسرا تایبەتکارییەکانی کۆمەڵەی فیدراڵی بەم شێوەیە دیاریکردووە: (دانانی یاساکانی دەوڵەتی فیدراڵی ، هەڵبژاردنی ئەندامانی دەزگای ڕاپەڕاندن (ئەنجومەنی یەکێتی فیدراڵ ) ، ڕاستگۆکردنی بەڵێنکاری لەگەڵ دەوڵەتانی بیانیدا ، کاروکاردانەوەی پێویست بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆو دەرەوەو پاراستنی سەربەخۆیی و بێلایەنی دەوڵەتی سویسرا ، جاڕدانی شەڕو بەستنی پێکهاتن (عقد الصلح) ، زامن کردنی دەستووری کانتۆنەکان ، هەروەها کاردانەوەی پێویست بۆ زامنکردنی ڕێزگرتن لە دەستووری فیدراڵی ، لێبوردنی گشتیو تایبەت ، سەرۆکایەتی کردنی سوپاو هەڵسوکەوت پێکردنی ، بودجەی ساڵانەو ڕاستگۆکردنی حساباتی کۆتایی (الحسابات الختامیە) دەوڵەت ، ڕەزامەندی لەسەر قەرز ، چاودێری باڵا لەسەر بەڕێوەبردنو دادگای فیدراڵی ، تەماشاکردنی ناکۆکییەکانی نێوان دەسەڵاتە فیدراڵیەکان دەربارەی تایبەتکارییەکانیان ، هەموارکردنەوەی دەستووری فیدراڵی) .

لەم باسەی سەرەوەماندا بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵەی فیدراڵی هەرچەندە لە بناغەدا دەزگای یاسادانانە ، بەڵام هەڵدەستێ بە هەندێ کاروباری ڕاپەڕاندن کە هەندێ لەو کاروبارانە زۆر گرنگن ، بۆ نموونە کۆمەڵەی فیدراڵی لێبوردنی تایبەت دەردەکات ، ئەندامانی دەزگای ڕاپەڕاندن هەڵدەبژێرێو سەرۆکایەتی سوپا دەکاتو سەرۆکی سوپا دادەنێت ، چاودێری گشتی لەسەر بەڕێوەبردنو دادوەری و پاراستنی ئاسایشی ناوخۆو دەرەوەی ووڵات.

دووەم : دەزگای ڕاپەڕاندن :

دەزگای ڕاپەڕاندن یان ئەنجومەنی فیدراڵی لە (٧) کەس پێکدێت ، کە لەلایەن پەرلەمانەوە (کۆمەڵەی فیدراڵی) هەڵدەبژێردرێن ، هەر هاووڵاتییەك دەبێ و لەبارە هەڵبژێردرێت بۆ ئەم ئەنجومەنە بە مەرجێك ، ئەو مەرجانەی تێدابێت کە دانراوون

بۆ ئەندامێتی ئەنجومەنی نیشتمانی . ماوەی ئەندامێتی لەم ئەنجومەنەدا (٤) ساڵەو تازەش دەکرێتەوە، بۆ نموونە: یەکێك لەو ئەندامانە (٣٢) ساڵو یەکێکی دیکەش (٢٥) ساڵ مانەوە وەکو ئەندامێك لە ئەنجومەنی فیدراڵیدا.نابێ لە کانتۆنێك (٢) ئەندام هەبێت لە ئەنجومەنی فیدرالیدا ، واتا ئەو (٧) ئەندامە دەبێ هەریەکێکی خەڵکی کانتۆنێك بێت ، هەروەها پەرلەمان سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیو جێگرەکەی هەڵدەبژێرێت بۆماوەی یەك ساڵ و نابێت تازەش بکرێنەوە.

سەرۆکی ئەنجومەنی فیدرالی ، سەرۆکی دەوڵەتی فیدرالیەو دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نییە، تەنها نوێنەرایەتی سویسرا لە دەرەوە دەکات، هەروەها نە خۆیو نە هیچ وەزیرێك ناتوانن بڕیارێك وەرگرن بە تاکڕەوی ، بڕیارەکان وەردەگیرێت لەلایەن ئەنجومەنەوە بە زۆرینەی دەنگەکان.

بەگوێرەی دەستوور ئەنجومەنی فیدرالی دەبێ ڕاپۆرتێکی ساڵانە بخاتە بەردەم کۆمەڵەی فیدرالیەوە ، کە هەموو کاروبارەکان بگرێتەوە لە هەموو بوارەکاندا ، کۆمەڵەی فیدرالی لیژنەیەك پێکدێنێت بۆ خوێندنەوەی بەشێوەیەکی ووردو پاشان ڕاسپاردەکان سەبارەت بە ڕاپۆرتەکە دەداتە کۆمەڵەی فیدرالی .

کۆمەڵەی فیدرالیش یان پشتگیری لە ئەنجومەنی فیدرالی دەکات یان تێبینی دەخاتە بەردەم ئەنجومەن ، کە دەبێ ئەو تێبینیانە پەیڕەو بکات لە کاروبارەکانیدا و بۆ ساڵی داهاتوو خۆی لابدات لەو ڕەخنانەی ڕووبەڕوویان بوومەتەوە، وەکو بۆمان دەردەکەوێت، لێرەدا کێشەی لێسەندنەوەی متمانە یان دەست کێشانەوە لەکار نییە لەنێوان کۆمەڵەی فیدراڵیو ئەنجومەنی فیدرالیدا ، بەڵکو ئەندامانی ئەنجومەنی فیدراڵی دەبێ پەیڕەوی ئەو ڕێنماییانە بکەن کە کۆمەڵەی فیدرالی بۆیانی دیاریکردووە.

ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد زیاتر تیۆرییە بەڵام لە پراکتیکدا ئەنجومەنی فیدرالی کێشی تایبەتی خۆی هەیە و بەهێزو بە هەیبەتو سەقامگرتوو پتەوە لەبەردەم کۆمەڵەی فیدرالیداو دەتوانێ پاڵپشتی لە سیاسەتی خۆی بکات ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکخستنی حزبیو پێکهاتەی پەرلەمانو ئەندامانی ئەنجومەنی فیدرالی.

هۆی سەرکەوتنی سیستەمی کۆمەڵە لە دەوڵەتی سویسرا دەگەڕێتەوە بۆ بێلایەنی سویسرا لەهەردوو جەنگی جیهانی یەکەم‌و دووەمدا ، واتا تووش نەبوونی شەڕو ئەنجامەکانی شەڕ ، هەروەها سەقامگیری ڕەوشی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕامیاری لە وولاتدا و ئاستی هۆشیاری‌و ڕامیاری‌و کۆمەڵایەتی بەرز لەلای هاوولاتیانی سویسرایی و پەیڕەوکردنی شێوەی فیدرالی‌وسیستەمی دیموکراسی ناڕاستەوخۆ.ئەوەی ماوە باسی بکەین دەربارەی سیستەمی کۆمەڵە ، ئەوەیە ، هەندێ یاسازانەکان دەڵێن سیستەمی کۆمەڵە لەسەر بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکان دامەزراوە، لەبەرئەوەی چەند دام‌و دەزگایەك هەن لە دەوڵەتدا کاروبارەکان بەڕێوەدەبەن.

هەندێکی دیکەش دەڵێن سیستەمی کۆمەڵە لەسەر بنچینەی جیاکاری نێوان دەسەلاتەکان دانەمەزراوە ، بەڵکو بۆچوونەکانی جان جاك ڕۆسۆ بەرجەستەدەکات ، کە پێی وابووە دەسەلات دەبێ لەدەست دەزگای یاسادانانداا (پەرلەمان) کۆببێتەوە ، تا ئەو دەسەلاتە بە دەسەلاتی گەل لە قەڵەم بدرێت.

## بەستی چوارەم

## سیستەمی تێکەڵاو ( الانظمة المختلطة )

ئەم سیستەمە پێکهاتەی تێکەڵکردنی هەندێ جیاکارو سیفاتی هەر یەکێ لە سیستەمەکانی ترە .بۆنموونە ،سیستەمی تێکەڵاو لەنێوان سیستەمی سەرۆکایەتی وپەرلەمانیدا،هەروەکو لەکۆماری ئەڵمانیا لەساڵی( ١٩١٩ز ) پەیڕەو دەکرا پاش جەنگی جیهانی یەکەم تا ساڵی( ١٩٣٣ز ) ،ئەو کاتەی کە هیتلەر دەسەلاتی ئەڵمانیای بەدەست گرت.بۆزیاتر تێگەیشتن لەم سیستەمە پێویست دەکات باسی سیستەمی‌تێکەڵاو بکەین لەفەرەنسا ،ئەو سیستەمەی کە بەگوێرەی دەستووری ساڵی( ١٩٥٨ز ) بنیاد نراوەو ڕیاساکانی کاریان پێکراوە،لەڕاستیدا فەرەنسا سیستەمی پەرلەمانی پەیڕەو دەکرد لەسایەی کۆماری سێیەمدا لەساڵانی (١٨٧٥-١٩٤٠ز) و هەروەها لەسایەی کۆماری چوارەمدا لەساڵانی (١٩٤٦-١٩٥٨ز ) بەلام سیستەمی پەرلەمانی لە فەرەنسا سەری نەگرت،لەبەر هەبوونی فرە حزبایەتی، بێئەوەی یەکێ‌لەو پارتانە (حزبانە) زاڵ بێ لە

رووی زۆرینـەی پەرلەمانیـەوە ،واتـا زۆرینـەی پەرلـەمانی هـەبێ.ئەمـەش بـووە هـۆی ناسـەقامگیری رەوشـی رامیـاری لـە فەرەنسا.جالەبـەر ئـەوەی فەرەنسا خـۆی لـەئالۆزیو ناسـەقامگیری رەوشـی رامیـاری رزگـار بکـات .دەسـتووری سـاڵی( ١٩٥٨ز ) هاتـە کایـەوە ،بەپێی ئەو دەستوورە، بۆ بـەهێز کـردن وسـەقامگیرکردنی رەوشـی رامیـاری، دەسـەڵاتی راپەراندن بەهێزو پتەوکرا لەسەر حیسابی پەرلەمان،بەتایبەتی پاش هەموارکردنەوەی دەستوور لەساڵی( ١٩٦٢ز ) ،ئەم هەمواکردنەوەیە وایکرد سەرۆك کۆمار لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێ بە شێوەیەکی راستەوخۆ ،لێرەدا رۆڵی سەرۆك کۆمار دیارو لە بەرچاوە لە بەرانبەر پاشەکشەکردنی پەرلەماندا ،هەروەکو لەمەودوا باسی دەکەین .

**یـەکەم : دەسەڵاتی راپەراندن**

تایبەتکارییەکانی سەرۆك کۆمار بەپێی دەستووری ساڵی( ١٩٥٨ز ):-

دانـانی سـەرۆك وەزیـران ،دانـانی وەزیرەکـان لەسـەر پێشـنیاری سـەرۆك وەزیـران ،سەرۆکایەتی کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران لەکاتێکدا نەبێت کە سەرۆك وەزیـران بەو کارە سپێردرابێت ، ئەنجامدانی هەموو ئـەو بڕیارانـەی کـە ئەنجومـەنی وەزیـران و وەزیرەکـان بڕیـاری لەسـەر دەدەن .سـەرۆك بـۆی هەیـە بـەبڕیاری خـۆی پەرلـەمان هەڵوەشـێنێتەوە بێئـەوەی وەزارەت داوای ئـەوەی لێکردبـێ،بەمـەرجێ هـەڵبژاردنی نوێبکرێلـە مـاوەی (٤٠)رۆژدا،راسـتگۆکردنی ئـەو پـرۆژە یاسـاییانەی کـە پەرلـەمان پەسەندیان دەکات ،هەروەها بۆی هەیە ئەو پرۆژە یاساییانە بگێرێتەوە بۆپەرلەمان بۆ چاو پیاخشاندنەوەیان،بۆی هەیە داوا لە پەرلەمان بکات بۆ کۆبوونەوەیـەکی نائاسـاییو هەروەها دەستبەردان لەو کۆبونەوەیە .سەرۆك بۆی هەیـە پـرۆژەی یاسـایی راسـتەوخۆ بخاتە بەردەم گەلەوە بۆ ریفراندۆم کردن لەسـەری بێئـەوەی ئـەو پـرۆژە یاسـاییە بـە پەرلەمان وحکومەتدا تێپەربێت .

سەرۆك کۆمار جگە لەو تایبەتکارییانەی کە باسمان کرد ،تایبـەتکاری بارودۆخی نـا ئاسـایی هەیـە کـەماددەی (١٦) ئـەو بارودۆخـەو ئـەو تایبەتکارییانـەی دیـاری کـردوە کەبریتین لە :-

هەبوونی هەڕەشە بەرانبەر سیستەمی یان خاکی فەرەنسا،هەر تەگەرەیەك ڕێگربێ لەجێبەجێکردنی پێبەند بوونە نێودەوڵەتییەکانی فەرەنسا،یان وەستانی کاروباری دامەزراوە دەستووری‌یەکان بەهەر هۆیەك بێت.

ماددەی (١٦)سەرۆك کۆماری والآدەست ( مخول) کردووە بۆ بەکارهێنانی هەر ئامرازێك کە بارودۆخی نائاسایی پێویستی پێی بێت بەمەرجێ گەل ئاگاداربکاتەوە لە ڕێگای نامەوە بۆیان .سەرۆك دەتوانی بڕیار دەربکات بەگوێرەی ماددەی (١٦) هێزی یاسایی هەبێت بەڕاوێژکاری لە گەڵ سەرەك وەزیران و سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی‌و سەرۆکی ئەنجومەنی پیران وئەندامانی ئەنجومەنی دەستووری .بەڵام سەرۆك لەکاتی بەکارهێنانی ماددەی (١٦) بۆی نییە پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە .

**دووەم : پەرلەمان**

دەستووری ساڵی ( ١٩٥٨ز ) ڕۆڵی پەرلەمانی کزو لاواز کرد ، بەتایبەت ئەنجومەنی نیشتمانی . بۆ نموونە ڕۆڵی پەرلەمانی لەبواری یاسادانانەدا بەتایبەت لەبواری داراییدا بەم شێوەیە لەچوارچێوە دا .

ا.ئەگەر پەرلەمان لە ماوەی (٧٠) ڕۆژدا پرۆژەی یاسای دارایی پەسەند نەکرد کەخراوەتە بەردەمی ،ئەوە بە ڕێوڕەسمێکی کۆماری دەردەچێت و جێبەجێ دەکرێت .

ب.هەر ئەندامێکی ئەنجومەنی نیشتمانی پێشنیاری پرۆژەی یاسایی کرد ،پەیوەندی بەزیادبوونی خەرجی‌یەوە هەبوو ،دەبێ پێشنیاری داهاتەکەشی بکات ،کەئەو خەرجیەی پێبکرێ . هەروەها ڕۆڵی ئەنجومەنی نیشتمانی بە گوێرەی دەستووری ساڵی ( ١٩٥٨ز ) زیاتر کزو لاوازبوو ،بۆنموونە لە سایەی کۆماری چوارەمدا خولەکانی پەرلەمان لە (٧)مانگەوە کورت کرانەوە بۆ (٥)مانگ و نیو،هەروەها کردنەوەی خولە تاك و تەراکارانەکان (أستپنائیە) بەپێی داوای حکومەت کراوەیە،بەڵام بەپێی داوای زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی دیاری کراوە بە (١٢)ڕۆژو دەبێ خشتەی کاری دیاری‌کراوی پێش وەختەشی هەبێ. ئەمەو هەموو پەرلەمانەکانی جیهان لەنێوان خۆیاندا لیژنەیەك پێك دێنن بۆ ڕاستی‌و دروستی هەڵبژاردنی ئەندامەکانیان

کاتێ تانەی بدرێتە پاڵ ، بەڵام دەستووری ساڵی (١٩٥٨ز ) ئەم ئەرکەی خستە ئەستۆی ئەنجومەنی دەستووری ، کەلایەنێکە لە دەرەوەی پەرلەمان ،ئەم ئەنجومەنە لەمانە پێك دێت:

سەرەك کۆمارەکانی پێشوی فەرەنسا ، ئەوانەی ماوون.

هەروەها سەرۆك کۆمارو سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی و سەرۆکی ئەنجومەنی پیران هەریەکەو سێئەندام هەڵدەبژێرن.

سەرۆك کۆمار هەڵدەسی بەدیاری کردنی سەرۆکی ئەنجومەن .

کاری ئەم ئەنجومەنە بە پلەی یەکەم چاودێری دەستووریەتی یاساکانە(ئایا یاساکان بە پێی دەستوور دەرچوون یان نا) ،جگە لە هەندێ تایبەتکاری تر کە ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد یەکێ لەوانەیە.

## سەرچاوەکان

١-د. منذر الشاوي ـ القانون الدستوري ( نظرية الدولة ) ـ بغداد (١٩٨١)

٢-د. يحيى الجمل ـ الانظمة الساسية المعاصرة ـ من منشورات دار النهضة العربية.

٣-د. يحيى الجمل ـ الاعتراف في القانون الدولي العام ـ (١٩٦٢).

٤-د. طعيمة الجرف ـ نظرية الدولة والاسس العامة للتنظيم السياسي .

٥-د. طعيمة الجرف ـ النظريات والنظم السياسية وسيادة القانون الدستوري ـ من منشورات دار الثقافة العربية للطباعة ( ١٩٧٣ ) .

٦-د. شمران حمادي ـ الاحزاب السياسية والنظم الحزبية ـ الطبعة الثانية من منشورات مطبعة الارشاد ـ بغداد (١٩٧٥) .

٧-د. شمران حمادي ـ النظم الساسية ـ الطبعة الرابعة ـ من منشورات مطبعة الارشاد ـ بغداد (١٩٧٥) .

٨-د. سليمان محمد الطماوي ـ مبادئ القانون الدستوري ـ الطبعة الاولى من منشورات دار الفكر العربي .

٩-د. سعد عصفور ـ القانون الدستوري ـ الطبعة الاولى ـ من منشورات دار المعارف بالاسكندرية ـ (١٩٥٤ ).

١٠-د. محمد كامل ليلة ـ النظم السياسية ـ من منشورات مطبعة نهضة مصر ـ ( ١٩٦٠ ـ ١٩٦١ ).

١١-د. عثمان خليل ـ القانون الدستوري ـ (١٩٥٥).

١٢-د. ابراهيم درويش ـ النظام السياسي ـ دراسة فلسفية سياسية ـ الطبعة الثانية ـ من منشورات دار النهضة العربية ـ (١٩٦٩).

١٣-د. تقي الدين الصلح ـ في السياسة والحكم ـ من منشورات ار العودة ـ بيروت ـ (١٩٧٢).
١٤-د. عبدالجبار حسن ـ الاحزاب والجمعيات السياسية .
١٥-بارنغتون مور ـ الجذور الاجتماعية للديمقراطية والدكتاتورية ـ ترجمة جورج جحا ـ بيروت .
١٦-جان هيپولت ـ دراسات في ماركس وهيميل ـ ترجمة جورج صدقي ـ من منشورات وزارة الثقافة ـ دمشق (١٩٧١) .
١٧-أ.هـ.م چونز ـ الديمقراطية الاثينية ـ ترجمة د. عبدالمحسن الخشاب (١٩٧٦)
١٨-جون لوك ـ في الحكم المدني ـ ترجمة ماجد فخري ـ بيروت (١٩٥٩).
١٩-د. طلعت الشيباني ـ دساتير الحكم في العراق القديم ـ مجلة القضاء ـ العدد الاول ـ السنة الخامسة عشر ـ شباط (١٩٥٧).
٢٠- د. محمد عمارة ـ هل الاسلام هو الحل ، كيف ولماذا؟.
٢١-د. عبد الحميد متولي ـ الوسيط في القانون الدستوري ـ (١٩٥٦).
٢٢-د. محمد عبد العربي ـ دراسات في النظم الدستورية ـ (١٩٥٦).
٢٣-د. حسن الهداوي ، غالب علي الداودي ـ القانون الدولي الخاص ـ القسم الثاني ـ تنازع القوانين وتنازع الاختصاص القضائي و تنفيذ الاحكام الاجنبية ـ من منشورات جامعة الموصل.
٢٤- د. محمد علي آل ياسين ـ القانون الدستوري و النظم السياسية ـ بغداد (١٩٦٤).
٢٥-د.سعدى بەرزنجی ـ تیۆری گشتیی یاسا ـ لەچاپکراوەکانی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیریولاوانی ناوچەی کوردستان (١٩٨٩).
٢٦-سەیوان کاکە ڕەش ـ بەراورد لەنێوان ڕژێمە فیدراڵەکان ـ سیاسەتی دەولی ـ ژمارە (٢) ساڵی سێیەم ـ تەموزی (١٩٩٤).

٢٧-بەدران ئەحمەد حەبیب ـ هەڵبژاردنەکانی کوردستان ـ بەڵگەو دەستهاوێژ ، هەولێر (١٩٩٨).

٢٨-دیموکراسیەت، پەرلەمان و حکومەتی باشووری کوردستان ـ لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان چاپکراوە ـ هەولێر.

# ناوەڕۆك

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

ـ بەهادین ئەحمەد محەممەد.

ـ لە ساڵی (١٩٦٨ ) لە دایك بووە لە شاری کفری و قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی هەر لەوێ تەواو کردووە .

ـ لە ساڵی (١٩٩٢ـ ١٩٩٣) کۆلێژی یاسای لە زانکۆی بەغداد تەواو کردووە.

ـ ئێستا لێکۆڵەرەوەی دادوەرییە لە شاری کفری.

# زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ساڵی ٢٠٠٢

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ١٤٢ | هارون‌و چیرۆکی دەریا | سەلمان روشدی | ئامانج عەزیز کەندی |
| ١٤٣ | کارەکەر | گەلاوێژ | |
| ١٤٤ | ژنی کورد لە دەوازەی هەزارەی | کازیوە ساڵح | |
| ١٤٥ | هونەری بێژەری لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا | حەسەنی شەیدا | باسط حەمە غەریب |
| ١٤٦ | چارەنووسی گەلی کورد لە کۆنگرەو ... | ئەحمەد باوەڕ | |
| ١٤٧ | پرۆگرامی مایکرۆسۆفت ئۆفیسی... | شوان مستەفا عیسا | |
| ١٤٨ | زاکیرەی با | ئەحمەدی مەلا | |
| ١٤٩ | قوربانی | کورتزیۆ مالا پارتێ | ئەبوبەکر خۆشناو |
| ١٥٠ | فەرهەنگی شیرین (بەرگی دووەم) | فاضل نظام الدین | |
| ١٥١ | خۆم..ئەو وەختەی باڵندەم! | شێرکۆ بێکەس | |
| ١٥٢ | دەروازە (دەفتەری‌دووەم) | | هەڵکەوت عەبدوڵا |
| ١٥٣ | ژنێ لەبەردەم وەرزێکی سارددا | | ئازاد بەرزنجی |
| ١٥٤ | ژیان | | ئا: رەفیق ساڵح |
| ١٥٥ | فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی...... | بەختیار سەجادی<br>محەمەد مەحموودی | |
| ١٥٦ | یاداشتەکانی مەئمون بەگ... | | صەلاح نەقشبەندی |
| ١٥٧ | هەڵبژاردەیەك لە گۆرانی فۆلکلۆری ... | | ئا: فاروق حەفید |
| ١٥٨ | پێوەندی مەسەلەی کورد بەیاسا ... | | ئا: د.مارف عومەر گوڵ |
| ١٥٩ | جیهانی سۆفیا | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ١٦٠ | مێژووی شاری هەولێر ... | یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٦١ | ئازادکردنی مێژوو | مەهاباد قەرەداغی | |
| ١٦٢ | نووسینەکانم لە بواری ڕەخنەو لێکۆڵینەوە | حسێن عارف | |
| ١٦٣ | مێژووی ٦٤١ ساڵەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەکان... | عەلی نەقی ئەلحوسەینی | ئاسۆس هەردی |
| ١٦٤ | ناودارانی کورد | میر بەسری | عەبدول خالق عەلائەدین |
| ١٦٥ | بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە | ستیڤن بروکفیلد و پۆل ئە. لیڤن | ئیبراهیم خ. ئەحمەد |
| ١٦٦ | کورد و کەرکوک | | ئا: لەتیف فاتیح فەرەج |
| ١٦٧ | نەژادی کورد لە لوبنان | خەلیل محەمەد شڵماشی | |
| ١٦٨ | ژەنەڕاڵ شەریف پاشا | د.فەرهاد پیرباڵ | |
| ١٦٩ | خوێندنەوەی کتێب | جەبار جەمال غەریب | |
| ١٧٠ | مەکتوب | پاولۆ کۆیلۆ | یاسین عومەر |
| ١٧١ | کەڵەئەدیبانی بیانی | کەمال مەعروف | |
| ١٧٢ | وەسمیە لە دەریا دێتە دەرێ | لەیلا ئەلعوسمان | شیرین . ک |
| ١٧٣ | جیۆگرافیای(ئابووری-دانیشتوان).. | عدنان السید حسێن | فرمان عبدالرحمن_ محمد فاتح |
| ١٧٤ | سوپەر سروشت | لیاڵ واتسۆن | ئارام قەرەداغی |
| ١٧٥ | سیاسەتی دیبلۆماسی | جیمس بیکەر | سەهەند |
| ١٧٦ | پارکی بۆقەکان | ئاکۆ کەریم مەعروف | |

**نرخی (٢٥) بیستو پێنج دینار**

پێویسته ئاماژه بهوه بکهم که دهوڵهت
کۆکهرهوهی ههموو لایهنهکانی ژیانی
مرۆڤه، مێژوو، ئێستا، ڕهوشی ئابووری،
ڕهوشی ڕامیاری، ڕهوشی کۆمهڵایهتی،
ڕادهی هۆشیاری ڕامیاری هاووڵاتیان،
ههمووی له چوارچێوهی دهوڵهتدا یهك
دهگرنهوه. ههروهها پهیوهندی سیستهمه
ڕامیارییهکان بهژیانی کۆمهڵگهی
مرۆڤایهتییهوه پهیوهندییهکی زۆر پتهو و
توندو تۆڵه، ههرچهنده سیستهمی ڕامیاری
له ههر کۆمهڵگهیهکدا ههڵقوڵاوی ڕهوشی
ڕامیاری وئابووری وکۆمهڵایهتی ومێژووی
ئهو کۆمهڵگهیهیهو ڕهنگدانهوهی دیفاکتۆی
ڕهوشی ئهو کۆمهڵگهیهیه، له ههمان کاتدا
سیستهمی ڕامیاری پهیڕهوکراو له
دهوڵهتدا کار دهکاته سهر بواره
جیاجیاکانی ژیانی کۆمهڵگهو داینهمۆی
ژیان و ڕهوشی ئابووری و ڕامیاری و
کۆمهڵایهتی ئهو کۆمهڵگهیهیه.

له بڵاوکراوهکانی دهزگای چاپ و پهخشی سهردهم